www.alibapir.net

مەوسووعەی

بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان

وەحیی و واقیع دا

کتێبی یەکەم

# چەمك و چییەت و سەرگوزشتە و سەرچاوەکان و گرنگیی:

# بیرکردنەوەی ئیسلامیی

عەلی باپیر

مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا
نووسینی: عــەلی بــــاپیر
مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر
چاپی یەکەم ١٤٣٩ز- ٢٠١٨ك



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحی و واقیع دا،
عەلی بــاپیر (نووسەر)،
٢٨٧ لاپــەڕە ،
١٧* ٢٤ سـم ،
بابـەت ، ئـاییني
تیراژ ، ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٣١١ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە
ISBN: 978-9933-593-83-4

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خــەتی بــەرگ** : نـــەوزاد کۆیــی
**دیزاینی ناوەوە و بەرگ** : زەردەشت کاوانی

مەوسووعەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان
وەحیی و واقیع دا

- تەوەری یەکەم -

# چەمك و چییەت و سەرگوزشتە و سەرچاوەکان و گرنگیی ؛

# بیرکردنەوەی ئیسلامیی

## پێشکەش بێ

بە هەرکەسێك، کە بە شێوەیەکی شایستە عەقڵی خۆی لە بواری بیرکردنەوەدا بەکاردێنێ و، بە زەینێکی هۆشیارو دڵێکی بێدارەوە:

لە هەردووك کتێبی خوێندراوو بینراو (مَقروء و منظور)ی خوای پەروەردگارەوە ڕادەمێنێ و، سەرەنجام زانیاریی و شارەزاییەکی بەئامانج گەیەنەریان لێ وەدەست دێنێ.

# پێشەكیی

## پێناسەو بەسەرهاتی پەیدابوونی ئەم مەوسووعەیە

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ ورَسولُهُ.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ١﴾ النساء

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَـٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد:

فَإِنّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحَمَّد صَلّى اللَّه عَليهِ وَسلَم وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلّ مُحدثَةٍ بِدْعة، وَكُلّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلَّ ضَلالةٍ فِي النّار.

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم مەوسووعەیەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحییی و واقیعدا) کۆی ئەو چل و نۆ (٤٩) دەرسەیە کەبەندە لەنێوان ڕۆژانی: (٢٠١٦/١٠/٢١) تاکو ٢٠١٧/٥/٥)دا، پێشکەشی کۆمەڵێکی بژاردە لەبراو خوشکانم کردوون، لەخولێکدا کە (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان) کردبوویەوەو سەرجەم دەرسەکانیش لەکەناڵی تایبەتی بەندە لەیوتیوب: (-www.youtube.com/playlist?list=PL 6HuvNeXiFwuuTQtJAAuWqXQoCnKQqX2X) دانراون[1].

شایانی باسیشە کە کۆی ئەو چل و نۆ دەرسە، لەلایەن برای دڵسۆزم کاك (قاسم سەلام)ەوە هێنراونە سەرکاغەزو تایپ کراون و، پاش چاوپێداگێڕانەوەی وردی خۆم، دووبارە هەڵەچن کراونەتەوە، تاکو بەم ئاکامە گەیشتوون کە دەیبینی، بۆیە بەپێویستی دەزانم لەناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینمی عەرز بکەم و، لەخوای بەخشەریش داواکارم بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

هەڵبەتە لەمێژیشە گەیشتوومەتە ئەوقەناعەت و بڕوایە، کە کێشەی گەورەی مسوڵمان و هۆکاری بنەڕەتیی دواکەوتوویی و پەرێشانییان لەم ڕۆژگارەدا، بریتیە لە کەمتەرخەمیی و کرچوکاڵیی و پاشان بەجێماوییان لەبواری هزرو بیرکردنەوەداو، سەرەنجام بەهەڵە تێگەیشتن، بگرە زۆر جار سەرەوبن تێگەیشتنیان، لەزۆر بابەت و مەسەلەی دین و ژین!

بۆیەش بەپێویستم زانی لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەوبارەوە بکەم، کە سەرەنجام ئەو بابەتەی لێ هاتەدی، کە هیوام وایە کەلێنێکی باش لەوبوارەدا بگرێ و، هۆکاری بەرچاو ڕوونبوونەوەیەکی باشی مسوڵمانان بێ لەوبارەوە.

---

(١) ناوونیشانی ئەوبابەتەی داوام لێکرابوو ئامادەی بکەم، بریتی بوو لە: (هزری ئیسلامیی) بەڵام بەو شێوەیەم گۆڕی کەکراوەتە ناوونیشانی ئەم مەوسووعەیەء، دواتریش حیکمەتء هۆکارەکەی دەخەینە ڕوو...

ئنجا بەمەبەستی ئاسانتر بەهرە لێوەرگیرانی ئەم مەوسووعەیە، هەرچەندە هەرپێنج تەوەرەكەی پێكەوە پەیوەستن، بەڵام بەباشم زانی هەمووی بەپێنج كتێب چاپ و بڵاوبكەینەوە، هەرتەوەرەی لەكتێبێكی سەربەخۆدا.

لەخوای بە بەزەیی و بەخشندەش داواكارم پیت و پیرۆزیی شایستە بخاتە ئەم مەوسووعەیەوە، بەهەر پێنج كتێب و تەوەرەكەیەوەو، ئەوئامانجەی بۆی لەبەرچاو گیراوە، بەباشترین بیهێنێتەدی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

١٠/ی ڕەجەب/١٤٣٩ك

٢٠١٨/٣/٢٧ز

هەولێر

## ڕێخۆشكردن و نەخشەی گشتی

پڕۆسەی كارلێك (تفاعل)ی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگار و، واقیعێكدا كە تێیدا دەژین، ئەو كارلێكە، هەمیشە هۆكاری گەشە كردن و بەرەو پێش چوونیان و بەزیندوویێتی مانەوەی كۆمەڵگاكانیان بووە، بە پێچەوانەشەوە: لێك دابڕانی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان، لە تێوەڕامانی وەحیی و چاك تێگەیشتنی واقیع، هەمیشە هۆی مردوویێتیی و وەستان و بەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەبینین.

بەڵێ ئەم واقیعەی ئێستا مسوڵمانانی تێدان، بەرهەمی ئەوەیە كە مسوڵمانان - بە شێوەیەكی گشتی- باش نەیانتوانیوە عەقڵ و هۆشی خۆیان بخەنە كار، لە تێوەڕامانی وەحیی و لە سەرنجدانی واقیعدا، بۆیە من وەك هەوڵ و هەنگاوێك لەم بوارەدا، بە پێویستم زانی ئەم بابەتە لە (٤٩) ئاڵقەدا پێشكەش بكەم، لەژێر ناوونیشانی: {بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا} و، سەرجەم ئەم بابەتەش دەكەین بە پێنج تەوەرە:

**تەوەری یەكەم: ڕوونكردنەوەی چەمك و چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەكان و گرنگیی بیركردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە چوار بەشی سەرەكیی پێك دێ:

**بەشی یەكەم:** پێناسەی بیركردنەوەی ئیسلامیی و چەند وشەیەكی دیكەی نیزیكی.

**بەشی دووەم:** سەرنج دانێكی مێژوویی لە بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا.

**بەشی سێیەم:** سەرچاوەكانی بیركردنەوەی ئیسلامیی.

**بەشی چوارەم:** گرنگیی و پێویستیی بیركردنەوە (تفكّر) لە ئیسلامدا.

**تەوەری دووەم: هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان.**

ئەم تەوەرەش لە سێ بەشی سەرەكیی و (٥١) كورتە باس پێكهاتوە:

**بەشی یەكەم:** تایبەتمەندییە فیكرییەكان، (٢٠) تایبەتمەندیی.

**بەشی دووەم:** تایبەتمەندییە عەقیدەییەكان، (١٧) تایبەتمەندیی.

**بەشی سێیەم:** تایبەتمەندییە ڕەوشتییەكان، (١٤) تایبەتمەندیی.

**تەوەری سێیەم: تەوژمە فیكرییە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان.**

كە سەرجەم بیست (٢٠) تەوژمی جۆراو جۆرمان لێ هەڵبژاردوون و، لەبیست بەشدا خستووماننە ڕوو.

١- خەواریج.

٢- مورجیئە.

٣- جەبرییە.

٤- قەدەرییە.

٥- جەهمیە.

٦- موعتەزیلە.

٧- شیعە.

٨- ڕافیزە.

٩- ناصیبە.

١٠- ئەهلی حەدیس.

١١- ئەشعەرییەكان.



١٢- ماتوریدییەکان.

١٣- باطینییەکان.

چوارده (١٤) گرووپیشمان له باطینییەکان باسکردووون.

١٤- فەلسەفەو فەیلەسووفەکان.

١٥- تەصەووف و صۆفییەکان.

١٦- مەزهەبە فیقهییەکان.

١٧- وەهابییە.

١٨- سەنووسییە.

١٩- مەهدییە.

٢٠- جامیعەی ئیسلامییە.

**تەوەری چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە پێنج بەشی بنەڕەتیی پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** بوونناسیی (علم الوجود- ontologu).

**بەشی دووەم:** ئیمان و عەقیدە.

**بەشی سێیەم:** تێڕوانینەکان (التصورات).

**بەشی چوارەم:** بەهایەکان (القیم).

**بەشی پێنجەم:** پێوەرەکان (الموازین).

**تەوەری پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراو جۆر.**

ئەم تەوەرەش لە دە (١٠) بابەت پێکهاتوە، کە هەرکامیان لەبەشێکی سەربەخۆدا دەخەینەڕوو:

**بەشی یەکەم:** پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ، تەواوکارییە.

**بەشی دووەم:** شەریعەتی چەسپاوو ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!

**بەشی سێیەم:** ڕەوایی: فرەیی فیکریی و سیاسیی و ئایینی (مشروعية التعددية الفكرية والسياسية والدينية).

**بەشی چوارەم:** هاوولاتێتیی نامسوڵمانان لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا: ماف و ئازادییەکانیان.

**بەشی پێنجەم:** مافی چارەنووس و ئیدارەی خۆ بەدەستەوەبوونی نەتەوەکان.

**بەشی شەشەم:** ڕاوێژ (شورى)ی ئیسلام و دیموکڕاسی، خاڵی هاوبەش و جیاوازیان.

**بەشی حەوتەم:** ئافرەت و خێزان و گۆڕانکارییەکانی دنیا.

**بەشی هەشتەم:** تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان.

**بەشی نۆیەم:** بنەما گرنگەکانی: تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکان.

**بەشی دەیەم:** بنچینە سەرەکییەکانی دینداریيەکی ساغ و مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست.

# کتێبی یەکەم
# تەوەری یەکەم

## ڕوونکردنەوەی چەمك و چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی بیرکردنەوەی ئیسلامیی

# بــەرایــی

**خوێنەری بەڕێز!**

ئەم کتێبە کە تەوەری یەکەم لە پێنج تەوەرەکەی مەوسووعەی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحییی و واقیعدا} دەگرێتە خۆی، لەم چوار بەشە پێك دێ:

**بەشی یەکەم:** پێناسەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی و چەند وشەیەکی دیکەی نزیکی.

**بەشی دووەم:** سەرنج دانێکی مێژوویی لە بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا.

**بەشی سێیەم:** سەرچاوەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.

**بەشی چوارەم:** گرنگیی و پێویستیی بیرکردنەوە (تفکّر) لە ئیسلامدا.

شایانی باسیشە کە بەشی سێیەم[(١)]: {سەرچاوەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی} پێکهێنەری بنەڕەتیی ئەم تەوەرەیەو، بەتەنیا لە هەرسێك بەشەکەی دیکە زیاترەو، لە پێنج باسی سەرەکییدا، باسی پێنج سەرچاوەکانی وەدەستهێنانی زانست و بیرکردنەوەی ئیسلامیی دەکەین و، دواتر لەهەشت کورتە باسدا، قسە لەبارەی وەحییی خواوە دەکەین، کە تەنیا لەقورئان و سوننەتدا بەرجەستەیەو، هەوڵ دەدەین تیشکێکی باش بخەینە سەر قورئان و سوننەت لەچەند ڕوویێکەوە.

---

(١) ئەو بەشی سێیەمە لە کتێبی: (پێناسەو گرنگیی و پێویستیی: ڕێبازی پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم")دا لەبەشەکانی: (٣و٤و٥و٦و٧و٨و٩)دا، زیاتر لە نیوەی ئەو کتێبە پێك دێنیّ.

# بەشی یەکەم

## پێناسەی {بیرکردنەوەی ئیسلامیی} و چەند وشەیەکی دیکەی نیزیکی: فهم، فقه، ثقافة، علم، تراث، حضارة

## دەستپێك

خوێنەرانی بەڕێز! هەركەسێ بیەوێ لەسەر مەسەلەیەك قسە بكا، دەبێ سەرەتا باشی لێ تێبگات ئەو مەسەلەیە چییە؟ عەرەب گوتوویانە: (فهم السؤال نصف الجواب)، زۆ جار دووكەس یاخود دوو تەرەف، یان زیاتر، لەسەر شتێك دەبێتە مشت و مڕیان، دوای چەند سەعاتێك بگرەو بەردە، ئنجا حاڵی دەبن كە لە ئەصڵی مەسەلەكە حاڵی نەبوون، یاخود بە پێچەوانە لێی حاڵی بوون!

**كەواتە:**

پێویستە سەرەتا لەبارەی چەمك و واتای (بیركردنەوەی ئیسلامیی)یەوە، بەرچاو ڕوون بین، دواتریش چەند وشەیەكی دیكەی نیزیكیشی شی دەكەینەوە:

## ١- بیـر (الفكـر):[١]

### أ- فیكر لەڕووی زمانەوانییەوە (الفكـر لُغـة):

١)- (إبن فارس) دەڵێ: {(فكر): الفاء والكاف والراء: تردُّدُ القَلْب في الشَّيء، يقال: تفكَّرَ إذا ردَّدَ قلبه معتبِراً، ورجلٌ فِكِّير: كثير الفِكر}[٢]، واتە: (ف، ك، ر) واتە: فیكر، ئەوەیە كە عەقڵ[٣]، بێت و بچێ لە بیركردنەوەو تێوەڕامانی شتێكدا، دەگوترێ: (فِكِّير) زۆر بیركەرەوە.

---

(١) ئێمە بە كوردیی دەڵێین: هزر، وشەی فیكریش لە كوردییدا هەر بەكاردێ، هەندێ وشە هەن لە زمانەكاندا جێی خۆیان دەگرن، ئەگەر وەریانگێڕی بۆ وشەیەكی دیكە لە زمانێكی دیكە، ڕەنگە خەڵك باش لێیان تێنەگا، بۆ وێنە: ئێستا خەڵك باشتر لە وشەی كتێب تێدەگا، تاوەكو پەڕتووك و، خەڵك باشتر لە دەفتەر تێدەگا، تاكو تیانووس و، باشتر لەقەڵەم تێدەگا، تاكو پێنووس، بەڵام هەندێ جار فیكری دەمارگیریی و شۆفێنیی و نەتەوەیی، وا لە هەندێ خەڵك دەكا، هەستیار بن بەرامبەر بە هەندێ وشەی زمانی عەرەبی، یان زمانێكی دیكە، بەزۆرییش ئەو حاڵەتانە كاتێك ڕوودەدەن، كە ئەو نەتەوەیە هەست بە بێهێزیی (ضعف) بكا، بەڵام كاتێ لە حاڵەتی بەهێزیی و لەخۆڕادیتن دابێ، وشەی زمانەكانی دیكە دەهێنێت و هیچ منەتیشی پێ نیە، ئێستا بۆ وێنە: زمانی فارسی لەوانەیە (٧٠- ٨٠٪)ی زمانی عەرەبی بێ، بەڵام هەر گوێشیان لێ نیە، كەچی هەندێ كۆلكە نووسەری كوردی هەن، دەیانەوێ هەرچی وشەی عەرەبی كە هاتۆتە نێو زمانی كوردیی، بە وشەیەكی ئینگلیزیی بیگۆڕن! ئنجا ئەگەر كێشە ئەوەبێ كە عەرەب و فارس و تورك كوردستانیان داگیر كردوە، ئەوە بێگومان (سایكس بیكۆ) كە كوردستانی لەت كرد، لەنێوان بەریتانیاو فەرەنساو ڕووسیادا بوو، لەنێوان دەوڵەتانی عەرەبیی و توركیاو ئێراندا مۆر نەكرا!، بەڵام وەك (إبن خلدون) دەڵێ: ئەمە جۆرێكە لە بەزیین و تێكشكانی نێوخۆیی لەبەرانبەر لایەنێكدا، كە دەیەوێ هەموو شتەكانی ئەو، بهێنێتە شوێنی شتەكانی خۆی.

(٢) مقاييس اللغة، ج٤ ص٤٤٦.

(٣) ئەوان زیاتر وشەی (قلب)یان لەشوێنی عەقڵدا بەكار هێناوە.

٢)- (إبن منظور) دەڵێ: {(فكر): الفَكْرُ والفِكْرُ: إِعمال الخاطر في الشيء}[١]، واتە: هەر كام لە: (فَكْرُ وفِكْرُ) بریتین لەوەی كە ئینسان هۆشی خۆی بە شتێكەوە خەریك بكا.

٣)- (فیروز آبادي) دەڵێ: {الفِكر: إعمال النظر في الشيء}[٢]، واتە: فیكر: سەرنجدان[٣] و لێ وردبوونەوەی شتێكە.

٤)- (خلیل بن أحمد الفراهیدی) دەڵێ: {الفِكْرُ والتفكُّر: يَأتيان بِمعنىً واحِد، ورجلٌ فِكِّيرٌ : كثيرُ الإقبال عَلى فِكرةِ، والتّفكر إسمٌ للتَّفكير ويقولون: فَكَّرَ في أمره وتَفَكَّر، والفِكْرةُ والفِكر واحد}[٤]، واتە: وشەی (فِكْرُ وتفكُّر) یەك واتان، بۆ كەسێك، بەكاردێ كە زۆر ڕادەمێنێ، وشەی (تَفَكُّر) ناوە بۆ (تَفكير)، دەگوترێ: بیری لە شتەكە كردەوە، (فِكْره) و (فِكْر)یش یەك واتایان هەیە.

٥)- (إبراهيم مصطفى وآخرون) گوتوویانە: {فَكَرَ في الأمر يَفكِرُ فَكراً: أَعْمَل العقل فيه ورتّب بعض ما يعلم ليصل به إلى مجهول (أفكر) في الأمر: فكر فيه فهو مُفْكِرٌ، (فَكَّر) في الأمر، مبالغة في فَكَر وهو أشيع في الإِستعمال، فَكّر في المشكلة: أعمل عقله فيها ليتوصل إلى حلّها فهو مُفَكِّر، (افتكر) تذكَّر وفي الأمر: أعمل عقله فيه، (تفكر) في الأمر، افتكر، (التفكير) إعمال العقل في مشكلة للتوصل إلى حَلِّها (الفِكر): إعمال العقل في المعلوم للوصول إلى معرفة مجهول، وجمع فِكْر: أفكار، والفكرة والفكر الصورة الذهنية لأمرٍ ما، والجمع (فِكَر) والفِكِّير: الكثير التفكير، والمُفَكِّرة: دفترٌ صغير يُقَيِّدُ فيه ما يراد تذكُّرهُ}[٥]. دیارە ئەمیش هەر قسەی ئەوانی پێشێ دەهێنێ، بەڵام زیاتر شی دەكاتەوە، دەڵێ: (فَكَرَ) بەبێ شەددە، واتە: عەقڵی خۆی لەو شتەدا بەكار هێناو، زانیارییەكانی خۆی ڕێكخست، بۆ ئەوەی بگاتە دەرك كردنی شتێك كە نەیزانیوە، وەك چۆن (فَكَرَ) هاتوە، (أَفْكَر)ش هاتوە، ئەویش بەهەمان شێوە یانی: بیری لێ كردەوە،

---

(١) لسان العرب، ج١١ ص٢١٠.

(٢) القاموس المحيط، ص٤٨٢.

(٣) هەڵبەتە مەبەست سەرنجدانی عەقڵە نەك چاو.

(٤) كتاب العين، ج٣ ص٣٣٤.

(٥) المعجم الوسيط، ص ٦٩٨.

(فكّر) ئەگەر بە شەددە بێ، واتە: زۆری بیر لێ کردەوە، بۆ موبالەغەیە، (فكّر في المشكلة) واتە: زۆر عەقڵی خۆی لە کێشەکەدا بەکار هێنا، تاکو بگاتە چارەسەرێك، (تفكير) بریتیە لە بەکارهێنانی عەقڵ لە گرفتێکدا بۆ ئەوەی چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە، وشەی (فِكر) بریتیە لە: بەکارهێنانی عەقڵ لە شتێکدا کە دەیزانێ، بۆ گەیشتن بە شتێك کە نایزانێ، (فِكر) بە (أفكار) کۆ دەبێتەوە، (فِكرة) بریتیە لەو وێنەیەی کە ئینسان لە مێشکی خۆیدا دەربارەی شتێك پەیدای دەکاو، بە (فِكَر) کۆ دەکرێتەوەو (فِكِّير) واتە: کەسێك زۆر بیر بکاتەوە، (مُفَكِّرة)ش[1]، دەفتەرێکی بچووکە، ئەوە بویسترێ بیر بکەوێتەوە، تێیدا تۆمار دەکرێ، (مُفَكِّرە)ش یانی: بیرخەرەوە.

### ب- فیکر لەڕووی زاراوەییەوە: (الفِكر إصطلاحاً)[2]:

١- (راغب الأصفهاني) دەڵێ: {الفكرة: قوة مطرقة للعلم إلى المعلوم، والتفكُّر: جَوَلانُ تلك القوة بحسب نظر العقل، وذلك للإنسان دون الحيوان، ولا يقال إلا فيما يمكن أن يحصل له صورة في القلب، ولهذا روي: (تَفَكّروا في آلاء الله ولا تفكروا في الله)[3]، إذ كان الله مُنَزّهاً أن يوصف بصورة، قال بعض الأدباء: الفكر مقلوب عن الفرك لكن يستعمل الفكر في المعاني، وهو فرك الأمور وبحثها طلباً للوصول إلى حقيقتها}[4]، واتە: (فكرة) هێزێکە ڕوو لە زانیاریی دەکا، بۆ ئەوەی بگاتە زانراوێك و (تفكر)

-----

(١) زۆر کەس بە هەڵە بەکاری دەهێنێ و دەڵێ: (مُفَكَّرة).

(٢) دەبێ ئەوە بزانرێ: کە دەگوترێ: لە ڕووی زمانەوانییەوە یانی: ئەو وشەیە لە ئەصڵی زماندا چی دەگەیەنێ، بەڵام لە ڕووی زاراوەیی (إصطلاح)ی، واتە: کۆمەڵە خەڵکێك ڕێککەوتوون ئەو وشەیە بۆ ئەو شتە بەکار بێنن، یانی: مەرج نیە لە ئەصڵی زماندا ئەوە مانایەکەی بێ، بۆ وێنە: وشەی (صلاة) لە ئەصڵی زماندا یانی دوعا، بەڵام دوایی بۆتە زاراوەیەکی شەرعیی، بۆ خوا پەرستییەك کە ئەنجام دەدرێ، کە بە (ألله أكبر) دەست پێ دەکاتە، بە سەلام دانەوە کۆتایی دێ، وەك زانایان لە پێناسەی نوێژدا ئاوایان گوتوە.

(٣) الدرُّ المأثور، (٥٤٢/٨)، للسيوطي.

(٤) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٦٤٣.

بیر كردنەوە بریتیە لە جوولآنی ئەو هێزە بەپێی عەقڵ، واتە: عەقڵ سەرنج دەدا، كە ئەوەش تایبەتە بە مرۆڤەوە ئاژەڵ لەوە بێبەشە، تەنیا بە شتێكیش دەگوترێ: (فكرة) كە بگونجێ وێنەیەكی لە عەقڵدا پەیدا بێ، هەربۆیە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕراوەتەوە فەرموویەتی: {بیر لە چاكەو نیعمەتەكانی خوا بكەنەوە، بەڵام بیر لە خوا مەكەنەوە}، چونكە خوا وێنەی نییە تاكو (بیخەیە مێشك و دڵی خۆتەوە)، هەندێ لە ئەدیبەكان گوتوویانە: (فكر) هەڵگێڕدراوەی (فَرك)ە، {دەگوترێ: (فَرَك العين): واتە: چاوی هەڵگوشی، یان كەسێ كە جلێ دەشوا، هەڵیشەپێنێ و بیجووڵێنێ، وشەی (فِكر)یش بریتیە لەوە كە تۆ ئەو ماناو مەبەستە هەڵپشێوی و بیجووڵێنی، تاكو بگەی بە حەقیقەتەكەی داخۆ مەبەست پێی چییە؟.

٢- (جميل صليبا) دەڵێ: {وجملة القول: أنَّ الفكر يطلق على الفعل التي تقوم به النفس عند حركتها في المعقولات، أو يطلق على المعقولات نفسها، فإذا أُطلِق على فعل النفس دَلَّ على حركتها الذاتية وهي: النظر والتأمل، فإذا أُطلق على المعقولات دل على المفهوم الذي تُفَكِّر فيه النَّفس}[١]، واتە: كورتەی قسان ئەوەیە كە وشەی (فكر) بەوە دەگوترێ كە نەفس پێی هەڵدەستێ، لە كاتێكدا لەنێو شتە فامكراوەكاندا دێت و دەچێت، یاخود وشەی (فِكر) بە ئەصڵی شتە فامكراوەكان دەگوترێ، ئنجا ئەگەر بە كردەوەی نەفس بگوترێ، ئەوە مانای ئەو جووڵە زاتییەیە كە عەقڵ هەیەتی، كە بریتیە لە سەرنج دان و تێوەڕامان، ئنجا ئەگەر وشەی (فِكر) مەبەست لێ شتە فامكراوەكان بێ، ئەو شتانەی كە لە عەقڵدا جێگیر دەبن، ئەوە مەبەست پێی ئەو چەمكەیە كە نەفس بیری لێ دەكاتەوە.

---

(١) المعجم الفلسفي، ص ١٥٦.

بیری ئیسلامیی (الفكر الإسلامی):[١]

سەرەتا دەڵێین: وشەی هزری ئیسلامیی (الفكر الإسلامي) زاراوەیەکی تازەیە، ئنجا نەك هەر ئەوە، بەڵكو هەر كام لە: (السياسة الإسلامية)، (السياسة الشرعية)، (الإقتصاد الإسلامي) (الإجتماع الإسلامي).. هتد، هەموو ئەو زاراوانە تازەن، بۆچی؟ چونکە کاتی خۆی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، فیكر هەر ئیسلامیی بووە، ئابووریی هەر ئیسلامیی بووە، عادەتەکان هەر ئیسلامیی بوون و، هەموو جموجۆڵەکان هەر ئیسلامیی بوون و لە ئیسلامەوە وەرگیراون، بۆیە پێویستی نەکردوە، قەیدی (ئیسلامیی) بخەنە سەری، بەڵام دوایی کە (أفكار)ی نا ئیسلامیی هاتوونەتە نێو مسوڵمانانەوە، بە پێویستیان زانیوە ئەو فیکرەیە کە لە قورئان و سوننەتەوە دێ و فیکرەیەکە لەژێر ڕۆشنایی وەحییدا دەگوترێ، جیا بكرێتەوە لە فیکرەیەك کە لە ژێر ڕۆشنایی فەلسەفەیەکی دیکەدا دەگوترێ، بۆیە وشەی {ئیسلامیی}یان خستۆتە سەرێ.

ئنجا ئەگەر تۆ بتەوێ بگەڕێیەوە کتێبەکانی زانایانی هەر (١٠٠) ساڵ لەمەو پێش، نەك هی زیاتریش، وشەی فیکری ئیسلامیی نابینی.

ئنجا هەندێ لە زانایان، بۆ وێنە: (إبن عثيمين) ڕەحمەتی خوای لێبێ و، (د. محسن عبدالحميد)و زانای دیکەش، خۆیان پاراستوە، یاخود بە تێبینییەوە وشەی {فیکری ئیسلامیی}ان بەکار هێناوە، گوتوویانە: وا باشە بەکار نەهێنرێ، هەڵبەتە من نەك لەبەر قسەی ئەوان، بەڵكو لەبەر ئەوەی کە دوایی خۆم باسی دەکەم، پێم باش نیە وشەی: {فیکری ئیسلامیی} بەکار بهێنرێ، بۆیەش بۆ ئەو بابەتە کە بۆ ئێوەم ئامادە کردوە، کە ناوو نیشانێکی گەورەیە، پێم چاك نەبوو بەکاری بهێنم، دواییش باسی دەکەم بۆچی؟

---

(١) من لە کۆتایی ئەم باسەدا بۆتان باس دەکەم کە بۆچی زاراوەی: {فیکری ئیسلامیی} یم پێ باش نیە بەکار بێ و زاراوەی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی} بەکار دەهێنم، دوایی ڕوونی دەکەمەوە لەبەرچی!.

**فیكر (هزر)ی ئیسلامیی یانی چیی؟**

حەوت پێناسەم هێناون، شەشیانم لە زانایان و نووسەران وەرگرتوون و یەكێكیان هی خۆمە:

١- (الفِكرُ الإِسلامي، هوَ الحُكم عَلى الواقع مِن وِجهةِ نَظَر الإِسلام)، واتە: فیكری ئیسلامیی بریتیە لە حوكم دان بەسەر واقیعدا لە گۆشە نیگای ئیسلامەوە.

٢- (الفِكر الإِسلامي، هوَ كُل نِتاجٍ لِلعقلِ البَشَريِّ الموافِق لِمَنهج الإِسلام)، واتە: هزری ئیسلامیی هەموو بەرهەمی عەقڵی مرۆڤە كە بگونجێ لەگەڵ بەرنامەی ئیسلامدا.

٣- (الفِكرُ الإِسلامي، هوَ الفِكرُ المُنضَبطُ بِقواعِدِ الإِسلامِ وَأحْكامِهِ والمُصطَبَغِ بِأَخلاقِهِ وَهَديه فـي الرّؤى وَالنَّظَرات العُليا لِتَفسير الكَون والحَياة والنَّفس الإِنسانية، وَنواميسها الأَزَلية، وما يُناسِبها مِنَ النُّظُم والتَّشـريعات المُلائـمةِ للإِنسان والحياة والكون)، واتە: بیری ئیسلامیی بریتیە لەو فیكرەیەی كە لە چوار چێوەی بنچینەو یاساكانی ئیسلامدایەو ڕەنگ دەكرێ بە ڕەوشتە ئیسلامییەكان و بە ڕێنمایی ئیسلامەوە، لە تەماشا كردن و سەرنجدانی بوون و ژیان و نەفسی مرۆڤ و، ئەو یاسایانەی كە تێیاندا دانراون و ئەوەی كە لە یاساكان بۆ مرۆڤ و بۆ ژیان و لەگەڵ بوونەوەردا، گونجاون[١].

٤- (الفِكرُ الإِسلامي، هوَ الفِكر الَّذي أَنتجَه التَّفكير الإِسلاميُّ المُلتَزِم بِالأُسس وَالمَوازِين الإِسلامية)، بیری ئیسلامیی، ئەو بیرەیە كە بیركردنەوەی ئیسلامیی پابەند بە بنەماكان و پێوەرە ئیسلامیەكانەوە، بەرهەمی هێناوە.

٥- (الفِكر الإِسلامي: كُلُّ ما أَنتجَهُ فِكرُ المُسلمِين مُنذ مَبْعَث الرَّسولِ صَلّى الله عليه وسلم إِلى الْيَوم، مِنَ المَعارِفِ الكَوْنيّة المُتَعَلِّقة بِاللهِ سُبحانَه وَتعالى والعالَمِ والإنسان، والَّذي

---

(١) ئەم سێ پێناسەیە لە كتێبی (التجديد في الفكر الإسلامي المعاصر)ي إسحاق بن عبدالله السعدي، هێناونی، ص٧، ص٦، ص١٠.

يُعَبِّرُ عَن إجتهادات العَقلِ الإنسانية في تفسيرِ تِلكَ المَعارِف، العامَّة في إطار المباديء الإسلامية: عَقيدةً وشريعةً وسلوكاً)[1]، واتە: فیكری ئیسلامیی، هەمموو ئەوەیە كە مسوڵمانان هەر لەدوای ڕەوانە كرانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بەرهەمیان هێناوە، لە زانستە گەردوونییەكان كە پەیوەستن بە خوای پاك و بەرزەوەو پەیوەستن بە دنیاوەو، پەیوەستن بە مرۆڤەوەو، ئەو فیكرەیەش تەعبیر دەكا لە كۆشش كردنی عەقڵی مرۆڤ (یانی: عەقڵی مرۆڤی مسوڵمان) بۆ ڕوونكردنەوەی ئەو زانستانە لە چوارچێوەی پرەنسیپە ئیسلامییەكاندا، چ وەك عەقیدە، چ وەك شەریعەت، چ وەك ڕەفتار.

٦- (محمد الغزالی) دەڵێ: (الفِكر الإسلامي، لَيس هوَ الإسلامُ بَل هو صُنعةُ المُسلمِين العَقليةَ في سَبيل الإسلام)[2]، واتە: هزری ئیسلامیی، بریتی نیە لە ئیسلام، بەڵكو دروستكراوو بەرهەمی مسوڵمانانە، لە پێناوی ئیسلامدا (واتە: جۆری تێگەیشتنی ئەوانە بۆ دین و ژین).

٧- پێناسەی حەوتەم كە هی خۆمە دەڵێم: (الفِكر الإسلامي هو ما تَمَخَّض عَنهُ تَفاعل عَقل المُسلمينَ مَع الوَحْي والواقِع، بُغيةَ فَهمٍ صَحيحٍ لِلْوَحي، وتَنزِيله عَلى الواقع بِسَداد، عِبادةً لِله تَعالى، والَّتي تُثمِر الحَياة الطيِّبة في الدُّنيا وَالفَلاحَ في الأُخرى)، واتە: فیكری ئیسلامیی، ئەوەیە كە كارلێكی عەقڵی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی و واقیعدا، بەرهەمی هێناوە، بەمەبەستی تێگەیشتنێكی ڕاست دەربارەی وەحییی و، دابەزاندنێكی دروستی بۆ سەر واقیع، وەك بەندایەتیی بۆ خوای بەرز، كە ئەو بەندایەتییە ژیانێكی ڕێك و باش لە دنیاداوەو، سەرفرازیی لە دواڕۆژدا دەستەبەر دەكا.

---

(١) الفكر الإسلامي تقديمه وتجديده، ص٧و ص٢١. د. محسن عبدالحميد.

(٢) ليس من الإسلام، محمد الغزالي، ص ١١٣.

## ٢- تێگەیشتن (الفهم):

بە كوردیی دەڵێین: تێگەیشتن، حاڵیی بوون، جاری وا هەیە وشەی {فام كردن}یش بەكار دێنن، بۆیە ئەگەر كەسێك ناحاڵیی بێ، دەگوترێ: ئەمە كەسێكی نەفامە، یانی: تێناگا.

(المعجم الوسیط) دەڵێ: (الفَهم: حُسن تَصوُّر المَعنى، والفَهم: جَودةُ استِعدادِ الذِّهن لاستنباط، والجَمع أَفهام وَفُهوم، والمَفهوم: مَجموع الصِّفات والخَصائص المُوَضِّحةُ لِمَعْنىً كُلِّي، وَيُقابِلُهُ الماصَدق)[1]، واتە: فەهم[2]: بریتیە لە چاك وێنا كردنی واتایەك، {واتە: شتێك باش لە مێشكی خۆتدا جێ بكەیەوە}، هەروەها واش پێناسە كراوە كە بریتیە لە باش ئامادەیی هۆش بۆ هەڵهێنجانی واتایەك لە شتێك، وشەی: (فهم) بە (أفهام)یش كۆ دەكرێتەوە، بە (مفهوم)یش كۆ دەكرێتەوە، {واتە: كۆیەكەی دەگونجێ (أفهام) بێ و، دەگونجێ (فُهُوم) بێ}، ئنجا (مفهوم) {كە لەسەر كێشی (مفعول)ە}، بریتیە لە كۆی ئەو سیفەت و تایبەتمەندییانەی كە مانایەكی گشتی ڕوون دەكەنەوەو، لەبەرامبەر (مفهوم)دا (ما صدق)[3] هەیە.

---

(١) معجم الوسیط، ص٧٠٤.

(٢) بەكوردیی دەڵێین: تێگەیشتن.

(٣) ئەمانە دوو زاراوەی لۆژیكیی (منطقي)ین، (مفهوم) ئەوەیە كە لە مێشكدا جێگیر دەبێ و، (ما صَدَق) ئەوەیە كە لەسەر ئەرزی واقیع هەیە، بۆ وێنە: ئەو مایكەی پێشم، ئەو بۆچوونەی بۆیم هەیە، پێی دەگوترێ: (مفهوم) بەڵام شتەكە خۆی لە واقیعدا (ماصدق)ی پێ دەگوترێ.

### ٣- چاك تێگەیشتن (الفقه):

(فقه) بەمانای ورد تێگەیشتن، یاخود چاك تێگەیشتن، دێ:

#### أ- لەڕووی زمانەوانییەوە (في اللغة):

(الجرجاني) دەڵێ: {الفقه عبارة عن فهم غرض المتكلِّم من كلامه}[١] واتە: فیقه لە زماندا بریتیە لە تێگەیشتن لە مەبەستی قسە بێژ، لە قسەكەی.

كەسێك كە قسە دەكا، ئەگەر تۆ باشی لێ تێبگەی، ئەوە پێی دەگوترێ: (فقه) نەك هەر تەنیا ڕواڵەتی قسەكەی، بەڵكو مەبەستی قسەكەی چییە؟!.

#### ب- لەڕووی زاراوەییەوە (في الإصطلاح):

{هو العلم بالأحكام الشرعية العملية المكتسبة من أدلَّتها التفصيلية}[٢]. واتە: بریتییە لە زانیاریی هەبوون بە حوكمە شەرعییە كردەییەكان كە لە بەڵگەكان وەردەگیرێن، {واتە: لە قورئان و سوننەت و ئیجماع و قیاس و .. هتد}.

هەڵبەتە وشەی (فقه) لە بەكارهێنانی قورئانداو، لە بەكارهێنانی سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) واتە: باش تێگەیشتن، ئنجا چ باش تێگەیشتن لە دین، چ باش تێگەیشتن لە ژین، چونكە خوا سبحانه و تعالى لە سوڕەتی (التوبه)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

---

(١) التعريفات، ص١٦٧.

(٢) هەمان سەرچاوەو لاپەڕ.

واتە: مسوڵمانان نابێ تێکڕا دەربچن، دەبووایە لە هەر کۆمەڵەیەکی زۆر، کۆمەڵێکی کەمیان بچن، تاکو لەدین تێبگەن.

ئنجا ئەگەر وشەی (فقه) وەك مانا زاراوەیی (إصطلاحي)یەکەی، یانی: زانیاریی بە حوکمە شەرعییە کردەییەکان، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئاندا، یانی: باشتر تێگەیشتن لە دین: بە بووناسیی و عەقیدەیەوە، بە گاعەت و کردەوەیەوە، بەلایەنی تەزکیەی نەفسیەوە، ....هتد.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: {وَمَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ} أخرجه أحمد برقم (٢٧٩١)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

واتە: هەرکەسێ خوا چاکەی بۆی، بوێ لەدیندا ورد شارەزای دەکا.

لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە باش تێگەیشتن لەدین، سیفەتێکی زۆر چاکەو نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، خوای پەروەردگار بە هەرکەسێکی بدا، چاکەو خێری بۆی ویستوە.

لە سوورەتی (الأنفال)دا خوا سبحانە و تعالى لە باسی ئەوەدا کە دەبێ دە (١٠) جەنگاوەری مسوڵمان لەبەرانبەر سەد (١٠٠) کەس لە جەنگاوەرانی نامسوڵماندا بوەستن، دوایی دەفەرموێ:

﴿.. بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾﴾ الأنفال.

واتە: ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئەوانە باش تێناگەن.

کەواتە: فیقە مەرج نیە تەنیا باش تێگەیشتن بێ لە دین، بەڵکو باش تێگەیشتن لە ژینیش هەر دەگرێتەوە، یانی: (لایفقهون) واتە: باش خوا نەناسین و باش خۆ نەناسین.

## ٤- كلتوور (الثقافة - culture):

بە كوردیی دەگوترێ كلتوور، كە هەر لە (كەلچەر)ی ئینگلیزییەوە هاتوە.

### أ- لەزماندا (لغة):

{ثَقِف يَثقِف ثَقْفاً ثَقَفَاً: صار حاذقاً فَطِناً، فَهو ثَقِفٌ وثَقِف الشَّيءَ ظَفَر به، وثقَّف الشَّيءَ أقام المُعوجّ منه وَسَوّاهُ، وثقَّف الإنسانَ: أدّبه، وهذَّبه، وعلَّمَهُ}، واتە: وشەی: (ثَقِف يَثقِف ثَقْفاً ثَقَفَاً) یانی: ئەو كەسە زۆر كارامەو وردو شارەزا بوو لەو شتەدا، (وثَقِف الشَّيءَ) واتە: زەفەری بەو شتە برد، زۆر بە كارامەیی، (وثقَّف الشَّيءَ) واتە: ئەو شتە كە لارییەكی تێدا هەبوو، ڕاستی كردەوە، (وثقَّف الإنسانَ) واتە: ئینسانەكەی ڕێك خست سیفەتە خراپەكانی لێ لابردن، وە شارەزای كرد.

### ب- لەزاراوەدا (إصطلاحاً):

١- {الثقافة: العلوم والمعارف والفنون التي يُطلَب الحَذقُ فيها}[١]، واتە: (الثقافة) بریتییە لەو زانیاریی و شارەزایی و هونەرانەی كە پێویستە ئینسان باش تێیاندا شارەزا بێ.

١)- لە هەركام لە: (المعجم الفلسفي) و (معجم اللغة العربية)دا هاتوە دەڵێ: {الثقافة ما فيه الإستنارة في الذهن وتهذيبٌ لِلذَّوق، وتَنميةٌ لِملكةِ النَّقدِ والحُكْم لَدَى الفَردِ أَو المُجتمع، وتَشمُل المَعارِف والمُعتقَداتِ والفَن والأَخلاقِ وجميع القُدُراتِ التي يتَّسمُ بها الفرد في مُجْتَمعهِ، ولها طُرُق وَنماذج عملية وفكرية وروحية، ولكل جيلٍ ثقافته التي إستمَدَّها من الماضي، وأضاف إليها ما أضَاف لِلحاضِر، وهي عِنوان المُجتمعات البَشَرية}[٢]. واتە: وشەی (ثقافة) واتە: ڕۆشن بوونەوەی هۆش

---

(١) المعجم الوسيط، ص ٩٨.

(٢) المعجم الفلسفي ص ٥٨، كە لە (معجم اللغة العربية)وە وەریگرتوە.

(الذهن) بە زانیاریی و، رێك و پێك بوونی زەوق و سەلیقەو، گەشە كردنی سیفەتی ڕەخنە گرتن و، بڕیاردان لەلای تاك و كۆمەڵ، وشەی (ثقافة) هەموو ئەو زانیاریی و موعتەقەدو هونەرو ڕەوشت و تێكڕای ئەو شتانە دەگرێتەوە، كە تاكێك لەنێو كۆمەڵگادا خۆی پێیان دەڕازێنێتەوەو، وشەی (ثقافة) حاڵەتە كردەییەكان و فیكرییەكان و حاڵەتە ڕۆحییەكان دەگرێتەوە، هەر كۆمەڵگایەك كلتوورێكی خۆی هەیە، كە لە ڕابردوو وەری گرتوە، كلتوور ئەوەیە كە لە ڕابردوو وەرگیراوەو، وە لە ئێستاشدا ئەوەی كە پەیدا بووە، خراوەتە سەری و كلتوور پێناسەی كۆمەڵگاكانی مرۆڤە[١]. بە كورتیی: كلتوور: بریتیە لەو عادەت و نەریتانەی كە جیلەكان خۆیانیان پێ، دەڕازێننەوە، دوایی هەمووی كەڵەكە دەبێ و دەبێتە میراتێك بۆ ئەو كۆمەڵگایەو دەبێتە قەناعەتێك لەلای هەمووان، بەبێ ئەوەی لە كتێبدا بنووسرێ، هەموویان دەزانن كە نابێ پێچەوانەی ئەوە بجووڵێنەوە[٢].

---

(١) خوێنەرانی بەڕێز!

دەچی بۆ ئەو وڵاتە ڕۆژئاواییانە، كەسێ شتێك كە دەخوا نابینی قوتوەكەی یان كاغەزەكەی فڕێ بدا، ئەمە نابینی، من بۆخۆم چەندان لەو وڵاتانەم بینیوە، حاڵەتی ئەوا زۆر زەحمەتە بینینی، مەگەر لە شوێنێكی زۆر پەڕیدەو چۆڵ، ئنجا كەس نابینی لەسەر سەرە گرتن، دەمەقاڵییان بێ، كەس نابینی لە مەوعیدی خۆی دوا بكەوێ، ئەگەر دوا بكەوێ كۆڵێك عوزر دەهێنێتەوە، ئایا ئەوە پەیوەندیی بە چییەوە هەیە؟ ئەوە كلتووری پێ دەڵێن، ئەوە بە وتارێكی مامۆستایەك خەڵك فێری نابێ و، بە بڕیارێكی ئیداریی خەڵك ئەوە فێر نابێ، بەڵكو پێویستی بەوە هەیە خەڵكی لەسەری پەروەردە بكرێ.

(٢) من جارێك لە ماركێتێكدا دەهاتمە دەرێ، لەپێش منەوە ئافرەتێك چووە دەر، دەرگاكە وابوو ئەگەر نەیگرتبایە دەهاتەوە، دیاربوو دەرگاكەی گرت، هەتا من چوومە دەرێ، منیش پێم سەیر بوو، گوتم: ئەمە چۆن بوو؟ گوتیان: لێرە كلتوورە، ئەگەر كەسێك لێت نزیك بێ و تۆ بچیە دەرێ، نابێ دەرگاكە بەردەی پێی بكەوێتەوە، دەبێ بیگری.

جاری واش هەیە كلتوور شتێكی خراپە، بۆ وێنە: لە كوردەوارییدا هەندێ كلتووری خراپ هەن، بۆ نموونە: لە هەندێ شوێن شایی ڕەشبەڵەك عادەتە، ئنجا ئەگەر كەسێك بڵێ: ئەوە ناشەرعییە، دەڵێن: ئەوە عادەتمانە! كە ئەوە كلتوورێكی سەقەتە.

**کلتووری ئیسلامیی (الثقافة الإسلامية):**

لە کتێبی (الثقافة الإسلامية)دا هاتوە: {هي علم دراسة التصورات الكلية والمستجدات والتحديات المتعلقة بالإسلام والمسلمين، بمنهجية شمولية مترابطة}[1] واتە: کلتووری ئیسلامیی بریتیە لە زانیاریی وێنا کردنە گشتییەکان و شتە تازە پەیدا بووەکان و کێشەکان کە پەیوەستن بە ئیسلام و مسوڵمانانەوە، بەبەرنامەیەکی گشتگیری بەیەکەوە پەیوەست.



ئنجا کلتوور - وەك گوتم - لەوانەیە پەیوەندیی بە لایەنی فیکریی، یان ڕووحیی، یان عەقڵییەوە هەبێ، یان کۆمەڵایەتیی، یان سیاسیی، بۆ وێنە: ئێستا لەو وڵاتانە بۆ چوار ساڵ سەرۆك هەڵدەبژێردرێ، لەدوای چوار ساڵەکە بڕو بیانوو ناهێنێتەوەو یەکسەر لە کورسیەکەی دێتە خوارێ ئەوە کلتورێکی سیاسییە و، ئەگەر سەرۆکێ بڵێ: نایەمە خوارێ، پێیان سەیرو عەجایب دەبێ.

(١) الثقافة الإسلامية، ص ٢١، مجموعة مؤلفين/ جامعة العلاقات الدولية.

## ٥- زانیـاریی (العـلـم)[1]:

١- (الجرجاني) بە چوار شێوە پێناسەی (علم)ی كردوە:

أ- {العلم هو الإعتقاد الجازم المطابق للواقع}[٢]، واتە: (علم) بریتیە لە بڕوا بوونێك كە گومانت تێیدا نەبێ و ڕێك و پێك بێ لەگەڵ واقیعدا.

ب- {حصول صورة الشيء في العقل} واتە: پەیدا بوونی وێنەی شتێك لە عەقڵدا.

جـ- {إدراك الشيء على ما هو به} واتە: زانینی شتێك، وەك خۆی چۆنە ئاوا بیزانی.

د- {زوال الخفاء من المعلوم، والجهل نقيضُهُ} لاچوونی پۆشش لەسەر شتێك كە زانراوەو، پێچەوانەی (علم) بریتیە لە (جهل) واتە: نەزانین.

٢- (راغب الأصفهاني) دەڵێ: {العلم: إدراك الشيء بحقيقته؛ وذلك ضربان:

**أحدهما:** إدراك ذات الشيء.

**والثاني:** الحكم على الشيء بوجود شيء هو موجود له، أو نفي شيء هو منفي عنه}[٣]، واتە: زانیاریی بریتیە لە دەرك كردنی حەقیقەتی شتێك، ئەویش دوو جۆرە: یەكەم: دەرك كردنی زاتی ئەو شتە، دووەم: زانینی حوكم دان بەسەر ئەو شتەدا، جا چ بۆ سیفەتێك كە هەیەتی، چ بۆ سیفەتێك كە نیەتی.

---

(١) زانیاریی (العلم)، هەندێ شت ئەوەندە ڕوونە، ئەگەر بتەوێ ڕوونتری بكەیەوە، ڕەنگە تۆزێ ئاڵۆز بێ، زانیاریی واتە: شت زانین.

(٢) التعريفات، ص١٥٥.

(٣) مفردات ألفاظ القرآن، ص٥٨٠.

## ٦- كەلەپوور (التراث) (heritcag):

ئێمە بە كوردیی دەڵێین: كەلەپوور.

**أ- لەڕووی زمانەوانییەوە (لغــة):**

{التراث لغة: الوراثة والإرث إنتقال قِنيةٍ إليك من غيرك، من غير عَقْدٍ، ولا ما يجري مجرى العقد، وسمِّي بذلك المنتقل عن الميِّت فيقال للقنية الموروثة: ميراث وإرث وتراث أصله: وراث، فَقُلِبَت الواو ألفاً وتاءً}[1]، واتە: وشەی (تراث) بریتیە لەوە كە شتێك لە مردوویەكەوە بۆتۆبێ، {بەكوردییش میراتی پێ دەڵێین}، بەبێ ئەوەی عەقدێك لەنێوانتاندا هەبێ، هەر شتێك بەتۆ بگا بێ ئەوەی تۆ شتێك لە بەرامبەریدا بدەی، پێی دەگوترێ: (میراث وإرث وتراث) هەرسێكیانی بۆ بەكاردێن.

**ب- لەڕووی زاراوەییەوە (إصطلاحاً):**

{التراث الإسلامي، هو مجموع ما خلَّفه المسلمون من إجماع وقياس وإجتهاد في الفقه، والتفسير والحديث، وما قاله اللغويون والنحويون، وأهل البلاغة والبَيان، وما جَمَعَهُ المُؤَرِّخون من أخبار وسير ومناسبات، وما خلَّفته الأجيال من حضارة وفنون وعلوم، فالتراث حركة الإنسان في التأريخ، بعد أن يكون حركته في المكان والزمان، وأعمالنا بمجرد أن تنفصل عنّا، تُصْبِح تراثاً}[2]، واتە: (توراپ)ی ئیسلامیی بریتیە لەكۆی ئەوەی مسوڵمانان بەجێیان هێشتوە، لەیەك دەنگییان و، لە قیاس كردنیان و، لە كۆشش كردنیان، لە ڕووی فیقهەوەو لە ڕووی تەفسیرو لەڕووی فەرموودەو، ئەوەی كە زمان زانان گوتوویانەو، ئەوەی شارەزایانی ڕێزمانی عەرەبی و

---

(١) هەمان سەرچاوە ص ٨٦٣.

(٢) دراسات في الثقافة الإسلامية، ص٢٠، الثقافة الإسلامية ص٧٣.

ڕەوانبێژیی، گوتوویانەو، ئەوەی كە مێژونووسان كۆیان كردۆتەوەو، هەرچی كە جیلەكانی مسوڵمانان كۆیان كردۆتەوە، لە شارستانیەتیی، لە هونەر، لە زانستەكان، كەواتە: (توراث) بریتیە لە جوڵەی مرۆڤ لە مێژوودا، ئنجا دوای ئەوەی كە جووڵەكەی تەواو دەكا، لە كات و شوێنداو، تەنیا بەوەی كە لێی جیا دەبێتەوە، پێی دەگوترێ: (توراث)، كەواتە: (توراث) هەموو ئەوەیە كە مسوڵمانان بۆ ئێمەیان جێهێشتوە[١].



---

(١) بەڵام بۆ زانیارییتان! هەندێ لە عەلمانییەكان قورئان و سوننەتیش دەخەنە ئەو چوار چێوەیەوە، بەڵێ لەو ڕووەوە كە ئێمە لە پێشووەكانەوە پێمان گەیشتوە، ڕاستە پێی دەگوترێ: (توراث) لەو ڕووەوە كە لە پێشووەكانمانەوە پێمان گەیشتوە، بەڵام لەو ڕووەوە كە زادەی فیكری بەشەر نیە، پێی ناگوترێ (توراث) چونكە ئیسلام وەحی خوای پەروەردگارەو بە زانیاریی بێ سنووری خوا هاتوە، ئنجا توراث دەگونجێ هەڵە بێ و، دەگونجێ ڕاست بێ، بەڵام وەحی خوای پەروەردگار ڕاستەو هەڵەی تێدا نیە.

### ٧- ژیــار (الحضــارة)[1] (civilisation):

#### أ- لەڕووی زمانەوە (لغـــة):

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: {الحَضَر خِلاف البَدْو، والحَضارةُ والحِضارة السكُون بالحَضَر، كالبَداوة والبِداوة ﴿وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ ...﴿١٦٣﴾﴾ الأعراف، أي: قريبة}[2]، واتە: لە زماندا لە (حضر)ەوە هاتوە، (الحضر خِلاف البَدْو) شارنشین پێچەوانەی بیابان نشین، ئەوانەی لە دەشت و دەرن و كۆچەریین، بەڵام (حضر) ئەوەیە كە نیشتەجێیەو، (الحَضارةُ والحِضارة) هەردووكیان واتە: شارنشینیی، وەك (البَداوة والبِداوة).

#### ب- لەڕووی زاراوەییەوە (إصطلاحاً):

١- (محمد قطب) دەڵێ: {هو عمارة الأرض بمقتضى المنهج الرباني، فيدخل في ذلك الجوانب المادية والتنظيمية، وتدخل فيها القيم التي يحملها هذا الدين، غير منفصلة هذه عن تلك}[3]. واتە: (حضارة) بریتیە لە ئاوەدان كردنەوەی زەوی بەپێی بەرنامەی پەروەردگار كەواتە: هەم لایەنە ماددییەكان و، هەم لایەنی ڕێكخستن و ئیداریی دەچنە نێوی و، هەم ئەو بەهایانەی كە ئەم ئایینە هەڵی گرتوون، هیچیان لەیەكدی جیا نابنەوە، بە هەردووكیان پێیان دەگوترێ (حضارة).

---

(١) بە كوردیی شارستانێتیی پێ دەڵێن و، هەندێك وشەی (ژیار)یشی بۆ بەكاردێنن، ئنجا بۆ زانیارییتان! زمانی كوردیی لەزۆر ڕووەوە هەژارە، لەبەر ئەوەی كورد دەوڵەتی نەبووە، بۆیە ئێستا ئەگەر زۆر لە وشەو زاراوەكانی جیهان، چ لە عەرەبییەوە چ لە زمانەكانی دیكەوە، بمانەوێ بەكوردیی تەرجەمەیان بكەین، دەبێ وشەیان بۆ داتاشیین، چونكە لە ئەصڵدا كورد ئەو شتانەی نەبوون، تاكو وشەیان بۆ بەكاربێنێ.

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٢٤١.

(٣) واقعنا المعاصر، ص٩٤،٩٣.

٢- د. (جاد محمد عبدالعزيز) دەڵێ: {إنها ثمرة التوازن الدقيق بين مرتكز القيم والمبادىء والأخلاقيات، ومرتكز الماديات والأساليب والمهارات عَبْرَ حركة الجهد الإنسانيِّ في عمارة الأرض وفق منهج الإستخلاف الرباني}[1]. واتە: (حضارة) بریتیە لە بەرهەمی ئەو هاوسەنگییە وردەی کە لەنێوان بەهاو مەبدەءو ڕەوشتەکاندا هەیە، لەگەڵ لایەنە ماددییەکان و ئامرازو شارەزاییەکاندا، لە میانەی کۆششی مرۆڤدا، بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی، بەپێی بەرنامەی بە جێنشین گرتنی مرۆڤ لەلایەن پەروەردگارەوە.

هەندێ لەزانایان دەڵێن: وشەی (الحضارة) لایەنە ماددییەکەی دەگرێتەوە، کلتوور: لایەنە مەعنەویی و فیکرییەکەی دەگرێتەوە، بەڵام لە ڕاستییدا کلتووریش دەچێتەوە نێو چەمکی شارستانێتی.

ئنجا بێمە سەر قسەی کۆتاییم لەم باسەمدا، ئەویش ئەوەیە:

بۆچی وشەی {هزری ئیسلامیی} یان {فیکری ئیسلامیی}م بەکار نەهێناو، لەجیاتی ئەوە: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا)م بەکار هێنا؟



---

(١) التنوع الثقافي والحوار الحضاري، د. حامد أحمد الرفاعي عن: أثر لحضارة الغربية على المجتمعات الإسلامية، د. جاد محمد عبدالعزيز، ص ٣٥.

## حیكمەتی بەكارهێنانی ناوو نیشانی:
## (بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا)
## لەجیاتی (هزری ئیسلامیی)

لەبەر ئەوەی كە فیكر - وەك پێناسەمان كرد - ئەوەیە كە لە عەقڵ و هۆشی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ، كەواتە: ئەگەر بڵێی فیكری ئیسلامیی واتە: دەبێ بڵێی: جیا لە وەحیی، ئنجا باشە فیكری ئیسلامیی ئەگەر لە وەحیی جیا بكەیتەوە، بۆچی پێی دەگوترێ ئیسلامیی و، ئەگەر فیكری ئیسلامیی، وەحیی لێ لابەری، ئیسلامیی بوونەكەی لەكوێ دایەو، ئەگەر وەحیی تێدابێ، چ پەیوەندییەكی بە مرۆڤەوە هەیە؟ كوا لە مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتوە؟ وەحیی لەخواوە سەرچاوەی گرتوە.

لەبەر ئەوە: ڕاست وایە بگوترێ: بیركردنەوەی ئیسلامیی، ئنجا من هەڵساوم وشەی فیكرەكەم گۆڕیوە بە (التفكر)، (فكر) واتە: بیر، ئەوەی كە عەقڵ بەرهەمی هێناوە، بەڵام بیركردنەوە، بریتیە لە پڕۆسەیەك كە عەقڵ پێی هەڵدەستێ، لەگەڵ بەرهەمەكەیشی.

ئنجا كە گوتوومە: لەنێوان وەحیی و واقیعدا، واتە: عەقڵی مرۆڤ سەرنجی وەحییی دەداو، سەرنجی ئەو واقیعەش دەدا كە تێیدا دەژی، وەك من لە پێناسەكەدا گوتوومە: (بریتیە لە تێوەڕامانی عەقڵ بۆ وەحیی خوا، بۆ ئەوەی باش و ڕاست و دروست لێی تێبگات و سەرنجدانی واقیعیش، تاكو ئەو تێگەیشتنە ڕاست و دروستەی كە لە تێوەڕامانی وەحیی بەرهەمی هێناوە، بە شێوەیەكی ڕاست و دروست بەسەر واقیعدا بیچەسپێنێ، كە ئەوەش دەبێتە بەندایەتیی بۆ خواو، سەرەنجام لە

ئەنجامی ئەو بەندایەتییەدا بۆ خوا، هەم ژیانێکی پاك و چاکی دنیایی دەست دەکەوێ و، هەم سەرفرازیی دوارۆژیش).

بۆیە لێرەوە وەك برایەکی دڵسۆزی خۆتان ئامۆژگارییتان دەکەم: بەردەوام لە بەکارهێنانی ئەو وشەو زاراوانەدا ورد بن، مەرج نیە هەر شتێك لە کتێباندا هاتبوو، هەر تەعبیرێك خەڵك بەکاری هێنا، بەکاری بهێنی، چونکە وەك گوتم: زاراوەی {فیکری ئیسلامیی} ئیشکالێکی گەورەی تێدایە، چونکە ئەگەر بڵێی: {فیکری ئیسلامیی} بریتیە لە: هەرچی مسوڵمانان بەرهەمیان هێناوە، دوور لەوەحیی، یان جیا لەوەحیی، کوا هەموو جارێ ئەو قەیدەی دەخەنە سەرێ، ئەو قەیدەی ناخەنە سەرێ، بڵێن: جیا لە وەحیی، ئاشکراشە کە وەحیی، عەقڵی بەشەر بەرهەمی نەهێناوە، هەڵبەتە عەلمانییەکان بۆیە جار جار ئەو وشەیە بەکار دەهێنن، چونکە ئەوان پێیان وایە، قورئانی بە پێز، هەر بەرهەمێکی بەشەرییەو موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بۆ خۆی گوتوویەتی و، سوننەتەکەشی هەر بەهەمان شێوە، واتە: هەرچی هەیە، هی خۆیەتی، کەواتە: دەبێ وریا بین ئەوان کە ئەو وشەیە بەکار دەهێنن، مەبەستیان ئەوەیە کە ئیسلام هەمووی بەرهەمی فیکری بەشەرە، بەڵام بەتەئکید ئەو قسەیە کوفرە، چونکە وەك دوایی لە بەشی سێیەم {سەرچاوەکانی فیکری ئیسلامیی}دا، باسی دەکەین، بناغەی بیکردنەوەی ئیسلامیی بریتیە لە وەحیی، وەحییش هیچ پەیوەندیی بە مرۆڤەوە نیە، نە پەیوەندیی بە موحەممەدەوە (صلى الله عليه وسلم)، نە بە هیچ کام لە پێغەمبەرانەوە عليهم السلام نەبووە، بەڵکو لەدەرەوەی خۆیان بۆیان هاتوە، بەڵکو وەحیی زانیاریی خوای پەروەردگارە، ئەوەی کە عەقڵی بەشەر دەوری تێدا دەبینێ، تێگەیشتنیەتی لە وەحیی، بەشێوەیەکی ڕاست و دروست، کە ئەویش لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە دەگۆڕێ و، تێگەیشتنیەتی لە واقیع، کەئەو تێگەیشتنەی دەربارەی وەحیی هەیەتی، بەسەر واقیعی تایبەتی خۆیدا بیچەسپێنێ و ژیانی خۆی پێ ڕێك بخات، ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی.




## سەرنجدانێکی مێژوویی
## لە بیرکردنەوەی ئیسلامیی
## لەنێوان وەحیی و واقیعدا

# دەستپێك

**خوێنەرانی بەڕێز!**

ئێمە لە بەشی پێشوودا پێناسەی (فكر)مان كرد، هەم لە ڕووی زمانەوانیی و، هەم لەڕووی زاراوەییەوە، پاشان پێناسەی {فیكری ئیسلامیی}مان كردو، حیكمەت و هۆكاری ئەوەشمان خستەڕوو كە بۆچی بەكارهێنانی وشەی: {فیكری ئیسلامیی}م پێ باش نیە؟، وەك بەشێك لەزانایانی هاوچەرخیش بۆچوونیان وایە، چونكە ئەم زاراوەیە زاراوەیەكی تازەیە، زانایانی پێشێ قسەیان لەسەر نەكردوە.

چونكە وەك گوتمان: ئەو كاتە فیكر هەر ئیسلامیی بووەو پێویست نەبووە، قەیدی ئیسلامیی بخەنە سەر، بەڵام ئێستا كە دەگوترێ: {فیكری ئیسلامیی}، كە وەك گوتم: بەتایبەت خەڵكی نائیسلامیی ئەو وشەیە بەكار دەهێنن و مەبەستیان پێی كۆی ئەو بەرهەمەیە كە مسوڵمانان لەبەر دەستیانە، كە ئەوەش (وەحیی) تێدایە: ئایەتەكانی قوڕئان و، فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا ئەگەر بەهەمووی بگوترێ: {فیكری ئیسلامیی}، فیكریش دیارە ئەگەری پێكان و بەهەڵە داچوونی هەیە، ئنجا بەتەئكید هەركەسێ پێی وابێ: خوا عز وجل لە شتێكدا نەیپێكاوە، یان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە شتێكدا كە بەناوی خواوە هەواڵی پێداوە، وەك دین و، نەشیپێكاوە، پێی كافر دەبێ، بۆیە بۆ خۆپاراستن لەو ئیشكالە، من پێم وایە ئەگەر بگوترێ: {بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا} بەلای كەمەوە: ڕاستترو بێ ئیشكال ترە.

هەڵبەتە من لە چوار باسی سەرەكییدا ئەو سەرنجدانە مێژووییەم هێناوە:




## سروشتی سادەو خوارسكی ئەو كۆمەڵگایەی پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" بنیاتی نا

بەڕێزان! هەر كۆمەڵگایەك هەتا سادەتر بێ، ئەو پرس و بابەتە فیكرییانەی كە لەنێویشیدا سەر هەڵدەدەن، سادەو ساكارترو بێ گرێ و گۆڵتر دەبن، كۆمەڵگای ئیسلامیی یەكەم كە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) بەدەستی موبارەكی خۆی بەردی بناغەی داناو، خشت خشت هەڵیچنی، هەتا كۆمەڵگایەكە تەواو بوو، پاشان قەوارەیەكی سیاسی لەهەناو هاتە دەر، ئنجا كۆمەڵگای ئیسلامیی یەكەم، لەبەر ئەوەی كەرەستە خاوەكەی گەلی عەرەب بوون، گەلی عەرەبیش ئەو كاتە گەلێكی یەكجار سادە بوون و دوور لە ژیانی شارستانیی بوون و بەزۆریی بیابان نشین بوون، ئەوانەش كە شارنشینیش بوون وەك شارەكانی: مەدینەو مەككەو تائیف و شارەكانی دی، بەبەراورد لەگەڵ شارەكانی ڕۆم و فارس و میصرو حەبەشەو هیندو چیندا، هەر سادە بوون و ژیانێكی سادەیان هەبوو، بۆیە هزرو بیرێكی سادەشیان هەبوو، چ لە ڕووی سیاسی، چ لەڕووی ئابووریی، چ لەڕووی كۆمەڵایەتیی، چ لەڕووی كلتوورییەوەوە، كۆمەڵگایەكەیان بەمانای وشە، كۆمەڵگایەكی سادەو ساكار بوو.

ئنجا ئەو ئیسلامە گەورەو مەزنە كە لە قورئاندا بەرجەستەیە، پاشان لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، كە ئەویش هەر بریتیە لە بەرجەستە كردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع، هەرچەندە ئیسلام بۆ هەموو بەشەر هاتوە، بەڵام ئەو ئیسلامە بكەوێتە دەستی هەر كۆمەڵگایەك، ئەو كۆمەڵگایە ڕەنگی خۆی لێ دەدا، بەڵێ ئیسلام دەگونجێ ڕاقیترین و بەرەو پێش چووترین كۆمەڵگای پێ بەڕێوە بچێ، بەڵام دەشگونجێ سادەترین كۆمەڵگاشی پێ بەڕێوە بچێ، كۆمەڵگای ئەو كاتە كۆمەڵگایەكی سادەو ساكار بوو، بۆیە بەشێوەیەكی فیترییی و خوا ڕسكانەو سادەو ساكاریش ئەو ئیسلامەیان وەرگرت، مەبەستم ئەوەیە زۆر وردەكاریی و ئاڵۆزییان تێدا نەكردو كۆمەڵگای خۆیان پێ بەڕێوە بردو، لە هەموو ڕووەكانەوە كێشەو گرفتەكانی خۆیانیان پێ چارەسەر دەكرد، هەر بۆیەش: كە سەرنجی ڕەوتی فیكرو بیر دەدەین لە ئیسلامدا، تەماشا دەكەین لە سەرەتاوە ئەو كێشە فیكرییانە كە لە دواییدا پەیدا بوون، ئەو كاتە نەبوون، چونكە كۆمەڵگاكە بەخۆی سادە بوو، دیارە كۆمەڵگایەكی سادەش بیرێكی سادەی دەبێ، سادە بەو مانایە نا كە ناڕاستە، چونكە جاری وا هەیە سادە بەكاردێ، بەمانای سەركێڵ و سەتحیی، لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە، بەڵكو سادە بەو واتایە كە دوور بوو لە ئاڵۆزیی و دوور بوو لەوەی كە لە ئەنجامی بەرەو پێش چوونی كۆمەڵگاو شارستانیی پەیدا دەبێ.




## ئیمتیازەکانی جیلی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا، خوا لێیان ڕازی بێ

هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێ، سێ سیفەتیان هەبوون، لە هی جیلەکانی دیکە جیا بوون:

### ١) بەئاسانیی تێگەیشتنیان لە قورئان:

قورئان کە وەحیی خوایە، بەزمانی خۆیان بۆیان دابەزیبوو، وەك خوا دەفەرمویّ:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيًّا.. ﴿٢﴾ ﴾ یوسف.

قورئان بەو زمانە بوو کە خۆیان ئاخاوتنیان پێ دەکرد، زمانەکەشیان هیچ خڵتەو خاڵی عوجمەی[1] تێکەڵ نەبووبوو، چونکە دواییش لە شارەکانی کوفەو بەصرەو میصرو وڵاتانی دیکەش هەر زمانی عەرەبی هەبوو، بەڵام خڵتەی عوجمەی تێکەڵ بووبوو.

---

(١) واتە غەیرە عەرەبی.

٢) خاوەنی فیترەتێكی ساغ و سادەبوون:

هاوەڵانی بەڕێز، خاوەنی فیترەت و خوا ڕسكێكی پاك بوون، كە نەكەوتبووە ژێر كاریگەریی شارستانییەتیەكان و فەلسەفەكانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، دیارە كۆمەڵگایەكەشیان شوێنەكەی لاپەڕ كەوتبوو، خۆشیان فیترەتێكی سادەو مەعدەنێكی پاكیان هەبوو، بەڵێ هەڵەیان هەبوو لەڕووی فیكریی و عەقیدەیی، لەڕووی ڕەوشت و ئاكارەوە، لەڕووی سیاسییەوە: ئەوەی بەهێز بوو بێ هێزی دەخواردو، لەڕووی چینایەتییەوە قڕیی و پڕیی، هەبوو، بەڵام ئەوە تێك ناگیرێ لەگەڵ ئەوەدا كە فیترەتێكی پاك و دەستكاریی نەكراویان هەبوو، وەك كەرەستەیەكی خاو بوو، بۆچی؟ چونكە جارێ كاریگەرییەكانی شارستانیەتی و فەلسەفەو بەرەو پێش چوونی كۆمەڵگا، نەكەتبووە سەر فیترەت و سروشتیان.

٣) ڕاستەوخۆ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بوون:

هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، خوا لێیان ڕازی بێ، ڕاستەوخۆ لە خزمەتی پێغەمبەردا بوون، وە لە خزمەت دابەزینی وەحییدا بوون، با وێنەیەكتان بۆ بێنمەوە، تاكو بەبەرجەستە كراویی ببینن:

دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ الْأَصْوَاتَ لَقَدْ جَاءَتْ الْمُجَادِلَةُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُكَلِّمُهُ وَأَنَا فِي نَاحِيَةِ الْبَيْتِ مَا أَسْمَعُ مَا تَقُولُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا...}
أخرجه أحمد برقم: (٢٤٢٤١)، والبخاري تعليقاً.

واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی كە هەموو دەنگەكان دەبیستێ، من لەماڵێ بووم كە (خەولەی كچی ثعلبە) هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، سكاڵای خۆی لە لای پێغەمبەری خوا كرد، لەدەست مێردەكەی، {مێردەكەی ناوی (ئەوسی كوڕی صامیت بووە)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) هاوسەرەكەم تاكو گەنج بووم، منداڵمان بوون، ئێستا كە كەوتوومەتە

تەمەنەوە (ظهار)[1]ی لێ كردووم، منیش تەمەنم لەگەڵ ئەو بەڕێ كردوە، سكاڵای خۆی لە لای پێغەمبەری خوا كرد} من لە ژوورەكەی ئەودیو بووم كە گوێم لێی نەبوو چی دەڵێ؟! پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (حُرِّمتِ عليه)، تازە لێی قەدەغە بووی، چونكە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە هەر مەسەلەیەك وەحیی لەسەر نەهاتبێ، بە عورف و باوی كۆمەڵگایەكەی خۆی كاری كردوە، مەگەر شتێك كە زانیبێتی لەگەڵ دەقێكی شەریعەتدا تێك دەگیرێ، ئەوە ڕاوەستاوە بزانێ: حوكمەكەی چییە؟، ئەوی دیكە بە عورف و باوی كۆمەڵگایەكەی خۆی كاری كردوەو لە عورفی عەرەبی ئەوكاتدا (ظهار) وەك تەلاق وابووە، دەڵێ: دوو سێ جار ئافرەتەكە لێی دووبارە كردەوە، ئەویش هەر فەرمووی: (لێی قەدەغە كراوی)، دایكمان عائیشە دەڵێ: من هەر لەوێ بووم، بەڵام چاك گوێم لە قسەكانی نەدەبوو، بەڵام خوای بیسەر لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە گوێی لە قسەكان و سكاڵای ئەو ئافرەتەبوو و سەرەتای سووڕەتی (المجادِلة)ی ناردە خوار، كە دەفەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔى وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ ٱلْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ﴿٣﴾ ﴾ المجادلة.

واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، بەڕاستی خوا قسەی ئەو ئافرەتەی بیست كە لەبارەی هاوسەرەكەیەوە، مشت و مڕی لەگەڵ تۆدا دەكردو، خوا

(١) ئەوەیە كە پیاو بە هاوسەری خۆی بڵێ: (أنتِ علی كظهري أمي)، واتە: تۆ بۆ من وەك پشتی دایكم وای، ئەگەر هەر پیاوێك وای گوتبایە، ئەوە خێزانەكەی لێ قەدەغە دەبوو وەك تەڵاق.

گفت و گۆی نێوانتانی بیست، بێگومان خوا بیسەری بینەرە، ئەوانەی کە (ظهار) لە خێزانەکانیان دەکەن، بەو قسەیە نابنە دایکیان، دایکیان هەر ئەوانەن کە ئەوانیان هێناوەتە دنیا.

دواییش خوای کارزان کەفارەتی (ظهار) دادەنیٚ،کە یان ئازاد کردنی کۆیلەیەکە، کە ئەو کاتە هەبوون، یاخود دوو مانگ بەڕۆژوو بوونە، یاخود نانی شەست هەژارە، (پێدانی خواردن بە شەست هەژار).

مەبەستم ئەوەیە: گرفتێك هاتۆتە پێش بۆ ئەو ئافرەتە، یەکسەر چووە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش پێشیٚ بەپێی عورف و نەریتی کۆمەڵگایەکەی قسەی کردوە، دوایی خوا سبحانە و تعالى لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە، کێشەکەی چارەسەر کردوە.

ئنجا ئەو ڕاستەوخۆ لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا بوونەو، لە خزمەت وەحیی خوا دابوون، بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکان و، چارەسەر کردنی گرفتەکان وای کردوە، کە پێویست نەکات هاوەڵان زۆر بیر بکەنەوە، واتە: سەریان لەوە نەوەستاوە زۆر بیر لە شتەکان بکەنەوە، ئەریٚ ئەو شتە حەڵاڵە، یان حەرامە؟ بەڵکو پرسیویانە: داخۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چی دەفەرمویٚ، لەوەدا چی بکەن و چۆن بکەن؟ تەنها تەماشای سوورەتی (البقرة) بکەن، لە هەشت شوێندا ئەمە دووبارە بۆتەوە:

١- خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ...﴿١٨٦﴾ ﴾ البقرة.

ئەمە لەو بارەوەبووە کە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بیٚ گوتیان: {أَقَرِيبٌ رَبُّنا فَنُنَاجِيهِ، أَمْ بَعِيدٌ فَنُنَادِيهِ؟}، واتە: ئایا پەروەردگارمان نزیکە، ڕازو نیازی لەگەڵدا بکەین، لەبەر خۆمانەوە بەدەنگی کپ، یاخود دوورەو بانگی بکەین؟! خوای کاربەجیٚ وەڵامی دایەوە، فەرمووی:

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ...﴿١٨٦﴾ ﴾ البقرة.

واتە: وە ئەگەر بەندەكانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێ كردی، ئەوە بەدڵنیاییەوە من نزیكم[1].

٢- هەر لەسوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٨٩)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرمویێ:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ۗ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ ﴾ البقرة.

كۆمەڵگای هاوەڵان -وەك گوتم- كۆمەڵگەیەكی فیترییی و خوا ڕسك بوو، تەماشا دەكەن مانگ یەك شەوەیەو دەبێتە دوو شەوەو سێ شەوە، تاكو پازدە دەڕوا، لەدوای شازدەوە بچووك دەبێتەوە تاكو دەبێتەوە بە دەمە داسێك، وەك پێشێ، بەڵام پێشێ لەلایەكەوە، دوایی لەلایەكی دیكەوە، ئنجا گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە بۆچی وایە؟ (يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ) (ٱلْأَهِلَّةِ) كۆی (هلال)ە، واتە: مانگی یەك شەوەو دوو شەوەو، هتد، پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی مانگ، ئەوە چۆنە؟، بڵێ: ئەوە بۆ دیاریی كردنی كاتە بۆ خەڵك، بۆ ئەوەی كارو بارەكانیانی پێ ڕایی بكەن، لە كۆمەڵگەی عەرەبییدا زیاتر بە مانگ كاریان دەكرد، بۆدیاریكردنی كاتی حەج و عەمرەو ئەوانە[2].

ئەگەر خوا فەرمووبای: مانگ بەدەوری زەویدا دەخولێتەوەو، پێشێ هەندێكی دیار دەكەوێ و دوایی هەندێكی دیكەی و، تیشكی ڕۆژ كە لێی دەدا، لە بەشێكی بچووكی دەدات و دەبێتە یەك شەوەو دوو شەوە، بەم وردەكارییە، هەر تێی نەدەگەیشتن، بەڵام خوای پەروەردگار ئەو حیكمەتەی كە مانگ و خۆری بۆ خوڵقاندوون، كە بریتییە لەوەی خەڵك حیساب و كیتاب بزانێ، بەوە وەڵامیان دەداتەوە.

---

(١) بڕوانە: المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص١٣٣، كە لەوبارەوە فەرموودەیەكی هێناوە كە (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص ١٣٨، (قال العوفي عن ابن عباس: سأل الناسُ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم عن الأَهِلَّة، فنزلت هذه الآية: (يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ).

٣- هەر لە (البقرة) لە ئایەتی (٢١٥)دا دەفەرمویٚ:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾ ﴾ البقرة.

پرسیاریان کردوە: ئەی پێغەمبەری خوا! خوای کاربەجیٚ پیٚمان دەفەرمویٚ: ماڵ ببەخشن، چی ببەخشین و بەکیٚی ببەخشین؟

خوای پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوە: (پرسیارت لیٚ دەکەن: چی ببەخشین؟ بڵیٚ: هەرسامانیٚکیان بەخشی، با بۆ باب و دایك و خزمان و هەتیوان و نەداران و ڕیٚبوار بیٚ...) ئیدی وەڵامیان دەداتەوە ماڵ و سامانەکانیان بە کیٚ ببەخشن؟[1].

٤- هەر لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢١٧)دا دەفەرمویٚ:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِۗ .. ﴿٢١٧﴾ ﴾.

پرسیارت لیٚ دەکەن دەربارەی مانگی حەڕام، جەنگ تێیدا چۆنەو چۆن نیە؟ ئنجا وەڵامیان دەداتەوە...[2].

٥- هەر لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢١٩)دا دەفەرمویٚ:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَاۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ ﴾.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ١٥٦.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ١٥٦، ١٥٧، ١٥٨.

واتە: دەربارەی شەڕاب و قومار پرسیارت لێ دەكەن، ئنجا وەڵامیان دەداتەوە...[1].

٦- هەر لەسوورەتی (البقرة)و هەمان ئایەتدا دەفەرمویٚ: ﴿... وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾﴾.

هی پێشیٚ پرسیاریان كرد: بەكێی ببەخشن، ئنجا پرسیاریان كرد، چی ببەخشن؟ بڵێ: ئەوەی كە لێتان زیادە، ئەگەر شتێك پەكت لەسەری كەوتبیٚ، لەسەرت پێویست نییە بیبەخشی، مەگەر خەڵك بەسەر خۆتدا هەڵبژێری (إيثار) بكەی، كە ئەوەش پلەیەكە هەموو كەس نایگاتیٚ[2].

٧- هەر لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٢٠)دا دەفەرمویٚ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ ..﴿٢٢٠﴾﴾.

ئەوانەی هەتیویان لەماڵدا بەخێو دەكردن، گوتیان: چۆنیان مامەڵەیان لەگەڵدا بكەین؟ خوا فەرمووی: چاكسازیی بۆ ئەوان بكەن باشە[3].

٨- هەر لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٢٢)دا دەفەرمویٚ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾.

واتە: پرسیارت لێ دەكەن: ئافرەت كاتیٚ دەكەوێتە بێنوێژیی، چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بكەن؟ خواش بۆی ڕوون كردنەوە[4].

ئەمە بەس لە سوورەتی (البقرة)داو، زۆر شوێنی دیكەش هەن لە قورئاندا، كە بەم شێوەیە دیار نین، ئەوانەی كە دیارە شایانی باس بوون، باسی كردوون.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ١٥٨، ١٥٩.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ١٥٩.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ١٥٩، ١٦٠.

(٤) هەمان سەرچاوە، ص ١٦١، ١٦٢، ١٦٣.

٩-تەنانەت هێندەیان پرسیار كردوە بۆ چارەسەر كردنی كێشەو گرفتە هەنووكەییەكانیان كە هاتوونە پێشیان، لە سووڕەتی (المائدة)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٠١ قَدۡ سَأَلَهَا قَوۡمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ ثُمَّ أَصۡبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ١٠٢ ﴾المائدة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە هەندێ شت پرسیار مەكەن، كە ئەگەر بۆتان دەركەوێ، بۆتان خراپ بێ.

**بۆ هۆی هاتنە خوارەوەكەی: دوو ڕیوایەت هەن:**

**یەكەم:** كابرایەك بەوە تۆمەتبار دەكرا كە كوڕی بابی خۆی نیە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) بابم كێیە؟!

فەرمووی: بابت (حُذافة)یە، دایە پاڵ بابی خۆی، واتە: دڵنیا بوو كە نەسەبەكەی ڕاستەو ئەو تۆمەتانەی دەگوترێن، ڕاست نین[١].

**دووەم:** لە ڕیوایەتێكی دیكەدا هاتوە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا حەج كردن هەموو ساڵێك فەڕزە؟ ئەویش بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: ئەگەر گوتبام: بەڵێ، فەڕز دەبوو، ئنجا ئەگەر فەڕزیش بووبایە نەتاندەتوانی[٢].

**خوێنەری بەڕێز!**

كەواتە: ئەو سێ سیفەتە: (١. خاوەن زمانێكی پاراو بوون و بەسێنایی لەقورئان تێگەیشتن. ٢. خاوەنی فیتڕەت و سروشتێكی پاك بوون، ٣. پاشان لە خزمەت پێغەمبەری خواو وەحیی دابوون) ئەمانە وایان كردوە، كە هاوەڵان خوای بەبەزەیی لێیان ڕازی بێ، زۆر پێویست نەكا عەقڵی خۆیان هەڵبگوشن و، وەڵام بۆ پرسیارەكانی خۆیان پەیدا بكەن.

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٤٠٤، گوتوویەتی: (أخرجاه (أي البخاري ومسلم) عن طريق سعيد.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ٤٠٥، گوتوویەتی: (رواه أحمد والترمذي وابن ماجة).




## ڕێنمایی كردنی ڕاستەوخۆی وەحیی بۆ كۆمەڵگا

لە سەرەتای تەمەنی ئیسلامدا هیچ تەوژمێكی فیكریی و سیاسی جێی سەرنج، لەنێو مسوڵماناندا سەری هەڵنەدا، مسوڵمانان تەنیا مسوڵمانان بوون و تەواو، كەس نەیبیستوە شیعەو، قەدەرییەو، مورجیئەو، موعتەزیلەو، خەواریج و ئەوانە هەبن، مسوڵمان بوون و تەواو، بۆچی؟

چونكە وەك گوتم: وەحیی وەڵامی هەموو پرسیارەكانی گەرماو گەرم دەدایەوەو پێویستی بەوە نەدەكرد خەڵكی عەقڵی خۆیان وەكار بخەن، ئنجا ئایا ئەگەر خەڵك عەقڵی خۆیان وەكار خست چی ڕوودەدا؟ عەقڵەكان جیا جیان، یەكێك وای تێدەگا، یەكێك جۆرێكی دیكەی تێدەگا، ڕای جیا جیا پەیدا دەبن، بەڵام ئەگەر خوا شتێكی فەرموو، تەواو، ئەگەر خوا شتیكی فەرموو، هەركەسێ بڕوای هەبێ، لەبەرانبەر قسەی خوادا، قسەی نیەو، لەبەرانبەر فەرمایشتی خواو پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم)، كەس ڕێگا بەخۆی دەدا قسەی هەبێ؟!

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ الأحزاب.

واتە: هیچ پیاوێكی بڕوادارو ئافرەتێكی بڕوادار بۆیان نیە ئەگەر خواو پێغەمبەر بڕیارێكیان دا مافی سەرپشك بوون بەخۆیان بدەن، {ئەو بڕیارە هەڵبژێرن و پێوەی پابەند بن، یان پێوەی پابەند نەبن؟}. هەركەس سەرپێچیی لەخواو پێغەمبەرەكەی بكات، بە دڵنیایی گومڕاییەكی ڕوون گومڕا بووە.

ئێستا یەكێ بۆی هەیە بڵێ: خەڵكێ هەیە شتێك كە خوا حەڵاڵی كردوە دەڵێ: دەبێ قەدەغە بێ، یان خوا قەدەغەی كردوە، دەڵێ: دەبێ ڕەوا بێ، دەڵێین: ئەوە ڕاستە، بەڵام كەسی وا مسوڵمان نیەو هەر كەسێ مسوڵمان بوو، وا ناڵێ، بەڵێ جاری وایە مسوڵمان ناتوانێ بە هەموو حەڵاڵ و حەڕامەكانی خواوە پابەند بێ، بەڵام دەبێ هەموویانی قبووڵ بن، ئنجا ئەگەر نەیتوانی خۆی لە حەڕامێك بپارێزێ، یان نەیتوانی شتێك كە پێویست (فرض)ە، ئەنجامی بدا، یان شتێك كە قەدەغە كراوە، خۆی لێ دوور بگرێ، ئەوە گوناهبارە، بەڵام ئەوەی خوا فەرموویەتی: قەدەغەیە، پێی قەدەغەیەو، وە ئەوەی خوا فەرموویەتی: حەڵاڵە، دەڵێ: حەڵاڵەو بەڕاستی دەزانم، بەڵام ناتوانم پێوەی پابەند بم، ئەوە هەر بە مسوڵمان دادەنرێ، بەڵام هەر كەسێك قسە بكا، دەربارەی حەڵاڵ و حەڕامی خوا، وەك ڕەفز كردن و بڕوا پێنەبوون، ئەوە دەبێ لەدەرەوەی بازنەی ئیسلام ئەو قسانە بكات، لەنێو بازنەی ئیسلامدا ڕێی نیە، بە دەقی ئایەت.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەش، ـ ئایەتی (٣٦)ی (الأحزاب) ـ ئەوەبوو كە (زینب)ی كچی (جحش) ـ كە كچە پووری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو، خێزانی (زید)ی كوڕی (حارثة) بوو خوا لێیان ڕازی بێ و بەیەكەوە نەدەگونجان، ئنجا وە هەر كاتی خۆیشی كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زەینەبی خواستبوو لە خزمانی، هەر بە ناڕەزایەتیی بوو، كاتێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: دەمەوێ زەینەب بخوازم بۆ زەیدی كوڕی (حارثة) كە كاتی خۆی زەید كۆیلەی پێغەمبەری خوا (صلی

الله عليه وسلم) بووەو ئازادی كردووەو دوایی تەبەننیی كردوە واتە: كردوویەتی بە كوڕی خۆی، كە ئەوەش عادەتێك بوو لەنێو عەرەبان، هەڵبەتە ئەوەش بەر لە پێغەمبەرایەتیی، كە پێیان دەگوت: زەیدی كوڕی موحەممەد، هەتا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە كە دەفەرمویّ:

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: موحەممەد بابی هیچ كام لە پیاوەكانتان نیە...

ئنجا كە ئەوان - واتە: زەینەب و عەبدوڵڵای برای - ناڕازی بوون، خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی ناردە خوار، واتە: مارە كردنی زەینەب لە زەید، فەرمانێكی خوایی بوو، هیچ بوارو دەرفەتێكیان نەبوو، ئیدی كە ئایەتەكە هاتە خوار، عەبدوڵڵاو زەینەب گوتیان: مادام خوا فەرموویەتی، قسەمان لەو بارەوە نیە[1].

ئنجا ئێمە مەبەستمان ئەوەیە لەسەرەتاوە كە قورئان دادەبەزی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ژێر ڕۆشنایی قورئانداو، وە جاری واش بوو بە ئیجتیهادی خۆی و، وە جاری واش بوو بە وەحییێكی تایبەت كە دادەبەزیە سەر دڵی موبارەكی، ئیشكال و پرسیاری مسوڵمانانی وەڵام دەدایەوە، ئەو ئیشكال و پرسیارانە، چ پەیوەندییان بەلایەنی بووناسییەوە بووایە، چ ئیمان و عەقیدە، چ عیبادەت و تەزكیە، چ بواری هەڵس و كەوتی كۆمەڵایەتیی، چ سیاسەت و ئیدارەو.. هتد، ئنجا لە حاڵێكی وادا مادام بڕیار نەهاتە نێو خەڵك، مانای وایە بڕیار تەنیا یەك بڕیارە، ئەویش ئەوەیە یان خوا فەرموویەتی، یان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

-----------------------------

(١) بڕوانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٣ ص ١١٦-١١٩، كە لەوبارەوە چەند دەقێكی لە (ابن عباس) و (مجاهد)ەوە هێناون، هەروەها بڕوانە: (صحيح البخاري): ٤٧٨٧، و(صحيح مسلم): ١٤٢٨



باسی
چوارەم

## سەرهەڵدانی کۆمەڵێك
## کارەسات و ڕووداوو گۆڕانکاریی

بەڵام دواتر چەند گۆڕانکارییەك هاتنە دی، هەروەها چەند ڕووداوێك کە هەندێکیان کارەساتی دڵ تەزێن بوون، کە ئەو گۆڕانکارییانەو ئەو کارەسات و ڕووداوانە، دەرهاویشتەی جۆراو جۆریان لیٚ کەوتنەوە، یەکێك لەو دەرهاویشتانە سەرهەڵدانی چەند تەوژمێکی فیکریی جۆراو جۆرو زۆر بوو، کە دوایی ئاماژەیان پیٚ دەکەین، گرنگترین ئەو ڕووداوانەش ئەمانە بوون[1][2]:

---

(١) ئەوەی دیٚ، باشی سەرنج بدەن، چونکە لێرەوەیە عەقڵی ئیسلامیی بەگشتی دەکەوێتە بیر کردنەوەو، مسوڵمانان دەکەونە مشت و مڕو بیر کردنەوەو سەرنجدانی وەحیی و، هەرکامێکیان بۆچوونێکی بۆ پەیدا دەبیٚ و، دەکەونە نێو جەنگەڵ و جخوردی کۆمەڵێك بیرو ڕاو بۆچوون کە لە فارس و ڕۆم و یۆنان و هیندو چینەوە دێن، ئەوانیش دەبیٚ تەماشای ئەو فیکرو بیرو بۆچوونانە بکەن و، هەڵیان بسەنگێنن بە تەرازووی قورئان و سوننەت، کە لە ئەنجامی ئەوەشدا ڕا جیایی پەیدا دەبیٚ.

(٢) ئەو گۆڕانکاریی و ڕووداوانەش من دە (١٠) دانەم لیٚ دەستنیشان کردوون، هەڵبەتە

**گۆڕانکاریی یەکەم:** یەکەم لەو گۆڕانکارییانە کە بوونە سەرچاوەی پەیدا بوونی تەوژمە فیکرییەکان، بریتی بوو لە: (فراوان بوونی بازنەی بڵاوبوونەوەی ئیسلام)و، جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەکانی نێوان سوپای ئیسلام و سوپای فارس و ڕۆم و هێزەکان دیکە، کە دیارە ئەوەش مایەی فراوان بوون و جۆراو جۆر بوونی پێکهاتەکانی کۆمەڵگای ئیسلامیی بوو، جاران پێکهاتە سەرەکییەکەی کۆمەڵگای ئیسلامیی، تەنها نەتەوەی عەرەب بوون، کەسانی وەك: (صوهەیبی ڕۆمیی و، سەلمانی فارسیی و، بیلالی حەبەشەیی و، جابانی کوردیی) ئەمانە دانە دانە بوون، بەڵام زۆرینەی هەرە زۆر، نەتەوەی عەرەب بوون، بەڵام دوایی زۆر نەتەوەی دیکەو زۆر خاوەن دین و فیکرەی دیکە، هاتنە نێو بازنەی ئیسلامەوە.

**گۆڕانکاریی دووەم:** زۆرێك لە شوێنکەوتووەکانی ئایینەکانی جوولەکەیی (الیهودیة) و، گاورایەتیی (النصرانیة) و، مەجووسیی و، صابیئەو، بەرهەمییەکان و، بودائییەکان، زۆرێك لەوانە هاتنە نێو ئیسلامەوە، بە ڕواڵەت یان بەڕاستی مسوڵمان بوون، هەشبوو دەهاتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامییەوە، کە مەرج نەبوو مسوڵمان بێ، نە بەڕواڵەت و نەبەڕاستی، بەڵکو هەر لەسەر دینی خۆی دەمایەوە، بەڵام دەسەڵاتی ئیسلامیی بۆتە سایەو سێبەری، کە دیارە لە حاڵەتێکی وادا، چ بە حوکمی سروشتی ئاسایی مرۆڤ، کە بیرو بڕوای خۆی هەر دەپارێزێ، کلتوورو عادەتی خۆی دەپارێزێ و پێی خۆشەو لەلای خۆشەویستە، بۆ وێنە: کەسێك پەنجا ساڵە فیکرەیەکی هەیە، پەنجا ساڵە عادەتێکی هەیە، ئەوە بەئاسانیی دەستی لێ بەرنادا.

---

دەگونجێ زۆر زیاتریش باس بکرێن، بەڵام ئەو دەیە، پێم وایە سەرەکییەکانیانن، دەمەوێ ئەوەش بڵێم: کە من لە ئامادە کردنی ئەم دەرسانەدا سوودم لە دەیان سەرچاوە بینیوە، بەڵام سەرەنجام دووبارە هەموویان لە بێژینگی عەقڵی خۆم دەدەمەوە، واتە: ئەوە نیە کە ئەم بابەتە هەمووی لە سەرچاوەیەکی دیاریی کراو وەرگیرابێ، بەڵێ جاری وا هەیە وشەیەك لەوێ، فیکرەیەك لەوێ، بەڵام دووبارە خۆم سەرنجیان دەدەمەوەو کەم و زیادیی تێدا دەکەم، هەندێکی دیکەشیان هەر حەقیقەتی مێژوویین و لە مێژووی ئیسلام دەرم هێناون.

چ بەمەبەستی پیلان گێڕیی و بڵاوکردنەوەی بەلبەلەی فیکریی لەنێو مسوڵمانانیشدا، قسەو باسی زۆر پەیدا بوون لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا، کە ئەمەش هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ، ناچا کرد، وەڵامی پرسیارو ئیشکالەکانیان بدەنەوە و، بە زمان و لۆژیکی خۆیان بیاندوێنن، کە ئەوە هەم بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس هاتۆتە پێش، هەم بۆ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود هاتۆتە پێش، هەم بۆ عەلی کوڕی ئەبو تالیب، خوا لێیان ڕازی بێ، هەروەها بۆ هاوەڵانی دیکەش، بە تایبەتی ئەوانەی لەو شوێنانە بوون کە پەیوەندیی و تەماسیان هەبوو لەگەڵ ئەو گەل و نەتەوانەی کە هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە.

**گۆڕانکاریی سێیەم:** لە ئەنجامی هاتنە نێوەوەی ملیۆنان کەس لەو وڵاتانەوە کە هاتوونەتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامیی، هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ ناچار بوون لە مەدینە بچنە دەرو، لە شارەکانی دیکەدا نیشتەجێ بن، ئنجا ئەگەر پێشێ، بۆ وێنە: نیو ملیۆن کەس، یان ملیۆنێ کەس، لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا هەبووە، ئەوەندە کەمتر یان زیاتر، بێگومان لە وڵاتانی فارس و ڕۆم و میصرو حەبەشەو هتددا، بە ملیۆنان بەشەر ژیاون، ئەوانە کە هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، بەتەئکید پێویستییان بە کەسانێك بووە ئاڕاستەیان بکەن، فێریان بکەن، شارەزایان بکەن، بۆیە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، ناچار بوون لە مەدینە بچنە دەرو لە شارەکانی دیکەدا نیشتەجێ بن.

هەڵبەتە پێویستە ئەوەش بزانرێ کە عومەر خوا لێی ڕازی بێ، خەلیفەی دووەم سیاسەتی وابوو، نەیدەهێشت سەرانی هاوەڵان، ئەوانەی کە خەڵکیان لەدەور کۆ دەبێتەوەو لێ دەئاڵێ، نەیدەهێشت بچنە دەر لە مەدینە، بەڵگەکەشی ئەوەبوو دەیگوت: ئێوە بارەکەتان خستۆتە سەر شانی من و دەشتانەوێ بڕۆن لێم دوور بکەونەوە، ئەدی ڕاوێژ بە کێ بکەم؟ دەبێ لەتەنیشتم بن! بەڵام عوسمان خوا لێی ڕازی بێ بە پێچەوانەی عومەرەوە بیری دەکردەوە، کە ڕەنگە فراوان بوونی دەوڵەتی ئیسلامییش ناچاری کردبێ، ئەو ڕێگای دا هاوەڵان بچنە دەر، ئەوانەی کە خەڵکیان لێ دەئاڵێ، بۆ وێنە: ئەگەر تەماشایەکی ئەو نەخشەیە بکەین، بزانین هاوەڵان چۆن پێیدا دابەش بوون، بەتایبەت ئەو هاوەڵانەی کە دیارن:

١)- هەركام لە سێ خەلیفە ڕاشیدەكان، ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان، هەروەها دایكمان عائیشەو، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر، خوا لێیان ڕازی بێ، لە شاری مەدینە بوون.

٢)- عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب و عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود، خوا لێیان ڕازی بێ، چوون بۆ شاری كووفە.

٣)- عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی، بێ لە شاری مەككە نیشتەجێ بوو.

٤)- ئەبو مووسای ئەشعەریی و ئەنەسی كوڕی مالیك، خوا لێیان ڕازی بێ، لە شاری بەصرە نیشتەجێ بوون.

٥)- عوبادەی كوڕی صامیت و، موعاذی كوڕی جەبەل، خوا لێیان ڕازی بێ، لە شام نیشتەجێ بوون.

٦)- عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص، خوا لێی ڕازی بێ، لە میصر نیشتەجێ بوو. هتد...

ئنجا هاوەڵان كە دەچنە ژینگەی جیا جیا، كۆمەڵگای جیا جیا، خاوەن كلتووری جیا جیا، خاوەن مێژووی جیاواز، خاوەن فیكرەو دینی جیاواز، كەواتە: پرسیاری جۆراو جۆریان دەبێ، وەك ئێستاش نەبووە بە ئاسانیی هۆكاری پەیوەندیی كردن هەبێ و، پەیوەندیی بە خەلیفەوە خوا لێی ڕازی بێ بكاو بڵێ: وەڵامی ئەو پرسیارە چۆنە؟ یان لە مەدینە كۆبوونەوەیەكی لەسەر بكەن، بزانین: داخۆ چۆن وەڵام بدەینەوە؟!

بەڵكو هەركامیان تەماشای قورئانی كردوە، ئنجا ئەگەر دەستی كەوتبێ و لێی تێگەیشتبێ باشە، ئەگەرنا بیری كردۆتەوە: ئایا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو بارەوە شتێكی فەرمووە؟ ئەگەرنا بۆخۆی بیری كردۆتەوەو ئیجتیهادی كردوەو وەڵامی داوەتەوە، دیارە لەئەنجامی ئەوەشدا تەوژمی فیكریی جیا جیا، مەزهەبی جیا جیا، ڕێبازی جیا جیا پەیدا دەبن، مەبەستم ئەوەیە

هەندێ کەس وا دەزانێ هاوەڵان هەر لەخۆوە یەکێکیان گوتوویەتی: وا دەبێ، ئەوی دیکەیان گوتوویەتی: نەخێر وا دەبێ! نەخێر هەر بەهەوای نەفس نەبوە، بەڵکو ئەو عادەت و نەریتەی کە عوبادەو موعاز لە شام بینیویانە، جیا بووە لەوەی کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لە میصر بینیویەتی، یان ئەوەی دیکە لە کووفە، یان لە وڵاتێکی دیکە بینراوە.

**گۆڕانکاریی چوارەم:** بڵاوبوونەوەی زەندەقەو ئیلحاد[1] و بڵاوبوونەوەی گومان و تۆمەت و دوودڵیی لەنێو مسوڵماناندا، لە لایەن شوێنکەوتووانی ئەو دینە پێشووانەوە، فیکرەکانی خۆیان بڵاو دەکردەوەو دژایەتی ئیسلامیان دەکرد، بۆ وێنە:

(الحسن البصري) نامەیەکی بۆ (عبدالملك بن مروان) یاخود بۆ (حجاج بن یوسف)، ناردوە، دیارە عەبدولمەلیك حوکمڕانی مسوڵمانان بووە و، حەججاج والی بووە لەبەر دەستی، یەکێ لەو دووانە دەبیستنەوە کە حەسەنی بەصڕایی باسی قەدەر دەکا، نامەیەکی بۆ دەنووسێ گلەیی لێ دەکا: ئەوە چییە بۆچی باسی قەدەر دەکەی؟، حەسەنی بەصڕایی ڕەحمەتی خوای لێبێ لە درێژەی نامەکەیدا، ئاوا وەڵام دەداتەوە: (...ولم يكن أحد من السلف يذكر ذلك، ولا يجادل فيه لأنه كانوا على أمر واحدٍ، وإنما أحدثنا الكلام فيه لما أَحْدَثَ الناسُ من النكرة له، فلما أحدث المُحْدِثون في دينهم ما أحدثوه، أحدث الله للمتمسِّكين لكتابه ما يُبْطلون به المُحْدَثاتِ وَيُحْذَرونَ مِنَ المُهلكات)[2].

دیارە ئەو گلەیی لێ دەکات، کە بۆچی باسی قەدەر دەکەی؟ حەسەنی بەصڕاییش بەو شێوەیە وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: (هیچ کام لە پێشووان باسی قەدەریان نەکردوە، کەس لەو بارەوە مشت و مڕی نەکردوە، چونکە هەموویان

---

(١) زەندەقە، زەندیق: بە کەسێکیان گوتوە کە خۆی بە مسوڵمان زانیبێ، بەڵام لە ئەصڵدا بێ بڕوا بووبێ، یانی: خاوەن حاڵەتێکی نیفاق، بەڵام بانگەشەشیان کردوە بۆ فیکرەکانی خۆیان.

(٢) المنية والأمل، لابن المرتضى، ص ١٢-١٣، عن كتاب (عوامل وأهداف نشأة علم الكلام في الإسلام) يحيى هاشم حسن فرغل.

لەسەر یەك قسە بوون، کە هیچ شتێك نیە بەقەدەری خوا نەبێ، بەڵام ئێمە بۆیە لەو بارەوە قسە دەکەین، چونکە خەڵکێ هەیە نکوولیی دەکا لەوەی هەموو شتێك بەقەدەری خوا بێ(١)، ئنجا کاتێ پەیدا کەران شتێکیان پەیدا کرد، لە دینی خوادا، خوای پەروەردگاریش کەسانێك کە پابەندن بە کتێبەکەیەوە، پەیدای کردن بۆ ئەوەی شتە پەیدا کراوەکانی ئەوان هەڵبوەشێننەوەو، بۆ ئەوەی ئەوانیش وریا بن لەوەی کە نکوولی لێ دەکەن).

**گۆڕانکاریی پێنجەم:** کوژرانی عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، خەلیفەی سێیەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، کە لە ساڵی (٣٥)کۆچییدا شەهید کرا، لە ماڵەکەی خۆیدا، ئەویش دوای ئەوەبوو کە لە شەش ساڵی دووەمی حوکمڕانییەکەیدا مشت و مڕ لەسەر هەندێ لە هەڵوێستەکانی پەیدا بوو، دەستی پیسیش ڕۆڵی خۆی بینی، کە من لێرەدا نامەوێ بچمە نێو ئەو وردەکارییانەوە، هەندێ شتی هەبوو کە خەڵك تێبینی لەسەری هەبوو، بەڵام بەتەئکید ئەو تێبینی و سەرنج و ڕەخنانە، بایی ئەوە نەبوون، کە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، بەڵام دەستی پیسیش دەوری تێدا بینی، سەرەنجام عوسمان خوا لێی ڕازی بێ شەهید بوو، ئەمەش شتێکی لێ کەوتەوە، کە دوایی زانایان ناویان نا: (الفتنة الکبری)، ئاژاوەی هەرە گەورە، لەوێوە دەرگای خوێن ڕێژیی و کوشتار لەنێو مسوڵماناندا کرایەوە و، هەتا ئەم کاتەی ئێستاش، ئەو دەرگایە پێوە نەدراوەو هەر بەردەوامە.

---

(١) دوایی باسی دەکەم ئەوە قەدەرییەکان بوون وایان دەگوت، دواییش موعتەزیلە بوونە میراتگری قەدەرییەکان، دەیانگوت: ئەگەر بڵێین: زاڵم زوڵم دەکات بەقەدەری خوا، یان کافر کافر دەبێ بەقەدەری خوا، ئەو کاتە، ئەو ستەمکارە قسەی دەبێ و دەڵێ: جا بەقەدەری خوا من وا دەکەم، یان بەقەدەری خوا من کافر بوومە، کەواتە: خوا سزام نادات ئێوەش بۆتان نیە گلەییم لێ بکەن، جا ئەوە بەنی ئومەییە بەزۆری ئەمەیان بڵاو دەکردەوە، ئومەوییەکان ئەو فیکرەیان زۆر بڵاو دەکردەوە، یەکێکیان کە پێی دەگوترا: چۆن وا حوکم دەکەی و سەروەت و سامانی مسوڵمانان قۆرخ دەکەی؟ دەیگوت: ئەوە بەقەدەریی خوایە! قەدەریی و موعتەزیلەکانیش بە حیسابی خۆیان بەرگریی دەکەن لە دادگەریی خوا، گوتیان: مرۆڤ هەرچی دەیکا بۆخۆی دەیکا و، خواش پێشتر نەیزانیوە و، مرۆڤ بۆخۆی بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی.

**گۆڕانکاریی شەشەم:** جەنگ و کوشتاری نێوان عەلی خوا لێی ڕازی بێ و، موعاویە، کە پێنج ساڵی خایاند، لە ساڵی (٣٥ تاکو٤٠)ك، کە عەلی تێیدا شەهید کرا، بەدەستی یەکێ لە خەواریج، بەناوی عبدالرحمن کوڕی (ملجم)، ئەویش مشت و مڕی زۆری پەیدا کرد، جارێ هەر لەدوای کوژرانی عوسمانەوە خوا لێی ڕازی بێ، خەڵك پرسیاری بۆ دروست بوو: ئایا چۆن مسوڵمانان دەستیان چووە خوێنی خەلیفەی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، دەستیان چووە خوێنی کەسێك، کە دوو کچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) یەك لەدوای یەك هاوسەری بوون، (رقیة) و (أم کلثوم)؟! دوایی کەجەنگی (صفین)ی نێوان عەلی و موعاویە ڕوویدا، کە خەڵکێکی زۆری تێدا کوژرا، پاشان شەڕی (جمل) کە دیسان خەڵکێکی زۆری تێدا کوژرا، بەهۆی ئەوانەوە خەڵك پرسیاری بۆ دروست بوو: ئایا کەسێك کە مسوڵمانێك دەکوژێ، ئیماندار ماوە، یان ئیمانەکەی لەدەست داوە؟ لەوێوە بیرۆکەی خەواریج پەیدا بوو، کە دوایی باسی دەکەین و، هەر لەوێوە بیرۆکەی (إرجاء)یش پەیدا بوو، بۆ بەرگریی کردن لەوانەی تاوانیان کردوە، بۆ ئەوەی لە بازنەی ئیمان نەچنە دەر، دەیانگوت: لەگەڵ ئیماندا گوناح زەرەری نیە، وەك چۆن لەگەڵ کوفردا، تاعەت قازانجی نیە.

**گۆڕانکاریی حەوتەم:** سەرهەڵدانی خەواریج و، جیا بوونەوەیان لە سوپای خەلیفەی چوارەم عەلی خوا لێی ڕازی بێ، وە پاشان جەنگی (نەهرەوان) لەساڵ (٣٧)ی کۆچییدا، کە ئەویش دیسان بەڵایەکی دیکە بوو.

**گۆڕانکاریی هەشتەم:** بەیعەت وەرگرتنی موعاویە بۆ یەزیدی کوڕی لە دوای خۆی و، نارەزایەتیی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، بە گشتی لەو بارەوە، بەتایبەت ئەو پێنج کەڵە پیاوە:

١- حوسەینی کوڕی عەلی.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

٣- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس.

٤- عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر.

٥- عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر.

خوا لێیان ڕازی بێ، ئەویش لەساڵی (٥٦)ی کۆچییدا، واتە: نزیکەی (٤ تا ٥) ساڵ پێش ئەوەی موعاویە بمرێ، بەزۆر بەیعەتی بۆ یەزیدی کوڕی وەرگرت، ئەوەش دیسان مشتۆ مڕو کێشەیەکی زۆری لەنێو مسوڵمانانندا پەیدا کرد.

**گۆڕانکاریی نۆیەم:** هەڵسانی یەزید بە دوو کاری ناڕەواو قێزەون، لەسەرەتاو کۆتایی حوکمڕانییەکەیدا:

١- شەهید کردنی حوسەینی کوڕی عەلی خوا لێی ڕازی بێ، نەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و، ژمارەیەك لە خزمەکانی لە (کەربەلا) لە ساڵی (٦١)ی کۆچییدا.

٢- ئەتك کردنی شاری مەدینە و، کوشتنی خەڵکێکی زۆر، لە ساڵی (٦٣)ی کۆچییدا، ئەو کارەساتەش بە کارەساتی (الحَرّة) کە شوێنێکە لە دەرەوەی مەدینە، دەناسرێ، سوپاکەی یەزید، شتی دیکەی زۆر خراپیان ئەنجامدا، لەو بارەوە (الذهبي) کە مێژوو نووسێکی زۆر موعتەبەری مسوڵمانانە، دەربارەی یەزیدو ئەو دوو کارەی دەڵێ: (قلت: كان قوياً شجاعاً، ذا رأي وحزم، وفطنة، وفصاحة، وله شعر جيِّد، وكان ناصِبِيّاً، فَظّاً، غليظاً، جِلْفاً، يتناول المُسْكِر، ويفعل المُنْكَر، فتح دولته بمقتل الحسين، واختتمها بواقعة الحرة، فمقته الناس، ولم يبارك في عمره، وعن محمد بن أحمد بن مسمع قال: سَكَرَ يزيدُ، فقام يرقص، فسقط على رأسه، فانشقَّ وبدا دِماغُهُ)[1]، واتە: گوتم: یەزید پیاوێکی بەهێز بوو، ئازا بوو، عاقڵ بوو، خاوەن بڕیار بوو، زۆر هۆشیار بوو، زۆر ڕەوان بێژ بوو، شیعرێکی زۆر باشیشی هەیە، بەڵام: ناصیبیی بووە[2]، زۆر قسە ڕەق و زۆر دڵ ڕەق و زۆر وشك بوو، ماددە سەرخۆشکەرەکانی بەکار دەهێنان و کردەوەی خراپیشی دەکردن، حوکمڕانییەکەی

---

(١) سِيَر أعلام النبلاء، ج٤، ص ٣٧-٣٨.

(٢) (ناصبي): ئەوانەن کە ڕقیان لە بنەماڵەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە، بەگشتی.

به کوشتنی حوسەین دەست پێ کرد و، بە کارەساتی حەڕڕەش[1] کۆتایی پێ هێنا، لەبەر ئەوە خەڵکی ڕقیان لێی هەڵسا، تەمەنیشی بەبەرەکەت نەبوو.

ئنجا دەربارەی مردنەکەی دەڵێ: موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موسمیع دەڵێ: یەزید ڕۆژێك سەرخۆش دەبێ، هەڵدەستێ سەما دەکات، بەسەر سەریدا دەکەوێ و مێشکی دەپرژێ).

ئەم گۆڕانکارییە نۆیەمەش کاریگەریی زۆری بوو لەوەدا کە ئەو تەوژمە فیکرییە جۆراو جۆرانە پەیدا ببن، بەتایبەتی شیعەی ڕافیضە، وەك دواتر باسی دەکەین.

**گۆڕانکاریی دەیەم:** ڕووداوی بەمەنجەنیق بەرد باران کردنی کەعبە و، ڕووخانی بەشێك لە دیوارەکەی و، شەهید کردنی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، خوا لێیان ڕازی بێ، کە ئەویش یەکێ بووە لە حوکمڕانانی مسوڵمانان بۆ ماوەی نۆ (٩) ساڵ لە مەدینە خەلیفەبوو، ئەو ڕووداوەش لەسەردەمی (عبدالملك)ی کوڕی (مروان)دا بوو، لەسەر دەستی (حَجّاج بن یوسف الثَّقَفي) لەساڵی (٧٣)ی کۆچییدا.

لە ئەنجامی ئەم دە هۆکارەو، هاووێنەکانیاندا، چەندان تەوژمی فیکریی جۆراو جۆر سەریان هەڵدا، کە لە کۆمەڵ و گرووپی جیاوازدا بەرجەستە دەبوون، کە من بیست (٢٠)یانم لێ سەرژمێر کردوون و لەتەوەری سێیەمدا باسیان دەکەم.

ئەمە کورتەیەك بوو لە سەرنجدانێکی مێژوویی بۆ چۆنیەتی سەرهەڵدانی {بیرکردنەوەیی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا}.

---

(١) ئەو کارەساتە شتی وای تێدا قەوماوە، ئینسان حەزناکا بیڵێ، یەکێ لەوانە کە تۆزێ سووکە دەیڵێم، ئەو فەرماندەیەی کە یەزید ناردبووی بۆ سەر خەڵکی مەدینە، چونکە خەڵکی مەدینە لە یەزید ڕاپەڕیبوون، جەنگاوەرەکانی کۆ کردەوە کە (١٠,٠٠٠) کەس دەبوون، پێی گوتن: دەبێ دان بەوەدا بنێن کە هەمووتان کۆیلەی یەزیدن و، ئافرەت و منداڵەکانیشتان کەنیزەکی یەزیدن، دەبێ دان بەوەدا بێنن بە ڕەسمیی، ئەگەرنا دەتانکوژم، ئەوانیش گوتیان: دان بەمەدا ناهێنین، ئیدی هەمووی کوشتن و، شتی دیکەی خراپتریشی کردوە.

# بەشی سێیەم

## سەرچاوەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی

١ ـ ئەزموون
٢ ـ عەقڵ
٣ ـ وەحیی
٤ ـ ئیلهام
٥ ـ خەون

## دەستپێك

بەڕێزان! بێگومان عەقڵ و هۆشی مرۆڤ لە بۆشاییدا كارناكا، دەبێ مەیدانێك هەبێ ئەسپی خۆی تێدا تاوبدا، ئنجا خوا سبحانه وتعالى عەقڵی تەنیا بە مسوڵمانان نەداوە، عەقڵی بە هەموو مرۆڤەكان داوە، ئەدی ئایا بیركردنەوەی ئیسلامیی جیاوازیی چییە لە بیركردنەوەی نا ئیسلامیی؟

جیاوازییەكە لەوەدایە، كە عەقڵی مرۆڤی مسوڵمان، ئەو سەرچاوانەی پشتیان پێ دەبەستێ، بۆ تێوەڕامانی و بیركردنەوەی، بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاریی و شارەزایی بەگشتیی، جیان لەو سەرچاوانەی دیكەی كە خەڵكی نا مسوڵمان پشتیان پێ دەبەستێ، لێرەدایە بیركردنەوەی ئیسلامیی، لەگەڵ هی نائیسلامیی، جیا دەبێتەوە، ئەگەرنا مرۆڤەكان هەموویان لەوەدا كە خوا عەقڵی پێداون، یەكسانن، هەموویان خاوەن عەقڵن، ئەوەی خاوەن عەقڵ نەبێ، دیارە ئەركی شەرعیی ناكەوێتە سەرشان، نە داوای لێ دەكرێ ئیمانی هەبێ و نە داوای لێدەكرێ پابەندیی هەبێ و، كردەوەی باش ئەنجام بدا.

دیارە زانایان و شارەزایان زۆر قسەیان كردوە، لەو بارەوە كە ئایا سەرچاوەكانی {فیكری ئیسلامیی} چی و چیین؟ ئنجا ئەوان ئەو وشەیان بەكار هێناوە، بەڵام -وەك پێشتر باسم كرد- من وشەی {بیركردنەوەی ئیسلامیی}یم پێ ڕاستە، بەڵێ زانایان زۆریان قسە لەو بارەوە كردوە، بەڵام ئەوەی من پێی گەیشتووم: ئەو سەرچاوانەی كە مرۆڤی مسوڵمان زانیاریی و شارەزاییان لێ وەدەست دێنێ، لە ئەنجامی بەكار هێنانی عەقڵیدا، ئەم پێنجەن:

كە سێیان گشتیین، دووانیشیان تایبەتیین:

أ- گشتییەكان:

١- عەقڵ، هەڵبەتە ئەگەر عەقڵ لەزاتی خۆیدا كار نەكات، مرۆڤ لە هیچ شتێكی دیكە بەهرەمەند نابێ.

٢- وەحیی، كە بە كوردیی (سروش)ی پێ دەڵێن و (نیگا)شی پێ دەڵێن.

٣- ئەزموون، واتە ئەوەی كە بە پێنج هەستەكان: (دیتن و، بیستن و، دەست لێكوتان (دەست لێخشاندن) و تام كردن و، بۆن كردن) دەستگیری دەبێ.

واتە: مرۆڤ دەتوانێ ئەو زانیارییانەی لەو سێ ڕێگایانەوە وەدەستیان دێنێ، بیانگەیەنێ بە غەیری خۆشی.

ب- تایبەتییەكان:

٤- ئیلهام. (الكشف، الحَدْس، الفِراسة، العلم اللّدنّـِي).

٥- خەون.

ئەو دووانە تایبەتن، یانی دەگونجێ مرۆڤ بەو دووانەش زانیاریی وەربگرێ، بەڵام تایبەتن، واتە: ناتوانێ ئەو زانیارییانەی لەو ڕێیانەوە دەستگیری دەبن، بیانگەیەنێ بە غەیری خۆی، مەگەر بۆیان بگێڕێتەوە، ئەگەرنا هەر لەزاتی خۆیدا هەستیان پێ دەكا.

ئنجا ئەو پێنج سەرچاوەیەش، لەنێوان زانایان و پێشەوایانی ئیسلامدا، لە چۆنیەتی ڕیزبەندكردنیاندا، مشت و مڕی زۆر هەیە، هەڵبەتە بەگشتی دەڵێین: مشت و مڕی زۆر هەیە، ئەگەرنا زۆربەی زۆری زانایان كە لەژێر ناوونیشانی: {جەماوەری مسوڵمانان}دا كۆبوونەتەوە، ئەوانە بەزۆری یەك ڕان، بەڵام خەڵكی دیكەش بووە و ئێستاش هەن، ئەوانیش ڕایەكی دیكەیان هەیە، بۆ وێنە: موعتەزیلە، بەتایبەت لەوەدا كە: ئایا عەقڵ دەخرێتە پێش، یاخود وەحیی (نەقڵ)؟

هەروەها ئەهلی تەصەووف زۆر جار ئیلهام یان خەونیان خستۆتە پێش ئەوانەوە، بۆ وێنە: گێڕدراوەتەوە لە هەندێك لە پێشەوایانی تەصەووف كە ڕەخنەیان گرتوە لە زانایانی شوێنەوارو فەرمووده و، وە لە زانایانی ئیسلام و گوتوویانە: زانستەكەی ئێوە لە مردووانەوەیە، (عن فلان عن فلان...) تاكو دەچێتەوە سەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم)، ئەوانەش هەموویان وەفاتیان كردوە، بەڵام زانیاریی ئێمە یەكسەر لە خوای بەردەوام و خوای ژیانی بەردەوامەوەیە، ئنجا گوتوویانە: (حدثني قلبي عن ربي)، واتە: دڵم لە خوای پەروەردگارەوە هەواڵی پێدام.

ئنجا كە لە دواییدا خەڵك تێكگیراوە، لە ئەنجامی چۆنیەتی ئەو ڕیزكردنەوەیە، ئایا لەڕووی ڕیزبەندییەوە: كامە لەپێش كامەوەیە؟ بەڵام پێویستە ئەوە بزانرێ كە بە دوو سێ ئیعتیبار، لەلای زۆربەی زانایان كە بۆخۆشم ڕام لەگەڵ وانە، ئەو سەرچاوانە دەگونجێ پاش و پێشیان پێ بكرێ:

أ- جارێ لەو ڕووەوە كە دوا قسە بۆ كێیە؟ بەتەئكید دەبێ وەحیی لەپێشەوە بێ، چونكە وەحیی یانی: زانیاریی خوا، دیارە زانیاریی خواش هەڵەو كەم و كوڕیی هەر تێدا نیە، كەواتە: لەو ڕووەوە كە كێ قسەی كۆتایی بەدەستە؟ دەبێ وەحیی لەپێشەوەبێ، دوایی عەقڵ، دوایی ئەزموون، دوایی ئیلهام و خەون.

ب- بەڵام بە ئیعتیبارێكی دی، بەو ئیعتیبارەی: ئێمە چۆن بزانین: كە ئەو وەحییە هی خوایە؟، ئەو وەحییە كە ئەو پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) پێمان دەگەیەنێ، چۆن بزانین ئەوە پێغەمبەرەو ڕاست دەكات، لەلایەن خواوە ڕەوانە كراوە؟ لێرەشدا بەو ئیعتیبارەو لەو لایەنەوە، عەقڵ دەكەوێتە پێشەوە.

ئنجا بۆ زانیارییتان من كە تەماشای كتێبەكانی عەقیدەو عیلمی كەلام و مشت و مڕی زانایانی سەلەف و خەلەفم كردوە، بۆم دەركەوتوە كە هەندێك جار جۆرێك لە لێك ناحاڵیی بوون هەیە، یان لێك حاڵی نەبوون، ئەگەرنا هەموو زانایان دەبێ لەسەر ئەوە یەكدەنگ بن: لەو ڕووەوە كە عەقڵ بناغەی ئەرك پێ سپێردرانە و، ئەوەی عەقڵی نەبێ، دواندن (خطاب)ی شەرع ڕووی تێ ناكا،

لەو ڕووەوە دەبێ عەقڵ لەپێشەوە بێ، چونكە عەقڵ پێمان دەڵێ: ئەوكەسە كە پێمان دەڵێ: من پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم)، وەك پێغەمبەرانی دیكە، ڕاست دەكا دەڵێ: بە بەڵگەی ئەوە كە موعجیزەی هەیە، ئەوەش كە لەخواوە دەیگەیەنێ كە قورئانەو پەیامی خوایە، ڕاستە پەیامی خوایە، لەو ڕووەوە دەبێ عەقڵ بكەوێتە پێشێ، بەڵام وەك گوتم: لەو ڕووەوە: كێ قسەی كۆتایی بەدەستە؟! بەتەئكید وەحیی خوا قسەی كۆتایی بەدەستە.

ج- بە ئیعتیبارێكی دی: لەو ڕووەوە كە زانیارییە سەرەتاییەكان، لە چ ڕێككگەیەكەوە دەستمان دەكەون؟! ئەزموون دەكەوێتە پێشەوە، یانی: پێنج هەستەكان، دەكەونە پێش عەقڵەوە، چونكە پێش ئەوەی بەعەقڵ قسەكان شی بكەیەوە، بەچاو شتەكان دەبینی و، بە گوێ دەیانبیستی و، بەدەست لێكوتان و، تام كردن و، بۆن كردن، پەییان پێ دەبەی.

ویستم ئەو ڕوونكردنەوەیەتان بۆ بدەم كە ئەو مشت و مڕەی هەبووە لەنێوان زانایاندا بە درێژایی مێژوو، بە بۆچوونی من هەندێكی دەگەڕێتەوە بۆ لەیەك حاڵی نەبوون، ئنجائەگەر ڕەچاوی ئەو ئیعتیبارانە بكرایە، ئەو مشت و مڕو تێككگیرانە زۆری لادەچوو، هەندێكیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە كە لەلایەكەوە موعتەزیلە - وەك دوایی باسی دەكەین - زێدەڕۆییان كردوە لە پشت پێ بەستنی عەقڵدا و، لەلایەكی دیكەوەش: هەندێكی دیكە هەن كە(أهل الأثر) یان دەقگەرایەكانن، نەك بەو مەفهوومەی عەلمانییەكان بەكاری دەهێنن، من بەو مەفهوومە بەكاری ناهێنم، بەڵام هەندێك هەبوون بەس سەرنجی ڕواڵەتی دەقەكانیان داوە و، عەقڵیان ئیهمال كردوە، كە هەندێ لە ئەهلی حەدیس و هەندێ لە ئەهلی فیقە وابوون و، چی لەپێش واندا گوتراوە، هەر ئەوەیان دووبارە كردۆتەوە، كە ئەوەش هەر زێدە ڕۆییە، وەك چۆن ئەوی دیكەش زێدەڕۆییە، یەكیان زێدەڕۆییە بەلای دەقدا، كە دەقەكانی شەریعەت خۆیان فەرمان دەكەن بە بیر كردنەوە، كەچی ئەوان بە بیانووی شوێن كەوتنی دەقەكانەوە، عەقڵیان پشت گوێ خستوە، پاشان موعتەزیلەش بە بیانووی ڕێزلێ گرتنی عەقڵەوە، حیسابێكی باشیان بۆ نەقڵ نەكردوە، كە دیارە هەر عەقڵیش دەڵێ: مادام خوا

شتێك بفەرموێ، لەدوای فەرمایشتی خوا و، لەدوای فەرمایشتی پێغەمبەری خوا، ئەوەی كە وەك وەحیی دەیفەرموێ، نەك وەك ئەزموونی بەشەریی خۆی، ئەو كاتە بواری قسە بۆ كەس نامێنێتەوە.

ئەمە وەك پێشەكییەك بوو بۆ ئەوەی بەرچاوتان ڕوون بێ، دەربارەی سەرچاوەكانی بیركردنەوەی ئیسلامیی.

ئێستاش دەست دەكەین بە قسە كردن لەبارەی سەرچاوەكانی بیركردنەوەی ئیسلامییەوە، لەپێنچ باساندا:




## ئەزموون[1]

## (پێنج هەستەوەرەکان: الحَواس الخَمس):

پێنج هەستەکان، تەنیا پێنج هەستن، ئەوەی لە هەندێ کتێبدا دەیخوێننەوە: هەستی شەشەم و هەستی حەوتەم، ئەوانە هەست نین، لە ڕاستیدا ئەوانە هەر ئەو هێزە ڕووحییەن کە مرۆڤ هەیەتی، بەڵام ئەوان لەبەر ئەوەی کە نەیانویستوە دان بە ڕووحدا بێنن، بەتایبەت مارکسییەکان و ماتریالیستەکان، زۆر جار ئەو تەعبیرەی هەستی شەشەمیان بەکار هێناوە، بۆ ئەو شتانەی کە ئینسان لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە هەستیان پێ ناکات و زانیارییەکی مسۆگەریشی دەستگیر

---

(١) لە ڕیزبەندییەکەدا ئەزموونم لە پێشەوە داناوە واتە: پێنج هەستەوەرەکان، لەو ڕووەوە، کە مرۆڤ وەك واقیع لە بەکارهێنانی هەستەکانیەوە دەست پێ دەکا، جارێ پێش ئەوەی عەقڵی کار بکاو، پێش ئەوەی لە وەحی خوا تێ بگات و، پێش ئەوەی بچێتە سۆراغی ئیلهام و خەون، لە پێنج هەستەکانەوە دەست پێ دەکا، بۆیە بەیەکەم سەرچاوەم داناوە، نەك لەبەر ئەوەی لە هەموویان گرنگترە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لە هەموویان پێش کەوتۆتەوە، لەوەدا کە مرۆڤ پێشتر لێیان بەهرەمەند دەبێ لە وەدەستهێنانی زانیارییەکان.

دەبێ، ناویان لێناوە هەستی شەشەم، بۆ ئەوەی دان بەبوونی ڕووحدا نەهێنن، چونکە ڕووح شتێکی جیایە لە ماددەو ئەوانیش {ماددییگەرایەکان} نکوولْییان کردوە لەوە کە جگە لە ماددە، شتێکی دیکە بوونی هەبێ، جگە لەوەی کە بەپێنج هەستەکان دەزانرێ و پەی پێ دەبردرێ، بۆیە هەستاون ئەو شتانە کە لەڕێی غەیری پێنج هەستەکانەوەو غەیری ڕێی عەقڵەوە دەزانرێن، بۆ وێنە: کەسێك لە مۆسکۆوە قسە بکات بۆ کەسێك کە لە واشنتۆنە، کە بۆ زانیارییتان زۆر جار لەکاری هەواڵگریی (مخابرات)دا سوودیان لەو جۆرە کەسانە بینیوە، یان کەسێك کە لێرە دانیشتوە، بزانێ لەشارێکی دیکە چی دەقەومێ؟ کە مەرج نیە ئەوە تەنها بۆ مسوڵمانان بێ، نامسوڵمانانیش ئەو هەستەیان هەبووە، ئەوە ناویان لێناوە هەستی شەشەم، کە لە ڕاستییدا پەیوەندیی نیە بەو هەستانەوە، بەڵکو کاری ڕووح بووە، بەڵام ئەوان نەیانویستوە دانی پێدا بهێنن، ئەگەرنا هەستەکان هەر پێنجن: {هەستی دیتن، هەستی بیستن، دەست لێ کوتان (دەست لێخشاندن) یانی: هەستکردن لە ڕێی پێستەوە، کە مەرج نیە هەر لەڕێی دەستەوە بێ، هەستی تام کردن، بەهۆی زمانەوە، هەستی بۆن کردن، بەهۆی لووتەوە}.

پێنج هەستەکان دەتوانین بڵێین: چەند تۆڕو شەداوێکن - (تۆڕ) ئەوەیە کە ماسیی پێ دەگرن، (شەداو)یش ئەوەیە کە باڵندەی پێ دەگرن - کە مرۆڤ بەو پێنج هەستانە: نێچیری: وێنەکان (الصور) و، دەنگەکان (الأصوات) و، دەست لێکوتراوەکان (الملموسات) و، تام کراوەکان (المژوقات) و، بۆن کراوەکان (المشمومات) دەستگیر دەکات.

ئنجا ئایا لە ئیسلامدا لە قوڕئاندا، تا چ ڕاددەیەك گرنگیی دراوە بەو پێنج هەستانە و، ئیعتیباریان بۆ دانراوە؟ چونکە زۆر جاران ماددییگەرایەکان (ماتریالیستەکان) دەڵێن: ئیسلام هیچ ئیعتیبارێك بۆ جیهانی ماددە دانانێ، ئیسلام ئایینێکی ئایدیالیی، (مثالي)یەو تەنها حیساب بۆ ڕووح دەکا! کە هەڵبەتە ئەوە درۆیەکی زۆر گەورەیە، قوڕئان لەچەندان ئایەتدا فەرمانی کردوە بەمرۆڤەکان، کەپێنج هەستەکانیان بەکار بێنن، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (الملك) ئایەتی (٢٣)دا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

واتە: بڵێ: (خوا) ئەو كەسەیە ئێوەی پێگەیاندوە و، بیستن و دیتنەكان و عەقڵەكانی بەئێوە داون، بەڵام كەم وایە سوپاس گوزاریی بكەن.

٢- لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (٣٦)دا دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ۚ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ﴿٣٦﴾ ﴾

واتە: بەدوای شتێك مەكەوە زانیارییت دەربارەی نەبێ، بێگومان بیستن و دیتن و دڵەكان {یان عەقڵەكان} هەركام لەوانە لێیان دەپرسرێتەوە. ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ كە بیستن و دیتن و عەقڵ، هەركام لەوانە لێیان دەپرسرێتەوە، كەواتە: لەو ڕێیانەوە زانیاریی وەدەست دێ، پێشێ دەفەرموێ: بەدوای شتێك مەكەوە زانیارییت دەربارەی نیە، دوایی دەڵێ: بیستن و دیتن و عەقڵ، لێیان دەپرسرێتەوە، كەواتە: لەڕێی بیستنەوەو، لە ڕێی دیتنەوەو، لە ڕێی بەكار هێنانی عەقڵەوە، زانیاری وەدەست بێنە، لەبارەی شتێكەوە كە دەتەوێ شوێنی بكەوێ، هەڵوێستێك لەبەرانبەریدا وەربگری، با زانیارییت دەربارەی هەبێ، لەڕێی بەكار هێنانی هەستەكان و عەقڵتەوە، ئنجا قسەی لێ بكە.

٣- لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٧٨)دا، زۆر بە ڕوونی ئەوە دەفەرموێ:

﴿ وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾

واتە: خوا ئێوەی لە سكی دایكتان دەرهێنا، هیچ شتێكتان نەدەزانی، بەڵام بیستن و دیتن و عەقڵی پێدان، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بكەن، (واتە: ئەو هەستەوەرانە بكاربهێنن لە ڕەزامەندیی خوادا، ئەوە سوپاسگوزارییە بۆ خوا و سوپاسگوزارییە بۆ نیعمەتەكانی پەروەردگار).

٤- لە سوورەتی (عبس)دا دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ ﴾

واتە: با ئینسان سەرنجی خواردنەکەی بدات.

هەڵبەتە لێرەدا دەگونجێ مەبەست لە (نظر) سەرنجی ڕواڵەتی بێ واتە: بەچاو سەرنج بدا، دەشگونجێ سەرنجی زانستیی بێ، نەك سەرنجی (هەستیی) چاو.

٥- هەروەها لە سوورەتی (الطارق)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ ﴾

واتە: با ئینسان سەرنج بدات، ورد بێتەوە بزانێ لە چی دروست بووە!

٦- دیسان لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ:

﴿ ..خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ۖ .. ﴿٩٣﴾ ﴾

واتە: ئەوەی پێمان داون، بەهێز وەریبگرن و گوێ بگرن.

٧- بەڵکو خوا لە سوورەتی (الأعراف)دا، ڕایدەگەیەنێ کە دۆزەخی بۆ ئەو کەسانە داناوە لە جینن و ئینس، کە عەقڵی خۆیان بەکار ناهێنن:

﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾

واتە: بەدڵنیایی ئامادەمان کردوە بۆ دۆزەخ، زۆرێك لە جینن و ئینس: عەقڵیان هەیە پێی تێناگەن، چاویان هەیە پێی نابینن، گوێیان هەیە پێیان نابیستن، ئەوان وەك ئاژەڵن، بەڵکو لە ئاژەڵیش گومڕاترن، ئەوانە بێ ئاگان.

بێ ئاگان لە ئەنجامی ئەوەدا کە هەستەوەرەکانی خۆیان و عەقڵی خۆیان بەکار نەهێناوە.

کەواتە: یەکەم سەرچاوە بۆ زانا و سارەزابوونی مرۆڤ، مسوڵمان یان نامسوڵمان، بەڵام لێرەدا ئێمە باسی مسوڵمان دەکەین، بریتیە لە بەکارهێنانی پێنج

هەستەکانی، هەڵبەتە پێنج هەستەکان هەر دەتوانن کەرەستەی خاو کۆ بکەنەوە، وێنەکان، دەنگەکان، بۆنەکان، تامەکان.. هتد، بەڵام بەبێ هەبوونی عەقڵ، ئەو کەرەستە خاوانە سوودیان لێ نابینرێ، وەك ئەوە کە: کۆمەڵێك کرێکار، چەوو لم و گەچ و شێلمان و کەرەستەیەکی زۆر کۆ بکەنەوە، بەڵام ئەگەر دوایی ئەندازیارێك نەبێ، نەخشەیەك بکێشێ و، کۆمەڵێك وەستای شارەزا نەبن، ئەو کەرەستە خاوە، بەتەنیا هیچی لێ پێك نایەت، پێنج هەستەکانیش هەر ئەوەندەیە ئەو زانیارییانە دەربارەی دروستکراوەکان کۆ دەکەنەوە، یەکیان دەنگەکانیان، ئەوەی دیکە وێنەکانیان، ئەوەی دیکە تامەکان، ئەوەی دیکە بۆنەکان، ئەوەی دیکە قەبارەکانیان کۆ دەکەنەوەو، وەك کەرەستەیەك لەوێ دایان دەنێن، بەڵام دەبێ کێ بەکاریان بێنێ؟! بێگومان عەقڵ، بۆیەش سەرچاوەی دووەم و هەرە گرنگ بۆ وەدەستهێنانی زانست بریتیە لە عەقڵ.




# عـــەقڵ

بە كوردیی دەڵێین هۆش، ئاوەز، هەروەها وشەی (عەقڵ و ئەقڵ)یش زۆر بەكاردێن.

(الجرجاني) دەڵێ: {العقل: ما يعقل حقائق الأشياء}، واتە: عەقڵ ئەوەیە كە: ڕاستییەكانی شتەكان دەبەستێتەوە، (عقَل، عقلهُ) یانی: بەستیەوە، (عِقال) ئەوەیە كە وڵاخیان شتیان پێ بەستۆتەوە، عەقڵ بریتیە لەو هێزە كە زانیارییەكان دەبەستێتەوەو كۆیان دەكاتەوەو لە لای خۆی دایان دەنێ و بەكاریان دەهێنێ، {مأخوذ من عِقال البعير، يَمْنَعُ ذَوي العقولِ من العدول عن سَواءِ السَّبيل}[1]، واتە: لە (عِقال)ی حوشترەوە هاتوە، كە خاوەن عەقڵان لە لادان لە ڕاستە ڕێ، دەپارێزێ و دەگەڕێنێتەوە.

ئەم باسە لەچوار خاڵاندا دەیخەینەڕوو:

---

(١) التعريفات، ص ١٥٢.

ا- ڕۆڵی عەقڵ لە بواری پەیداکردنی زانستدا:

عەقڵ چەند ڕۆڵێك دەبینێ:

**١)** ئەو کەرەستە خاوەی کە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە کۆ کراوەتەوە: دەنگەکان، بۆنەکان، وێنەکان، تامەکان، زبریی و نەرمیی و قەبارەی شتەکان، هەموو ئەوانە بەکار دێنێ وەك کەرەستەیەکی خاو، کێ تەصەڕوفیان تێدا دەکا؟ بێگومان عەقڵ، عەقڵ دەوری ئەو ئەندازیارەو ئەو وەستایانە دەبینێ، کە لە کەرەستەی خاو، بینا دروست دەکەن.

**٢)** عەقڵ چەند یاساو پڕەنسیپێکی تێدان، خوای پەروەردگار چەند یاسایەکی بەڵگە نەویستی(بدیهی) لە هەموو عەقڵەکان داناون، بەبێ جیاوازیی، کە بەبێ ئەوانە، بەشەر نەیاندەتوانی لەیەك تێبگەن و نەیاندەتوانی پێکەوە هاوکار بن و ئەگەر ئەو سەرەتا عەقڵییانە (المبادئ العقلية) و ئەو بەڵگە نەویستە عەقڵییانە (البدهيات العقلية) نەبوونایە، کەس لەکەس حاڵی نەدەبوو، بەڵام ئێستا لەو پەڕی دنیا بۆ ئەو پەڕی دنیاو، هەتا دنیاش بەکۆتا دێ، هەموو کەس دەزانێ: ٢+٢ = ٤ و، هەموو کەس دەزانێ: هەموو (كُلّ) لە بەش (جزء) گەورەترە و، هەموو کەس دەزانێ دوو شتی دژ بەیەك (متناقض) ناتوانن بەیەکەوە کۆ ببنەوەو .. هتد.

**٣)** عەقڵ ئەنجامگیریی دەکات و شیکردنەوە دەکا، ئەو زانیارییانەی کە وەدەستی هێناون، لێکیان دەداو ڕیزیان دەکات و، ئەنجامگیرییان لێ دەکات و، بەهۆی شتە زانراوەکانەوە، عەقڵ هەوڵ دەدات شتە نەزانراوەکانیش پەی پێ بەرێ، وەك پێشتر لە پێناسەی فیکردا باسمان کرد، کەواتە: بە هەستەوەرەکان، تەنها شتە بەرهەستەکان دەزانین، بەڵام بەهۆی عەقڵەوە فامکراوەکانیش دەزانین، بۆ وێنە: هێزی کێشندە، هێزی موگناتیسیی، چۆن دەزانین هەن؟ بێگومان لە ڕێگای

عەقڵەوە دەزانین، دەنا هەر کامیان نە دەبینرێ، نە تام دەکرێ، نە بۆن دەکرێ، نەدەبیسترێ، ئەدی چۆن دەزانی هەیە؟ بەهۆی عەقڵەوە، چونکە عەقڵ شیدەکاتەوەو ئەنجامگیریی دەکات، با لەو بارەوە نموونەیەکتان بۆ بهێنمەوە:

ئیسحاق نیوتن یەکەم کەس بوو هەستی بە هێزی کێشندە (قوة الجاذبية) کرد، ئاشکرایە ئەو هێزە هەر هەبووە، بەڵام ئەو یەکەم کەس بوو، هەستی پێ کرد، لە ئەنجامی چییەوە هەستی پێ کرد؟ لەبەسەرهاتەکەیدا دەڵێ: لەسەر کانییەك بووە، درەختی سێوی لەسەر بووە، سێوێك لە درەختەکە کەوتۆتە خوارو کەوتۆتە نێو کانیەکە، ئەویش هەر سەرنجی داوە: باشە ئەو سێوە بۆچی دەکەوێتە خوار؟ دەبێ هێزێك هەبێ ڕایکێشێ، لەئەنجامی ئەوەدا، پەی بردوە بە هێزی کێشندە، یانی: شتێك هەیە ئەو سێوە ڕادەکێشێ، لە شوێنی خۆیەوە دێ بەرەو شوێنێکی دیکە، دیارە ئەوە ئێستا بۆتە یەکێ لە شتە بەڵگە نەویستەکان، کە نەك هەر ئەو سێوە، بەڵکو خولانەوەی هەموو هەسارەکان و کەهکەشانەکان بەهۆی هێزی کێشندەوەیە، کە خوای پەروەردگاریش لە دوو شوێن لە قورئاندا ئاماژەی پێداوە، هەم لە سوورەتی (الرعد)دا، هەم لە سوورەتی (لقمان)یشدا، دەفەرموێ:

﴿.. رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا ...﴿٢﴾﴾ الرعد، (خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا...) لقمان:١٠.

واتە: ئاسمانەکانی بەرز کردوونەوە، بەو کۆڵەگانە، کە ئێوە نایانبینن، یاخود: بەبێ کۆڵەگان، وەك دەیانبینن، بەڵام ئەوەی یەکەمیان ڕاستترە، چونکە تۆ کۆڵەگەکان نابینی، کەواتە: {(بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ) یانی: بعمدٍ غيرِ مرئية}، بە کۆڵەگە نەبینراوەکان، کە مەبەست پێی هێزی کێشندەیە.

## ٢- ڕۆڵی عەقڵ لەگەڵ پێنج هەستەکاندا:

**خوێنەرانی بەڕێز!**

یەکێك لە زانا ڕۆژئاواییەکان (فرانسس بیکۆن) کە یەکێکە لە فەیلەسووفەکان[1]، بۆ ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی عەقڵ لەگەڵ پێنج هەستەکاندا، وێنەیەکی جوان دێنێتەوە، دەڵێ: وێنەی ئەوانە کە تەنیا حیساب بۆ پێنج هەستەکان دەکەن، - پێنج هەستەکان کە زانیاریی لەدەرەوەی خۆیانەوە دێنن - هەستگەرایەکان کە تەنها حیساب بۆ پێنج هەستەکان دەکەن، وەك وێنەی مێرووولە وایە، مێرووولە تەنیا شت لەدەرەوەی خۆی کۆدەکاتەوەو دەیهێنێتە نێو شارەکەی خۆی، دانەویڵەو شتی دیکە کۆ دەکاتەوە.

وێنەی عەقڵگەرایەکانیش کە تەنها حیساب بۆ عەقڵ دەکەن و، گوێ بە پێنج هەستەکان نادەن، وەك جاڵجاڵۆکە وایە، جاڵجاڵۆکە لەو لیکەی خۆی کە دەیڕێژێ، تەونی چنینی ئەو ماڵەی خۆی دروست دەکات[2]، بەڵام ئەوەی کە هەم پێنج هەستەکان، هەم عەقڵ بەکار دێنێ، وەك هەنگ (مێشەنگوینە) وایە، مێشەنگوینە هەم لەدەرەوەی خۆیەوە شت دەهێنێ، کە شیلەی گوڵەکانە، هەم لەنێو خۆشیدا گۆڕانی بەسەردا دێنێ و هی خۆیشی دەخاتە سەر، سەرەنجام هەنگوین

---

(١) فەیلەسوفەکان بە درێژایی مێژوو، هەندێکیان هەستگەرا بوون، یانی: بەس حیسابی ئەو شتانەیان کردوە کە لە ڕێگای پێنج هەستەکانەوە دەزانرێن، وە هەندێکیان عەقڵگەرا بوون، واتە: بەس حیسابیان بۆ ئەو شتانە کردوە، کە لە ڕێگای عەقڵەوە پەییان پێ دەبردرێ، هەندێکیشیان ئایدیالیی (مثالي) بوون و حیسابیان نە بۆ عەقڵ و، نە پێنج هەستەکانیش نەکردوە، بەڵام لە ئیسلامدا هەم حیساب بۆ هەستەکان دەکرێ، بەڵام لە سنوری خۆیانداو، هەم حیساب بۆ عەقڵ دەکرێ، وە لەولای عەقڵیشەوە، حیساب بۆ شتی دیکەش دەکرێ: کە وەحییە، ئیلهامە، خەونە.

(٢) بۆ زانیارییتان! ئەو تاڵە دەزووەی لە لیکی جاڵجاڵۆکە درووست دەکرێ شارەزایان دەڵێن: زۆر زۆر لە پۆڵا بەهێز ترە، یانی: ئەگەر پۆڵا ئەوەندە باریك بکەیەوە، بەقەدەر دەزووی تەونی جاڵجاڵۆکە بەهێز نابێ.

دروست دەبێ، ئەگەر مێروولە هەر شت كۆدەكاتەوە و، جاڵجاڵۆكە لیكەكەی تەنها لەخۆی دەری داوێ، مێشەنگوینە هەم لەدەرەوەی خۆی زانیارییەكان دێنێ و هەم هی خۆشی دەخاتە گەڵ، كەواتە: ئەوانەی كە هەم عەقڵ و، هەم پێنج هەستەكان بەكار دێنن، وەك هەنگ وان، وێنە هێنانەوەكەی زۆر جوانە.

## ٣- خوای پەروەردگار لەزۆر ئایەتدا، باسی عەقڵ و گرنگییدان بە عەقڵ دەكات:

بۆ نموونە:

١- لەسوورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٨٥)دا دەفەرموێ:

﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾

( أَوَلَمْ ) ئەو هەمزەیە پێی دەگوترێ: (همزة الإستفهام الإنكاري)، واتە: هەمزەی پرسیار كردنی نكوولێیلێكەرانە، واتە: خوا بە ڕەخنە گرتنەوە دەفەرموێ: ئایا سەرنجیان نەداوەتە موڵكی فراوانی ئاسمان و زەوی و، هەر شتێك كە خوا دروستی كردوە، بۆچی سەرنجیان نەداوەتێ؟ بۆ لێی ورد نابنەوەو تێوەی ڕانامێنن؟ نزیكە كاتی مەرگیان نزیك بوو بێتەوە، لەدوای ئەم قورئانە بە چ فەرمایشتێكی دیكە بڕوا دێنن؟

لێرە خوا ڕەخنە لە كافرەكان دەگرێ كە: بۆچی سەرنج نادەن و ڕانامێنن، لە موڵكی فراوانی ئاسمانەكان و زەوی و، هەر شتێكی دیكە كە خوا دروستی كردوە، واتە: پێشێ سەرنجدانێكی گشتی لە هەموو بوون (وجود)، دوایی لە هەر شتێك بەجیا جیا.

٢- لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (١٩٠)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ١٩٠ ﴾ آل عمران

واتە بێگومان لە دروست كردنی ئاسمانەكان زەوی و جێگۆڕكە {یاخود جیاوازیی} شەوو ڕۆژدا نیشانە هەن بۆ خاوەن عەقڵان.

٣- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٤٢)دا دەفەرموێ:

﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ٢٤٢ ﴾

واتە: ئا بەم شێوەیە خوا ئایەتەكانی خۆیتان بۆ ڕوون دەكاتەوە، بەڵكو تێبگەن، هۆشتان هەبێ.

٤- هەر لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢١٩)دا، دەفەرموێ:

﴿ .... كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ٢١٩ ﴾

واتە: خوا ئاوا ئایەتەكانی خۆیتان بۆ ڕوون دەكاتەوە، بەڵكو بیر بكەنەوە.

٥- لە سوورەتی (الجاثیة) ئایەتی (١٣) دەفەرموێ:

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ١٣ ﴾.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی مەیسەر كردوە، دەستەمۆی كردوون، بۆ ئێوەی ملكەچ كردوە، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن، بۆ كۆمەڵێك بیر بكەنەوە.

٦- لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (٩٨)دا دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ٩٨ ﴾ الأنعام.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی هەمووتان لە یەك نەفس پێگەیاندوە، لە هەندێ قۆناغاندا جێگیر دەبن و، لە هەندێ قۆناغانیشدا وەك سپاردە {بە ئەمانەت} هەڵدەگیرێن، ئایەتەکانی خۆمان ڕوون کردۆتەوە، بۆ کەسانێك کە شارەزا بن.

٧- هەرلە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٢٦)دا، دەفەرموێ:

﴿وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسۡتَقِيمٗاۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ١٢٦﴾ الأنعام.

واتە: ئەمە ڕاستە شەقامی پەروەردگارتە، ئایەتەکانمان ڕۆشن کردوونەتەوە بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە.

## ٤ـ ئایا عەقڵ تا كوێ بڕ دەكات؟

ئەگەر مەودای پێنج هەستەكان تەنها شتە بەرهەستەكانن (المحسوسات)، مەودای عەقڵیش هەر لە جیهانی ماددە دایە، بەڵام جیهانی ماددە بە بینراوو نەبینراویەوە، كە جیهانی ماددە مەرج نیە هەموی ببینرێ، بۆ وێنە: ڕووحیش هەر لەم دنیا ماددییەدایە، بەڵام نابینرێ و، هێزی موگناتیسیی و، هێزی كێش كردن و، گەلێ لە دروست كراوەكانی دیكەی خوا، وەك گەردیلە تا ئێستا كەس نەیبینیوە، بەڵام بەهۆی شوێنەوارەكانیەوە دەزانرێ، كە ئێستا لە گەردیلەش بچووكتر دۆزراوەتەوە، پسپۆڕان دەڵێن: لەنێو گەردیلەدا چەندان تەنۆلكە هەن، ئەوانە كەس نەیبینیون، نەك هەر ئەوە بەڵكو بەشێوەی (جُزَيءْ) (مۆڵكۆڵ molcol)یش هەر نەبینراوە، نەك هەر بەچاو بەڵكو بە میكرۆسكۆب كە (٥٠٠،٠٠٠) جار شت گەورە دەكات، بەوەش نەبینراوە، ئەدی چۆن بوونی دەزانین؟ بێگومان بەهۆی شوێنەوارەكانیەوە.

بەڵێ پێنج هەستەكان تەنها لەگەڵ ئەو شتانەی كە بەرهەستن، مامەڵە دەكەن، عەقڵیش لەگەڵ ئەو شتانەدا كە بەرهەستن و، لەگەڵ ئەو شتانەشدا كە نابەرهەستن، بەڵام بەهۆی شوێنەوارەكانیانەوە، دەزانرێ كە هەن، یانی: خودی خۆیان بەرهەست (محسوس) نین، بەڵام شوێنەوارەكانیان بەرهەستن، بۆیە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ كردووین كە عەقڵ بەكار نەهێنین بۆ ئەوەی بزانین ماهیەت و حەقیقەتی خوا چۆنە؟!

أ- وەك لە هەندێك گێڕراوەدا هاتوە: {تَفَكَّروا فِي آلاءِ الله، ولا تَفَكَّروا فِي الله}، أخرجه أبو الشيخ (١/٢١٠، برقم: ١)، و(الطبراني في الأوسط برقم: ٦٣١٩)، قال الهيثمي (٨١/١): فيه الوازع بن نافع وهو متروك، وابن عدي (٩٥/٧، ترجمة ٢٠١٧ وازع بن نافع العقيلي)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم: (١٢٠) قال البيهقي: هذا إسناد فيه نظر.

واتە: بیر لە چاكەو بەخشش و نیعمەتەكانی خوا بكەنەوە، بەڵام بیر لە خوا مەكەنەوە.

بیر لە خوا مەكەنەوە! واتە: بیر لە زاتی خوا مەكەنەوە، كە بزانن چۆنە؟، ئەگەر نا: كردەوەكانی خوا، سیفەتەكانی خوا، دروستكراوەكان و هەڵس و كەوتەكانی خوا، لە گەردووندا، بیریان لێ بكەنەوە.

**ب-** هەروەها لە فەرموودەیەكی دیكەدا هاتوە، دەفەرموێ: {تَفَكَّروا في خَلقِ الله ولا تَفَكَّروا في الله، فإنَّكم لن تقدروا قَدْرَهُ} أخرجهُ أبو نُعَيم عن ابن عباس.

واتە: بیر لە دروستكراوی خوا بكەنەوە، بەڵام بیر لە خوا مەكەنەوە، چونكە ئێوە وەك پێویست ڕێزی خوا ناگرن، قەدری خوا نازانن[١].



---

(١) دیارە شتی دیكەش هەیە دەربارەی عەقڵ و پێنج هەستەكان، بەڵام دوایی باسی دەكەین.




# وەحـیـی

## دەستپێك

**خوێنەری بەڕێز!**

بە پێویستی دەزانم لە هەشت خاڵاندا، تیشكێكی باش بخەینەسەر وەحیی و ئەو قورئان و سوننەتەی كە تێیان دا بەرجەستە بووە، كە ئەمانە ناوونیشانەكانیانن:

**١ـ پێناسەی وەحیی و، قورئان و سوننەتی تاكە بەرجەستەكەری وەحیی.**

**٢ـ بەڵگەكانی سەرچاوە بوونی سوننەت بۆ شەریعەت.**

**٣ـ ڕوونكردنەوەی چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان و قورئان و سوننەت.**

**٤ـ بەبێ شارەزایی لە قورئان، مەحاڵە تەنیا بەهۆی سوننەتەوە بتوانرێ تێگەیشتنێكی ڕاست و هاوسەنگ، لەبارەی ئیسلامەوە دەستگیربێ.**

**٥ـ ڕەواندنەوەی تەم و مژ لەسەر كۆكردنەوەی سوننەت.**

**٦ـ جۆرەكانی سوننەت.**

**٧ـ هۆیەكانی هەڵبەستن (أسباب الوضع) و چۆنیەتی جیاكردنەوەی فەرموودە و قسەی هەڵبەستراو.**

**٨ـ ناگونجێ فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هیچ كام لە: عەقڵ، قورئان، واقیع و زانستدا، دژ بوەستێ.**

## ا- پێناسەی وەحیی و قورئان و سوننەتی تاکە بەرجەستەکەری وەحیی:

ئەم خاڵەش لەچوار بڕگەدا دەخەینەڕوو:

### ١- پێناسەی وەحیی[1] لەزمان و شەرعدا:

**١-** (راغب الأصفهاني) دەڵێ: {أصل الوحي: الإشارة السريعة، ولتضمن السرعة قيل: أمرٌ وحْيٌ، وذلك يكون بالكلام على سبيل الرمز والتعريض، وقد يكون بصوت مجرد عن التركيب، وبإشارة ببعض الجوارح، وبالكتابة، ويقال للكلمة الإلهية التي تلقى إلى أنبيائه وأوليائه: وحي، وذلك أضربٌ حَسْبما دل عليه قوله تعالى: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ الشورى، وذلك إمّا برسولٍ مشاهَدٍ تُرى ذاتُهُ، ويُسْمَعُ كلامُه، كتبليغ جبريل عليه السلام للنبــي في صورة معيَّنةٍ، وإمّا بِسَماعِ كلامٍ من غير معاينة، كسماع موسى كلام الله، وإما بإِلقاء في الرّوعِ كما ذكر عليه الصلاة والسلام: (إنّ روحَ القُدُس نَفَثَ في رُوعي أن

-----------------------------

(١) هەڵبەتە ئەو قسەیەی پێشێتان هەر لەبیر بێ: ئەگەر لە ڕووی لە گرنگترەوە بۆ گرنگ (الأهم فالمهم) بچین و ڕیزبەندییان بکەین، دەبێ وەحیی بخرێتە پێش هەموویان، ئەگەر لەو ڕووەوە ڕیزیان بکەن کە قسەی کۆتایی بەدەست کێیە؟ ئەوە بەتەئکید، قسەی کۆتایی بەدەست وەحییە، کە شوێنی زانیاریی وەرگرتنە، بەڵام عەقڵ و پێنج هەستەکان و ئیلهام هەموویان زادەی مرۆڤن، جا ئەوەی کە لە مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتوە، لەقەدەر مرۆڤە، ئەوەش کە لە خواوە سەرچاوەی گرتوە، لەقەدەر خوا خۆیەتی، هی خوا هیچ گومانی تێدا نیە، بەڵام هی مرۆڤ دەگونجێ تێیدا بەهەڵەدا بچێ، ئەوە لە ڕووی ڕیزبەندییەوە کە کێ قسەی کۆتایی بەدەستە؟.

بەڵام لە ڕووی ڕیزبەندیی واقیعییەوە، پێشێ ئینسان لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە شت دەزانێ، دوایی عەقڵ بەکار دەهێنێ، ئنجا عەقڵیش تا مەودایەك دەڕوا، دوایی پەکی دەکەوێ، هەتا لێواری غەیب و نادیار دەچێ، پاشان دێتە خوارێ، چی دیکە ناتوانێ بڕ بکاو دەوەستێ.

نفساً لا تموت حتى تستكمل رزقها، فاتّقوا الله وأَجْمِلوا في الطَّلَب)[1]، وإما بإلهامٍ، نحو: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ...﴿٧﴾ ﴾، وإمَّا بتسخير، نحو قوله: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ...﴿٦٨﴾ ﴾ النحل، أو بِمَنامٍ، كما قال عليه الصلاة والسلام: (انقطع الوحي وبقيت المبشِّراتُ: رؤيا المؤمن)[2]، فالإلهام والتسخير والمنام، دل عليه قولُه: (إِلَّا وَحْيًا)، وَسَماعُ الكلام معاينةً، دل عليه قولُه: (أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ)، وتبليغ جبريل في صورة معينة، دلّ عليه قولُه: (أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ)}[3].

واتە: وشەی وەحیی لە ئەصلی زماندا بە مانای ئاماژەیەکی خێرایە و، لەبەر ئەوە کە وشەی (وحي) خێرایی دەگەیەنێ، لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (أمرٌ وحْي) واتە: ئیشێکی خێرا، ئنجا ئەو ئاماژە خێرایە، دەگونجێ بە قسە بێ، بە هێماو لەبەررِا هاویشتن، جاری واش هەیە بە دەنگ دەبێ، بەبێ ئەوەی ئەو دەنگە تەرکیبێکی هەبێ، (بانگی یەکێ دەکەی دەڵێی: (هۆ) هیچ ناڵێی، هەر دەنگێکە)، جاری واش هەیە بە ئاماژە دەبێ، بە هەندێك لە ئەندامەکان، {بەپەنجە، بەدەست، بە چاو}، هەروەها جاری واش هەیە بە نووسین دەبێ، {ئەمانە هەموویان پێیان دەگوترێ: وەحیی} بەو وشەیەی خوا کە دەهاویشترێ بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) و بۆ دۆستانی خوا {کە مەبەستی پێ ئیلهامە}، بەوەش دەگوترێ وەحیی.

کە ئەویش چەند جۆرێکە، وەك فەرموودەی خوا دەیگەیەنێ:

﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ الشورى.

---

(١) أخرجه البغوي في شرح السنة (٣٠٤/٤)، والقضاعي في مسنده (١٨٥/٢).

(٢) متفق عليه.

(٣) مفردات ألفاظ القرآن، ص٨٥٨-٨٥٩.

واتە: هیچ مرۆڤێك بۆی نیە خوا بیدوێنێ، مەگەر وەحیی بۆ بنێرێ، یاخود لە پشت پەردەوە بیدوێنێ، یاخود ڕەوانە كراوێك بنێرێ، وە بە مۆڵەتی خوا پەیامی خوای پێ بگەیەنێ، بێگومان خوا بەرزی كاربەجێیە.

**ئنجا ئەو وەحییەش:**

١)- یان لەڕێی ڕەوانە كراوێكەوەیە، كە زاتەكەی دەبینرێ و، قسەكەشی دەبیسترێ، وەك جبریل (علیه السلام) كە چۆتە سەر شێوەی پیاوێكی تایبەت[١].

٢) یاخود قسەكە دەبیسترێ، بێ ئەوەی كەسەكە ببینرێ، وەك مووسا سەلامی خوای لێبێ فەرمایشتی خوای بیست، بێ ئەوەی كەس ببینێ.

٣)- یاخود بەوە كە دەخرێتە نێو دڵی، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە فەرموویەتی: (إن روح القدس نفث في روعي...)، واتە: جبریل خستیە دڵمەوە ....

٤)- یاخود بە خورپە خستنە نێو دڵ، بە ئیلهام وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ .. ﴿٧﴾ ﴾.

واتە: وەحییمان بۆ دایكی مووسا كرد، كە شیری پێ بدا، (وەحییمان بۆ كرد: یانی: ئیلهامان بۆی كردو خستمانە نێو دڵی).

٥)- یاخو بە ڕێ بۆئاسان كردن، (فێر كردن) وەك دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ.. ﴿٦٨﴾ ﴾ النحل.

واتە: پەروەردگارت وەحیی كرد بۆ هەنگ، (واتە: بە شێوەیەكی غەریزیی فێری كرد).

---

(١) بەزۆریی دەچووە سەر شێوەی (دِحية الكلبـي) خوا لێی ڕازی بێ، كە پیاوێكی شێوە جوان بووە، هەم ئوممو سەلەمە بینیویەتی، هەم ژمارەیەك لە هاوەڵان، دەیانبینی دەچووە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وایان دەزانی دیحیە بووە، دوایی پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: نەخێر ئەوە جبریل بوو هات بۆلام، بەڵام لە شێوەی ئەودا. بڕوانە: (صحيح البخاري): ٤٩٨٠.

٦)- یاخود لە ڕێی خەونەوە، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (انقطع الوحي وبقيت المبشرات: رؤيا المؤمن)، واتە: پەیامی ڕاستەوخۆ هاتن بۆ مرۆڤ، - لەلایەن خواوە - كۆتایی هاتوە، بەڵام موژدەدەرەكان دڵخۆشكەرەكان، ماون، ئەویش بریتیە لە خەونی باشی ئیماندار.

ئەو ئایەتەش ئەمانە هەموویان دەگرێتەوە:

١- هەرچی خورپەو ڕام كردن و خەونن، هەموویان دەچنە نێو ئەو فەرمایشتەی خوا كە دەفەرموێ: ( إِلَّا وَحْيًا )، وشەی وەحیی هەموویان دەگرێتەوە، كە بریتین لە فێر كردنێكی پەنهان.

٢- بیستنی پەیامی خوا، لەو فریشتەیە بێ ئەوەی كە ببینێ، ئەو ڕستەیە دەیگەیەنێ كە دەفەرموێ: (أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ ).

٣- پەیام گەیاندنی جبریل لە شێوەیەكی دیاریی كراودا ئەو قسەیەی خوا دەیگەیەنێ، كە دەفەرموێ: (أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ ) واتە: یان ڕەوانە كراوێك دەنێرێ بە فەرمانی خوا، ئەوە دەگەیەنێ كە خوا فەرمانی پێ كردوە[1].

## ٢- پێنج ئاگاداریی لەبارەی سەرچاوەكانی وەدەست هێنانی زانستەوە:

١)- مەیدانی پێنج هەستەكان و مەیدانی عەقڵیش، تەنها جیهانی ماددییە بە بینراوو نەبینراوەوە، بەبەرهەست و نابەرهەستەوە.

٢)- عەقڵ هەڵەی هەستەكان ڕاست دەكاتەوە، بۆ وێنە: قەڵەمێك بخە پەرداخێكەوە كە تەماشای دەكەی، وا دەزانی شكاوە، بەڵام دەری دەهێنی نەشكاوە، یان دوو

---

(١) لێكۆڵینەوەیەكی تێرو تەسەلم كردوە دەربارەی وەحیی لە مەوسوعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، الكتاب السادس، ص ١٨٩-٢٤٥، ط٢/ ٢٠١٦م، هەروەها لە تەفسیرە كوردییەكەشمدا لەسەرەتای سووڕەتی (یونس)دا، بە تەفصیلی لەو بارەوە قسەم كردوە.

ئاو بهێنە ئاوێكی زۆر گەرم، ئاوێكی شیلەتێن، دەست لە ئاوە گەرمەكە بخە، پاشان ڕاستەوخۆ دەست بخە نێو ئاوە شیلەتێنەكە، وا دەزانی ساردە، لە حاڵێكدا كە شیلەتێنە، بەڵام پێشیێ دەستی خستۆتە نێو ئاوی گەرم، یان بە پێچەوانەوە، بەڵام عەقڵ هەڵەی پێنج هەستەكان ڕاست دەكاتەوە.

٣) وەحییش هەڵەی عەقڵ ڕاست دەكاتەوە[1].

٤)- هەرگیز وەحیی ڕاست (یانی: كە بەتەئكید بزانین خوا فەرموویەتی) لەگەڵ عەقڵی ساغدا تێك ناگیرێن، بۆچی؟ چونكە وەحیی زانیاریی خوایە و، عەقڵیش دروستكراوی خوایە، بەڵام بەشەرتێ عەقڵەكەش ساغ بێ و وەحییەكەش ڕاست بێ، ئەوە هەرگیز تێك ناگیرێن، دروست كراوی خوا، لەگەڵ فەرمایشتی خوادا، تێك ناگیرێ.

٥)- هەڵس و كەوت لەگەڵ جیهانی نادیاردا تایبەتە بە وەحییەوە، وەحیی بە هەموو بەشەكانیەوە، بە ئیلهام و بەخەونیشەوە، ئێمە تەنها لە ڕێگای وەحییەوە دەتوانین مامەڵە بكەین لەگەڵ جیهانی غەیبدا.

كەواتە: پێنج هەستەكان كەرەستەی خاو دەخەنە بەردەستی عەقڵ، عەقڵیش بە هۆیانەوە، پاشان بەهۆی بیركردنەوەو لێك دانەوەو ئەنجامگیریی خۆیەوە، هەتا سنووری غەیب دەڕوا، لەوێ بەولاوە، وەحیی دەستی دەگرێ و دەڵێ: ئنجا نۆرەی منە، تۆ لێرە زیاتر بڕ ناكەی، هەموو فەیلەسووفەكان بە درێژایی مێژوو كە كەوتوونەتە هەڵەوە، لەبەر ئەوە بووە كە ویستوویانە بەعەقڵ مامەڵە بكەن لەگەڵ نادیار (غیب)دا، بۆیە بەهەڵەداچوون، ئەگەر سەیری فەیلەسووفەكانی یۆنان بكەین، كە دەڵێن: سوكڕات گەورەترین عەقڵی ئینسان بووە! كە بێگومان وا نیە، بەڵكو پێغەمبەران خاوەنی گەورەترین عەقڵی بەشەر بوونە، بەڵێ: سوكڕات، ئەفلاتوون، ئەرستۆ، ئەوانە بلیمەت بوون، بەڵام كاتێك ویستوویانە خوای پەروەردگار بناسێنن، زۆر بە سەیرو سەمەرەیی ناساندوویانە، ئەوەیان كە

---

(١) دواتر باسی دەكەین.

لە هەموویان عاقڵتر بووە گوتوویەتی: خوا ئەم گەردوونەی دروست کردووە بەکاری خستوە، پاشان لێی گەڕاوە، یەکی دیکە گوتوویەتی: خوا بریتیە لە ژمارە، یەکیان گوتوویەتی: خوا بریتیە لە چوار توخمەکان، (ئاوو ئاگرو گڵ و با)!! لەڕاستییدا ئینسان تەنیا کاتێك توانیویەتی مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ پەنهان و نادیاردا بکات، کە گەڕابێتەوە بۆ وەحیی، چونکە خوا سبحانە و تعالی هەر خۆی دەزانێ خۆی چۆنە؟ سیفەتەکانی چۆنن؟ فریشتەکان کێن؟ وە ڕۆژی دوایی چۆنە؟ وە دەبێ چۆن مامەڵە لەگەڵ خوادا بکرێ؟ ئەوانە تەنها خوا دەیانزانێ، بۆیە تەنها لە ڕێگای وەحییەوە دەگونجێ مامەڵە لەگەڵ پەنهان و نادیار بکەین، هەر لە خوای (متعال)ەوە بگرە، تاوەکو فریشتەکان و، ئەو شتانەشی کە پەیوەستن پێیانەوە.

### ٣ ـ وەحیی خوا تەنیا لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە:

جگە لە شیعەی دوازدە ئیمامیی، هیچ کەسێ نەبووە لەنێو مسوڵماناندا مشت و مڕ لەسەر ئەوە بکا، بەڵام شیعەی دوازدە ئیمامیی قسەی هەرکام لە ئیمامەکانیان واتە: هەر لە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبەوە خوا لێی ڕازی بێ، بگرە تاکو دەگاتە موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەریی، حەسەنی عەسکەریی کە گۆڕەکەی لە سامەڕایە گوایە کوڕێکی بووە بەناوی موحەممەد، ئەوە ئیمامی دوازدەیەمی شیعەیە، کە (غائب)ە و خۆی پەنهان کردوە، کە بەڕای من هەر بوونی نەبووە، چونکە حەسەنی عەسکەریی وەك لێکۆڵەرەوانی مێژوو و بەشێك لە شیعەکانیش دەڵێن: نەزۆك (عقیم) بووە، منداڵی هەر نەبووە، نەکوڕ نەکچ، ئەوەش هەڵبەستراوە کە گوتوویانە: کوڕێکی هەیە، بۆ ئەوەی دوازدە ئیمامەکانی پێ تەواو بکەن، کەجۆری شیعەی دیکەش هەیە گوتوویانە: حەوت ئیمامن، هەروەها هەندێکی دیکەیان گوتوویانە: پێنج ئیمامن، ئەوە دوایی لەباسی شیعەدا دەیگەینێ، گرنگ ئەوەیە هیچ کام لە زانایان جگە لە شیعە، لەسەر ئەوە مشت و مڕیان نەبووە، کە وەحیی تەنیا بریتیە لە قورئان،

پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام شیعە قسەی ئیمامەكانیشیان بە وەحیی لەقەڵەم دەدەن، چونكە ئەو ئیمامانە بە پارێزراو لە هەڵە دادەنێن، كەواتە قسەكانیان دەبنە وەحیی!!

بەڵێ وەحیی تەنیا لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، واتە: ئەو پەیامە تایبەتەی كە خوا بۆ پێغەمبەری خاتەمی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ناردوە، دوو بەشە: یەكێكیان بریتیە لە وەحیی ڕاستەوخۆی خوا، كە قورئانە، ئەوی دیكەش بریتیە لە وەحیی ناڕاستەوخۆ، كە ئەویش سوننەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، ئەوەی كە وەك دین فەرموویەتی، چونكە دوایی باسی سوننەت دەكەین، كە سوننەت هەمووی یەك شت نیەو یەك بەش نیە، بەڵكو پۆلێن دەكرێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێ شتی فەرمووە وەك دین، ئنجا ئەوەی كە وەك دین فەرموویەتی، بەتەئكید وەحیی خوایە، هەروەها هەندێ هەڵسءكەوتی دیكەی كردوون، بەڵام نەیگوتوون، وەك دین كردوونی، ئەوەش هەر وەحیی خوایە، وە هەندێ شتی دیكەش لەبەر چاوی ئەو كراوە، یاخود گوێ بیستی بووە، كە كراوەو دانی پێدا هێناوە، ئەوەش دیارە هەر بە فەرمانی وەحیی دانی پێدا هێناوە، سوننەت دەبێتەوە بەو سێ بەشە.

## ٤- پێناسەی قورئان و سوننەت:

**پێناسەی قورئان:** {القرآن: هو كلام الله المعجز بأقصر سورةٍ فيه، المتعبَّد بتلاوته، المُنَزَّل وحياً على نبينا محمد (صلى الله عليه وسلم)، المبدوء بسورة الفاتحه، والمختوم بآخر آيةٍ من سورة الناس، المنقول الينا بالتواتر}[1]، واتە: قورئان بریتیە لە فەرموودەی خوا كە دەستە وستانكەرە بە كورتترین سوورەتی، خوێندنەوەكەی عیبادەتە، لەسەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دابەزێنراوە، بە

---

(١) مباحث في علوم القرآن، القطان، ط٣ ص٢١- والثقافة الإسلامية، ص٦٤، زۆربەی زانایانی دیكەش هەر بەم شێوەیە پێناسەیان كردوە.

سوورەتی (الفاتحة) دەست پێ دەكات و، بە كۆتا ئایەتی سوورەتی (الناس) تەواو دەبێ و، بە تەواتور[١] بە ئێمە گەیشتوە[٢].

**پێناسەی سوونەت:** {السنة: ما صدر عن النبيِّ محمد صلى الله عليه وسلم، باعتباره مُبَلِّغاً عن الله تعالى، من قولٍ أو فعلٍ أو تقريرٍ أو صفة خُلُقية، من مبدأ بِعْثتهِ حتّى وفاتهِ}[٣]، واتە: سوننەت ئەوەیە كە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەرچووە لەو ڕووەوە كە گەیەنەری ئایینی خوایە، {یانی: لەو ڕووەوە كە وەك ئایین لەلایەن خواوە گەیاندویەتی}، لە فەرموودەی و، كردەوەی و، دانپێداهێنانی و، سیفەتی ئاكاریی خۆی، هەر لەسەرەتای ڕەوانە كرانیەوە، تا كۆچی دوایی.

(عبدالله بن یوسف الجدیع) دەڵێ: {السنّة: ما صدر عن رسول الله غير القرآن، من قول أو فعل أو تقرير}[٤]، واتە: سوننەت ئەوەیە كە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەرچووبێت، لە قسەو كردەوەو دان پێداهێنان، جگە لە قورئان، هەمووی پێی دەگوترێ سوننەت.

بەندەش لەبارەی پێناسەی سوننەتەوە دەڵێم: (السنه هي طريقة النبيِّ الخاتم صلى الله علية وسلم لتطبيق القرآن الكريم وتجسيده على أرض الواقع او كيفيَّةُ) واتە: (سوننەت) بریتییە لە جێبەجێكردنی پێغەمبەری كۆتایی لەسەر ئەرزی واقیع و چۆنیەتییەكەی.

---

(١) تەواتور: واتە ژمارەیەكی زۆر لە خەڵك شتێك ببینن، یان ببیستن، نەقڵی بكەن بۆ ژمارەیەكی زۆری دوای خۆیان، ئەوانیش بۆ ژمارەیەكی زۆری دوای خۆیان، كە مەحاڵ بێ ئەوانە لەسەر هەڵە، یان لەسەر درۆ كۆببنەوە.

(٢) من لە كتێبی (با لەخزمەت قورئاندا بین) بە تەفصیل باسم كردوە كە قورئان چۆن نووسراوەتەوە، وە بەچەند قۆناغ كۆ كراوەتەوە؟.

(٣) دراسات في الفكر العربي الإسلامي، ط٥ ص٨٧-٩٠. والثقافة الإسلامية، ص ٦٩. هەردووكیان هێناویانە.

(٤) تيسير أصول الفقه، عبدالله بن يوسف الجديع، ص١١٧.

٥- خوا سبحانه و تعالى لە زۆر ئایەتدا باسی قورئانی كردوە، كە فەرمایشتی خۆیەتی و بۆ پێغەمبەری خوای (صلى الله علیه وسلم) ناردوە، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (الواقعة) ئایەتەكانی (٧٥-٨٠)دا دەفەرموێ:

﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾﴾ [1] الواقعة.

واتە: نەخێر، سوێند دەخۆم بە شوێن و جێگاو ڕێگای ئەستێرەكان، ئەوەش ئەگەر بزانن، سوێندێكی مەزنە[2]، (سوێند بەوە) بێگومان ئەو قورئانە قورئانێكی بەڕێزە (یان بەخشندەیە)، لەنووسراوێكی شێردراوەدایە {كە مەبەست پێی (لوح المحفوظ)ە، یاخود لە زانیاری ئەزەلیی خوادایە}، پاككراوەكان نەبێ، دەستیان نایگاتێ[3].

٢- لە سوورەتی (الشعراء) ئایەتی (١٩٢-١٩٧)دا، خوا ئاوا پێناسەی قورئان دەكات:

---

(١) لێرە شتێكتان بۆ ڕوون بكەمەوە كە دەفەرموێ: (فَلَآ) لە هەموو قورئاندا كە دەفەرموێ: (فَلَآ) ئەو (لا)یە نەفی سوێندەكە نیە، هەر چەندە زۆر لە تەفسیرەكان بە نەفی سوێندیان داناوە، بەڵام من ڕام وایە بە پێچەوانەوە: خوا نەیویستوە بفەرموێ: سوێند ناخۆم، بەڵكو ئەو (لا)یە بۆ نەفی قسەیەكە كە كافرەكان كردوویانە، (فَلَآ) یانی: نەخێر وانیە ئەوەی ئێوە دەیڵێن، بەچی دەزانین؟

دوایی دەفەرموێ: (وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ) واتە: ئەگەر ئێوە بزانن، ئەوە سوێندێكی مەزنە، كەواتە: ئەوە سوێندە.

(٢) ئێستا كە گەردووناسیی پێشكەوتوە، دەزانین ئەو سوێندە چەند گەورەیە.

(٣) كافرەكان عادەتیان وابوو پێغەمبەریان (صلى الله علیه وسلم) بەوە تۆمەتبار دەكرد، كە شەیتانەكان فێری قورئانی دەكەن، خواش دەفەرموێ: (لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ) واتە: ئەم قورئانە تەنیا فریشتە زۆر پاكەكان دەستیان دەیگاتێ، كە بیهێنن بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم).

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ
ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن
يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ ﴾ الشعراء

واتە: بێگومان ئەم قورئانە دابەزێنراوە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەکانەوە، گیانی ئەمیندار (الروح الأمين) دایبەزاندوە[1]، دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، تاکو تۆ لە وریاکەرەوەو هۆشیار کەرەوان بی، بە زمانێکی عەرەبی ڕۆشن[2]،ئەم قورئانە لەکتێبە پێشووەکانیشدا هەیە، ئایا بۆ ئەوانن نیشانەو بەڵگە نیە {کە قورئان کتێبی خوایە بۆتۆ هاتوە}، کە زانایانی بەنو ئیسرائیلیش دەیزانن![3].

---

(١) چەند ناوێك بەکار هێنراون بۆ جیبریل، {جبريل، الروح القدس، الروح الأمين، الروح}.

(٢) هەر وشەی (عربي) یانی ڕۆشن، (اللغة العربية) یانی: ئەو زمانەی کە ڕۆشنە، نەتەوەی عەرەب زمانی خۆیان زۆر پێ ڕۆشن بووە، ناویان لە زمانەکانی دیکە ناوە (عجمي)، یانی زمانێکی ناڕۆشن، چونکە تێی نەگەیشتوون، ئنجا هەر کەسێك زمانی خۆی پێ ڕۆشنەو، زمانی بەرامبەرەکەی کە تێی ناگات، پێی ناڕۆشنە، دەگوترێ: (أعرب عن لسانه) یان (أعرب عن قلبه)، {يعني أفصح}.

لە فەرموودەی پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دا هاتوە، لەبارەی مارە کردنی کچ و بێوەژنەوە، دەفەرموێ: {الثَّيِّبُ تُعْرِبُ عَنْ نَفْسِهَا وَالْبِكْرُ رِضَاهَا صَمْتُهَا}، أخرجه أحمد برقم (١٧٧٥٨) ، وابن ماجه برقم (١٨٧٢)، والطبراني برقم (٢٦٤)، وأخرجه أيضا: ابن قانع (٢٩١/٢) ، والبيهقي برقم (١٣٤٨٤) ، والديلمي برقم (٢٥٥٨)، قال الألباني صحيح ١٤٥٩، واتە: بێوەژن دەبێ بۆخۆی قسەی خۆی بکا، داخۆ ڕازییە یان ڕازیی نیە؟ بەڵام کچ ئەگەر بێدەنگ بوو (لەبەر ئەوەی شەرم دەکا) نیشانەی ڕازی بوونیەتی.

کەواتە: (تُعْرِبُ) واتە: ڕوونی دەکاتەوە.

(٣) بۆ زانیاریتان! باسی ئەم قورئانە ئێستاش لە پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێدا هەیە، لەگەڵ ئەو هەموو دەستکاریی کرانەشدا کە کراوە، هەندێ وەصف بەکار هاتوون بۆ کۆتا پێغەمبەر کە دێ، وە باسی ئەو کتێبە کراوە کە بۆی دەنێردرێتە خوار، تەنها بەسەر قورئاندا دەچەسپن.

## ٢ـ بەڵگەكانی سەرچاوە بوونی سوننەت بۆ شەریعەت

**براو خوشكە بەڕێزەكان!**

لەم ڕۆژگارەی ئێستای ئێمەدا كەسانێك هەن، دەیانەوێ گومان و دوودڵیی لەنێو مسوڵمانانیدا دروست بكەن بەرامبەر بە سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئنجا لەو بارەوە، لێكۆڵینەوەیەكی باشم كردوەو، پێنج بەڵگەم هێناونەوە لەسەر ئەوەی سوننەت[1] سەرچاوەی دووەمی شەریعەتە:

**یەكەم:** بەڵگەی قورئانیی: (١٥) بەڵگەی قورئانییم هێناونەوە.

**دووەم:** یەكدەنگیی هاوەڵان (إجماع الصحابة).

**سێیەم:** بەڵگەی عەقڵیی.

**چوارەم:** بەڵگەی سوننەت.

**پێنجەم:** هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەكانی ئەوانەی نكوولیيان كردوە، لەوەی سوننەت سەرچاوەی شەریعەت بێ.



---

(١) دیارە سوننەت لەقەدەر خۆی، چونكە سوننەت نایەتە ڕیزی قورئان، بەڵام لە مەقامی خۆیدا، دووەمین سەرچاوەی وەحییە و، دووەمین سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی شەریعەتە، لەدوای قورئان.

١- بەڵگە قورئانییەكان :

بەڵگەی یەكەم: خوا سبحانه و تعالى فەرمانی بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) كردوە كە قورئان بۆ خەڵك ڕوون بكاتەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

واتە: (ذكر)مان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاكو ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بكەیەوە، وە بۆ ئەوەی خۆشیان بیر بكەنەوە.

كەواتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەركی سەرشانی بووە لەوە كە قورئان ڕوون بكاتەوە بۆ خەڵك، ئنجا ئایا قورئان چۆن ڕوون كراوەتەوە؟[1]، لە ڕاستییدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە میانی سوننەتەكەی خۆیدا، لە میانی پراكتیزە كردنی قورئاندا لەسەر ئەرزی واقیع، قورئانی بۆ ئێمە ڕوون كردۆتەوە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دانەنیشتوە تەفسیرێك بنووسێ بۆ قورئان، ئەگەرنا ئێمە ئێستا (التفسير النّبوي للقرآن الكريم)مان لەبەر دەستدا دەبوو، ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئایەت بە ئایەتی ڕوون كردۆتەوە؟ نەخێر، چونكە قورئان بۆخۆی ڕۆشنە لەچەند شوێنان خوا دەفەرموێ: (كتابٍ مبين)، (قرآنٍ مبين)، كەواتە: قورئان بۆخۆی ڕۆشنەو، پێویستیی بە ڕوون كردنەوە ناكات، ئەدی پێویستیی بە چی دەكا؟

پێویستی بەوە دەكات كە چۆنیەتیی جێ بەجێ كردنەكەی ڕوون ببێتەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەتەواویی ئەو ئەركەی ئەنجام داوە، كەواتە: چۆن دەتوانرێ بێ نیازیی بەرامبەر بە سوننەت دەرببڕدرێ، لەكاتێكدا كە سوننەت بۆمان ڕوون دەكاتەوە: چۆن قورئان كاری پێ دەكرێ؟!

-----

(١) هەڵبەتە دواییش دێمەوە سەر ئەو باسە.

**بەڵگەی دووەم:** خوا فەرمانی کردوە بەوە کە فەرمانبەریی بۆ پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بکرێ، لەچەند شوێناندا، بۆ وێنە:

﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾ النور.

واتە: نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن و وە فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، بۆ ئەوەی بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ.

**بەڵگەی سێیەم:** هەروەها خوا سبحانە و تعالی خۆشەویستی خۆی پەیوەست کردوە بە شوێن کەوتنی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم):

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ .. ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن.

هەڵبەتە شوێن کەوتنی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) یانی شوێن کەوتنی ڕێبازەکەی، کەواتە: کەسێك شوێن ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەکەوێ، نەدەتوانێ ئیسپاتی بکا کە خوای خۆش دەوێ، وە نە خوای پەروەردگاریش خۆشی دەوێ.

**بەڵگەی چوارەم:** خوا عز وجل فەرمانبەری کردن بۆخۆی، وە بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی (صلی الله علیه وسلم) بەیەکەوە جووت کردوون، بۆ وێنە:

أ- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ .. ﴿٥٩﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر {ی خوا} بکەن.

فەرمانبەریی خوا بکەن، بە شوێن کەوتنی قورئان و، فەرمانبەریی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەن بە شوێن کەوتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

ب- ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بڵێ فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، خوا بێ بڕوایانی خۆش ناوێن.

واتە: ئەوەی پشت لە پێغەمبەر بکات (صلى الله عليه وسلم) و، پشت لە خوا بکات، بە بێ بڕوا لەقەڵەم دەدرێ.

ج- هەروەها خوا عز وجل دەفەرموێ: ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ ﴾ النساء.

واتە: هەر کەس فەرمانبەریی پێغەمبەر بکات، ئەوە فەرمانبەریی خوای کردوە.

بەڵگەی پێنجەم: خوا فەرمانی کردوە کە حوکم و دادوەریی - لەکاتی ناکۆکیی و تێك گیراندا - بگێڕدرێتەوە بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، واتە: بۆ لای قورئان و سوننەت، وەك دەفەرموێ:

﴿ ..فَإِن تَنَـٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۚ. ﴿٥٩﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئنجا ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە ناکۆکیی، بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر واتە: بۆ لای قورئان و بۆ لای سوننەت.

بەڵگەی شەشەم: خوا سبحانە وتعالى باسی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) کردووە وەك یاسا دانەر، وەك دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَـٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَـٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ.. ﴿١٥٧﴾ ﴾ الأعراف.

لێرەدا خوای زانا بەشەش سیفەت پێناسەی پێغەمبەری خۆی (صلی الله علیه وسلم) دەكات:

**یەك:** فەرمانیان پێ دەكات بە چاكە.

**دوو:** رێگرییان لێ دەكات لە خراپە.

**سێ:** شتە باش و سوود بەخشەكانیان بۆ حەڵاڵ دەكات.

**چوار:** شتە زیان بەخشەكانیان لێ قەدەغە دەكات.

**پێنج:** ئەو بارە قورسەی سەرشانیان لادەبات.

**شەش:** ئەو كۆت و زنجیرانەی لە دەست و پێیانە، دەیانپسێنێ.

وەك دەبینین: خوا سبحانە و تعالی پێغەمبەری خۆی (صلی الله علیه وسلم) وەك یاسا دانەرو حەڵاڵكەرو حەرامكەر پێناسە كردوە، ئنجا ئایا ئەو حەڵاڵ كردن و، حەرام كردن و، فەرمان پێ كردن و، قەدەغە كردنە، لە كوێن؟! بە دڵنیایی لە سوننەتەكەیدان.

**بەڵگەی حەوتەم:** خوا سبحانە و تعالی خەڵكی ترساندوە لەوەی كە سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر بكەن و، هەڕەشەی لێكردوون بەوەی كە تووشی ئاژاوەو توشی سزا دێن، دەفەرموێ:

﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾ النور.

لێرەدا (دُعَآءَ) بە مانای بانگ كردنە، واتە: بانگ كردنی پێغەمبەر لە بەینتاندا {كە بانگتان دەكا}، وەك بانگ كردنی هەندێكتان بۆ هەندێكتان تەماشا مەكەن، خوا ئەوانەتان دەزانێ كە بە خۆپەنهان كردنەوە، خۆ دەدزنەوە، با ئەوانەی سەرپێچیی لە فەرمانی پێغەمبەر دەكەن بترسێن و وریا بن كە بەڵایەكی بە ئێشیان تووش نەیەت، یاخود سزایەكی بە ئێشیان تووش نەیەت.

ئنجا ئایا سەرپێچیی كردن لە فەرمانەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، چۆنەو ئایا فەرمانەكەی لەكوێدایە؟! بە دڵنیایی لە سوننەت دایە، ئەمما فەرمانی خوا لە قورئاندایە.

**بەڵگەی هەشتەم:** خوا فەرمانی كردوە كە هەرچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێمان دەدات، لێی وەربگرین، چ فەرمانكردن، بێ چ قەدەغە كردن (أمراً أو نهیاً)، وەك دەفەرموێ:

﴿ ...وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ .. ﴿٧﴾ ﴾ الحشر.

واتە: هەرچی پێغەمبەر پێتان دەدا، لێی وەربگرن، وە هەرچی لێتان قەدەغە دەكات، خۆتانی لێ بەدوور بگرن.

هەر ئەم ئایەتە بۆخۆی بەسە لەسەر ئەوە كە ئەوەی كە دڵنیا بووین، لە ڕێیەكی ڕاستەوە دڵنیا بووین، كە ئەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی، فەرزە پابەندی بین، خوا دەفەرموێ: هەرچی پێغەمبەر پێتان دەدا، لێی وەربگرن، {لە ئەرك و فەرمان}، وە هەرچی ئەویش لێتان قەدەغە دەكا دەستی لێ هەڵبگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، {لە نەهی قەدەغە}.

**بەڵگەی نۆیەم:** خوا فەرمانی كردوە كە هەر دادوەرییەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كردی، بڕواداران پێی ڕازیین:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: هیچ پیاوێكی بڕواداروهیچ ئافرەتێكی بڕوادار، بۆیان نیە هەر كاتێك خوا وە پێغەمبەری خوا بڕیارێكیان دا، مافی سەرپشك بوون بەخۆیان بدەن، {ئایا ئەو بڕیارە كە خوا داویەتی، یان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەری بگرن، یان وەری نەگرن؟ بەڵكو دەبێ یەكسەر جێبەجێی بكەن}، وە هەر كەسێك سەرپێچیی لە خواو پێغەمبەری خوا بكات، بەشێوەیەكی زۆر ئاشكرا گومڕا بووە.

**بەڵگەی دەیەم:** خوا ئیمانی لەو کەسە لابردوە، کە ڕەفزی ئەوە دەکات، فەرمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جێ بەجێ بکات، دەفەرمویێ:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء.

واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگاری تۆ: بە بڕوادار لەقەڵەم نادرێن، بڕواناهێنن، تاکو تۆ نەکەنە دادوەر لەوەدا کە تێیدا دەکەونە کێشەو مشت و مڕ، دواییش ملکەچ نەبن، وە دوایی بەتەواویی بەدڵ و گیان ئەو فەرمانەی تۆ پەسەند نەکەن.

**بەڵگەی یازدەیەم:** هەموو پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بۆیە نێردراون تاکو فەرمانبەرییان بۆ بکرێ، وەك خوا دەفەرمویێ:

﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ ..﴿٦٤﴾ ﴾ النساء.

واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر بۆ ئەوە کە بە مۆڵەتی خوا فەرمانبەریی بۆ بکرێ.

**بەڵگەی دوازدەیەم:** خوا فەرمانی پێمان کردوەکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەینە سەرمەشقمان لە هەموو کارو بارێکدا، وەك دەفەرمویێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا، سەرمەشقییەك و پێشڕەوییەکی زۆر باش هەیە، بۆ ئێوە بۆ هەرکەسێکتان کە بە ئومێدی بەزەیی خواو پاداشتی دوارۆژ بێ، وە زۆر یادی خوا بکات.

**بەڵگەی سێزدەیەم:** خوا سبحانە و تعالی پەیمان بەستن لەگەڵ پێغەمبەردای (صلی الله علیه وسلم) - کە بۆ ئەوە بووە بە قسەی بکەن - وەك پەیمان بەست لەگەڵ خۆی داناوە:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾﴾ الفتح.

واتە: بێگومان ئەوانەی كە پەیمان لەگەڵ تۆدا دەبەستن، پەیمان لەگەڵ خوادا دەبەستن، دەستی خوا لەسەر دەستی وانەوەیە، هەر كەسێك پەیمان هەڵبوەشێنێتەوە، بە زیانی خۆی تەواو دەبێ، وە هەركەسێ پەیمانەكە بباتە سەر، خوا پاداشتێكی مەزنی دەداتێ.

ئنجا ئایا: پەیمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بەستن چۆن بووە؟، جاری وا هەبووە پەیمانیان لەگەڵدا بەستوە، وەك لەژێر درەختی (رضوان)دا، كە ئەم ئایەتە لەو سیاقەدا هاتە خوار كە دەفەرموێ:

﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ .. ﴿١٨﴾﴾ الفتح.

واتە: خوا ڕازی بووە لەو بڕوادارانەی كە لەژێر درەختەكەدا پەیمانیان لەگەڵ تۆدا بەست.

پەیمانی چییان بەست؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە نوێنەرایەتیی خۆی عوسمانی نارد بۆ مەككە، كە لەگەڵ قوڕەیشییەكاندا ڕێك بكەوێ، كەچی هەواڵی بۆ هاتەوە گوتیان: عوسمانیان كوشتوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەگەر ئەو هەواڵە ڕاست بێ، ئێمە لێرە لاناچین، هەتا جەنگیان لە دژ نەكەین، وەرن بەیعەتم پێ بدەن، ئیدی بەیعەتیان پێدا {واتە: بەیعەتی جەنگ كردن}[1]، كەچی خوا سبحانە و تعالى ئەو پەیمانەی كە لەگەڵ پێغەمبەردا بەستراوە، دەفەرموێ: ئەوە لەگەڵ من بەستراوە، ئنجا دیارە هەموو فەرمانبەرییەكانی دیكەی مسوڵمانانیش بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە هەمان كاتدا فەرمانبەریشن بۆ خوا، ئنجا ئایا فەرمانبەرییەكان بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەكوێدا هەن؟ بە دڵنیایی لە سوننەتدا هەن.

---

(١) بڕوانە: السيرة النبوية، لابن هشام، ج٣ ص٣٢٩ ، ٣٣٠.

بەڵگەی چواردەیەم: كە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ..﴿٦٥﴾ ﴾ النساء.

پێشەوا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێبێ، تەفسیرێكی زۆر جوانی دەكات دەڵێ: {نزلت هذه الآية فيما بلغنا والله أعلم في رجل خاصم الزبير في أرض فقضى النبيُّ بها للزبير، وهذا القضاء سُنَّةٌ من رسول الله، لا حُكْمٌ منصوص في القرآن}[1]، واتە: ئەو ئایەتە دەربارەی مشت و مڕێك هاتە خوار كە پیاوێك لەگەڵ زوبەیر بوو بە مشت و مڕیان لەسەر زەوییەك وەك پێمان گەیشتوە خواش زاناترە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بڕیاری دا بۆ زوبەیر، {كە حەقی زوبەیرە}، ئنجا ئەو بڕیارەش سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو چونكە لە قورئاندا نەهاتوە.

كە دەڵێ: (لا حكم منصوص في القرآن) قسەیەكی زۆر وردە دەڵێ: حوكمێك نیە وەك دەقێك هاتبێ لە قورئاندا، كەچی خوا سبحانه و تعالى سوێندی خواردوە بەخۆی و دەڵێ: سوێند بە پەروەردگارت بڕوا ناهێنن، تاكو تۆ نەكەنە دادوەر لەو شتەدا كە لەسەری دەكەونە كێشەو مشت و مڕ[2]، دەڵێ: ئەم بەسەر هاتە لە سوننەتی پێغەمبەر دایە (صلى الله عليه وسلم)، كەچی خوا ئەو حوكم و بڕیارەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) باس كردوە، ئنجا ئایا لەكوێدا

---

(١) الرسالة ص ١١٥.

(٢) مەسەلەكە ئاوابوو: زوبەیر زەوییەكی هەبوو لەلای كانی و سەرچاوەكەوە بوو، پیاوێكی ئەنصارییش زەوییەكی دیكەی هەبوو لەولاوە بوو، ئنجا بەپێی عورف وایە، ئەوەی كە لە سەرچاوەكەوە نزیكە، كشت و كاڵەكەی خۆی ئاو بدا، پاشان ئاوەكە بەربداتەوەو ئەوەی دیكەش ئاوی بدا، ئنجا كە بوو بە كێشەیان، چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموی: زوبەیر كشت و كاڵەكەی خۆت ئاوبدە، پاشان ئاوەكە بەردەوە با ئەویش هی خۆی ئاو بدە، ئەو پیاوە ئەنصارییەش خوا لێی خۆشبێ گوتی: ئەوە لەبەر ئەوەی خزمی خۆتە! پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) توورە بوو فەرمووی: زوبەیر تاكو كشت و كاڵەكەت تەواو تێر ئاو دەبێ، ئنجا ئاوەكە بەردەوە، جاری پێشێ فەرمووی: ئاوی بدەو ئنجا بەری بدەوە، بەڵام كابرا كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ی توورە كرد، ئەوجار ئەو حەقەكەی بەتەواویی دا بەزوبەیر، جا بەم بۆنەیەوە، ئەو ئایەتە هاتە خوار. (ئەم بەسەرهاتە بوخاریی و نەسائیی و حاكم) هێناویانە، بڕوانە: المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ٣٠٥.

هاتوە؟ لە سوننەتدا هاتوە، وە دەشفەرمویٚ: هەرکەسیٚ بە بڕیاری تۆ ڕازی نەبیٚ، بە ئیماندار لەقەڵەم نادریٚ، چ ئەم بڕیارە، چ هەر بڕیارێکی دیکەی کە لە سوننەتدا هەیە، بەدەقی ئایەت ئەوە هەمووی خوای کارزان دەیکاتە پێوەرو تەرازوو بۆ ئیمان، یانی: ئەگەر بە بڕیارەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕازی نەبی، مانای وایە بە ئیماندار لەقەڵەم نادرێی.

بەڵگەی پازدەیەم: خوا سبحانه و تعالی ڕایگەیاندوە کە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) خەڵك ڕێنمایی دەکات بەرەو ڕاستە شەقامی خوا، وەك دەفەرمویٚ:

﴿ ..وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الشورى.

واتە: وە بێگومان تۆ ڕێنمایی دەکەی بەرەو ڕاستە شەقام، ڕێی خوا، ئەو خوایەی کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، وە هەرچی کە تێیاندا هەیە، ئاگاداربن کارو بارەکان هەر بۆ لای خوا دەڕۆن.

پێشەوا شافیعی هەر لەو بارەشەوە دەڵیٚ: {وما سَنَّ رسولُ الله فيما ليس لِلّهِ فيه حكم فَبِحكم الله سَنَّهُ}[1]، واتە: هەرچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دایناوە، مادام حوکمی خوای لەبارەوە نەبیٚ، ئەوە بە حوکمی خوا ئەو بڕیارەی داوە.

لەبواری حەلاڵ و حەرام و ئەمرو نەهییدا، ئەگەر شتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەبارەیەوە دڵنیا نەبوویٚ، ڕاوەستاوە داخۆ خوا چی دەفەرمویٚ؟ بەڵام کە بڕیارێکی دابیٚ: ئەوە حەلاڵەو ئەوە حەرامە، ئەوە بکەن و ئەوە مەکەن، ئەوە بە تەئکید خوا پێی فەرمووە، دوایی ڕوونی دەکەینەوە کە چۆنی فەرمووە؟ کە یان هەر لە قورئان وەری گرتووە، یان خوا خستوویەتە دڵی، یاخود ئیجتیهادی کردوە.

ئەمە وەك بەڵگەی یەکەم: ئایەتەکانی قورئان، لەسەر ئەوە کە سوننەتی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بە گشتی بەوەحی دادەنرێ، وە بەبەشێك لە شەریعەت دادەنریٚ.

---

(١) (الرسالة) ص ١١٩.

## ٢- بەڵگەی یەکدەنگیی هاوەڵان لەسەر ڕەوایەتیی سوننەت

هاوەڵان (الصحابة)، خوا لێیان ڕازی بێ بە پیاوو ئافرەتەوە یەکدەنگ و یەکڕاو یەك قسە بوون، کە ئەوەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆی داناون لە دین و شەریعەت، وەك ئەوەی خوا فەرموویەتی لە قوڕئاندا، بۆ ئەوان پابەندکەر (مُلْزِم)ە، هەڵبەتە هەم ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ژیاندا بووە، هەم دوای مردنیشی، هیچ کەسێ نەبووە لە هاوەڵان ڕیز پەڕ بێ لەو یەکدەنگییە، کە بۆیان دەرکەوتبێ، ئەوە سوننەتی[١] پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، بەدەیان بەڵگە هەیە کەهەر شتێکیان هاتبێتە پێش، تەماشای قوڕئانیان کردوە، لە قوڕئاندا حوکمەکەیان چنگ کەوتبێ، باشە، ئەگەرنا پرسیویانە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە چی فەرمووە؟ یاخود چی کردوە؟ ئەگەر لەوێشدا چنگیان نەکەوتبێ، ئەوە کۆششیان کردوە، وە لەو بارەوە ئەم دەقە هەیە کە بۆتان دەهێنم، هەرچەندە زانایان مشت و مڕیان لەسەر سەنەدەکەی هەیە، بەڵام هیچ کەس مشت و مڕی نەبووە لەسەر ئەوە، کە نێوەڕۆکەکەی ڕاستە:

{عَنْ مُعَاذٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ كَيْفَ تَصْنَعُ إِنْ عَرَضَ لَكَ قَضَاءٌ؟ قَالَ: أَقْضِي بِمَا فِي كِتَابِ اللَّهِ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي لَا آلُو، قَالَ: فَضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَدْرِي، ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمَا يُرْضِي

---

(١) سوننەت بەمانا فیقهییەکەی نا، چونکە وشەی سوننەت، لە زاراوەی شەرعزاناندا واتە: (مندوب، ندب، نفل، تطوع)، ئەو شتەی کە بەرامبەری واجبە، بەڵام لە زاراوەی فەرموودە ناساندا، وە لەزاراوەی زانایانی (أصول الفقه)دا سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) واتە: ڕێبازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە گشتی، واتە: هەم فەرزو هەم سوننەت.

رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ } أخرجه أحمد برقم (٢٢٠٦٠) والترمذي برقم (١٣٢٧)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لإبهام أصحاب معاذ وجهالة الحارث بن عمرو.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موعاذی كوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن، وەك والی و سەرپەرشتیار، كە ناردی فەرمووی: ئەگەر كێشەیەكت هاتە پێش چی دەكەی؟

موعاذ گوتی: بەپێی كتێبی خوا، تەماشای قورئان دەكەم.

گوتی: ئەگەر لە كتێبی خوادا حوكمەكەت نەدۆزیەوە؟

موعاذ گوتی: تەماشای سوننەتی پێغەمبەری خوا دەكەم.

گوتی: ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا نەتدۆزییەوە؟

گوتی: عەقڵی خۆم بەكار دەهێنم و كەمتەرخەمیی ناكەم.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەستی لە سنگی دا وە فەرمووی: ستایش بۆ خوا یەك كە نێردراوی پێغەمبەری خوای سەركەوتوو كردوە، بۆ شتێك كە پێغەمبەری خوا لێی ڕازییە.

ئنجا وەك گوتم: هەرچەندە ئەم دەقە لەبارەی سەنەدەكەیەوە مشت و مڕ هەیە، بەڵام یەكێ لە زانایانی فەرموودەناسی هاوچەرخ كە پێم خۆشە كتێبەكانی بخوێننەوە، بەڕاستی لێكۆڵینەوەی جوان جوانی هەن، ئەویش (عبدالله بن یوسف الجدیع)ە، كە ئێستا لە بەریتانیا دادەنیشێ، لە كتێبێكیدا بەناوی: (تیسیر أصول علم الفقه) دەڵێ: (وضعَّفه المحَقِّقون من أهل الحديث، ولكن ضَعف الحديث لا يؤثر في ترتيب الأدلة المذكورة فإنَّ أُصولَ الشَّريعة دلَّت عليه، وهو المنقول من أصحاب النبـي صلى الله عليه وسلم وذلك بتقديم الوحي أولاً على الرأي والوحي كتاب وسنة، والسنة تابعة للقرآن حيث أنها مبينة له، ودرجة التابع لا تصلح أن تكون مساويةً للمتبوع، فضلاً عن أن تسبقه، كيف؟ والقرآن كلام ربِّ العالمين، وأمّا مرتبة النظر والإستنباط فحيث لا يكون الوحي)، (واتە: هەرچەندە لێكۆڵەرەوان لە بواری

فەرموودەناسییدا، بە بێهێزیان داناوە، بەڵام بێهێزیی سەنەدی ئەو فەرموودەیە، کاریگەریی نیە بۆ سەر ڕیزبەندیی بەڵگە شەرعییەکان بەو شێوەیە کە هاتوە، {پێشێ قورئان، ئنجا سوننەت، ئنجا ئیجتیهاد}، چونکە بنچینەکانی شەریعەت هەر خوازیاری ئەوەن و هەر ئەوە دەگەیەنن، وە هەر ئەوەش لە هاوەڵانەوە نەقڵ کراوە، وەحی پێشدەخرێ، ئنجا دوایی عەقڵ، وە وەحی بریتیە لە قورئان و سوننەت، وە سوننەتیش شوێن قورئان دەکەوێ، لەبەر ئەوەی سوننەت قورئان ڕوون دەکاتەوە، {واتە: چۆنیەتی کار پێکردنی ڕوون دەکاتەوە}، وە دەبێ هەمیشە ئەوەی شوێن ئەویدیکە دەکەوێ، پلەکەی لەخوار ئەوەوە بێ، نەك وەك ئەو بێ، چ جای پێشیشی بکەوێتەوە!! چۆن وانابێ، لە کاتێکدا قورئان فەرمایشتی پەروەردگاری جیهانییانە، بەڵام پلەی تەماشا کردن و لێ ورد بوونەوە، ئەوە بەتەئکید کاتێك دێ کە وەحی نەبێ)[1].

---

(١) ئەو قسەیە بۆیە دەکا چونکە هەندێ لە سەلەفییەکان ئەوانەی خۆیان بە ئەهلی فەرموودەو شوێنەوار (أثر) دەزانن، کاتی خۆشی بوون و ئێستاش هەن، دەڵێن: (السنة قاضية على القرآن) واتە: سوننەت بەسەر قورئانەوە بڕیار دەدا، کە ئەوە شتێکی زۆر زۆر بێ مەعنایە، چونکە خوا سبحانه و تعالى پێغەمبەری خۆی (صلى الله عليه وسلم) ناردوە قورئانی بۆ ناردوە وەك کتێبء بەرنامە، وەك مەتنی ئیسلام، ئنجا سوننەت وەك دوایی باسی دەکەم، لە ڕاستیدا هەر بریتیە لە جێبەجێ کردنی قورئان، بەڵێ هەندێ شت لە سوننەتدا هەیە لە قورئاندا نییە، بەڵام ئەویش لە سیاقی ئەو ڕاستییانەدایە کە لە قورئاندا هەن، وە هەرگیز لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) شتێك نیە، کە لەگەڵ قورئاندا ناکۆك بێ، هەرگیز شتی وا نیە، ئەگەر هەبێ ئەوە سوننەت نیە، بەڵام بەمەرجێك دوای ساغ کردنەوە بێ، نەك کە هەندێ شت بە عەقڵی هەندێ کەس، لەگەڵ قورئاندا تێکگیرا یەکسەر ڕەفزی بکەی، نا، ئەوەش خەڵکی خۆی هەیە، وە دواتر باسی دەکەین.

## ٣- بەڵگەی عەقڵیی لەسەر ڕەوایەتیی سوننەت

لەسەر ئەوە كە سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە گشتی بەوەحی دادەنرێ، وە بەبەشێك لە شەریعەت، لەو بارەوە سێ بەڵگەی عەقڵیی دێنمەوە:

**بەڵگەی یەكەم:** لە قورئاندا چەند ئەركێك فەرز كراون، بە كورتیی (إجمال) باسكراون و پێویستییان بە ڕوونكردنەوە هەیە، چۆنیان جێبەجێ بكەین؟

**بۆ نمـــوونە:**

**١)**- لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٥٦)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾.

واتە: نوێژ بەرپا بكەن و زەكات بدەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر بكەن، بەڵكو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ.

**٢)**- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٩٦)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ... ﴿١٩٦﴾ ﴾، واتە: وە حەج و عومرە بۆ خوا تەواو بكەن.

باشە ئێمە چۆن نوێژ بكەین؟ وشەی: (ٱلصَّلَوٰةَ) لە زمانی عەرەبیدا یانی: (الدعاء)، بۆ وێنە: خوا سبحانه و تعالى باسی باڵندەكان دەكات، دوایی دەفەرموێ:

﴿ ...كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ .. ﴿٤١﴾ ﴾ النور.

ئنجا ئایا ئێمە چۆن بزانین: ئەو (ٱلصَّلَوٰةَ)ەی خوا لە ئێمەی دەوێ، كامەیە[1]؟

---

(١) بۆخۆشیی ئەمە دەگێڕمەوە: ماوەیەك لەمەوبەر یەكێك كەوتبووە ژێر كاریگەریی ئەو قسەو قسەڵۆكانەوە ئەوانەی كە ناویان لە خۆیان ناوە قورئانیی، گەنجێك بوو زۆر شارەزاش

نەبوو، گوتم: باشە ئێمە چۆن نوێژێ بکەین؟
گوتی: نوێژ بەمانای (الدعاء) نیە؟
گوتم: با.
گوتی: ئێمەش دوعا دەکەین.
گوتم: هەر دوعاو بەس؟
گوتی: بەڵێ.
گوتم: ئەدی ئەو پێنج فەرزە؟
گوتی: ئنجا ئەوە کێ دەڵێ: وایە؟ خوا فەرموویەتی: نوێژێ بکەن، نوێژیش یانی: دوعا، تەواو.
گوتم: ئاخر هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، نە یەك بووە، نە دوو بووە، سەد نەبووە، نە هەزار نەبووە، لە حەجی ماڵئاواییدا هەندێ دەڵێن: (١٢٠،٠٠٠) هاوەڵ لە خزمەت پێغەمبەردا حەجیان کردوە، لەنێو ئەو هەمووە خەڵکەدا نوێژی کردوە.
گوتی: ئەوجار کێ دەڵێ: وایە؟
گوتم: ئەدی تۆ بڕوات بەچی هەیە؟
گوتی: من بڕوام بە سوننەت نییە.
گوتم: ئەدی بڕوات بەچی هەیە؟
گوتی: بە قورئان.
گوتم: دەی باشە، مادام باوەڕت بە قورئان هەیە، کێ قورئانی بۆ ئێمە نەقڵ کردوە؟
گوتی: قورئان خوا فەرموویەتی.
گوتم: ئاخر لە ڕێی کێوە پێمان گەیشتوە، لە ڕێی هاوەڵانەوە پێمان نەگەیشتوە؟
گوتی: با.
گوتم: چۆن بڕوات بەو سەد هەزار (١٠٠،٠٠٠) هاوەڵە کرد کە قورئانیان بە سەلامەتیی بۆ ئێمە نەقڵ کردوە، ئەدی بۆچی بڕوایان پێ ناکەی پێنج فەرزەی نوێژیشیان کردوەو، زەکات و ڕۆژوو حەج و .. هتد؟! ئیدی فەقیرە دامابوو تێگیرا، گوتم: تۆ لەوێ دەڵێی: ڕاست دەکەن، قورئانیان نەقڵ کردوە، بێ دەستکاریی، بەڵام بۆ پێنج فەرزەی نوێژ ڕاست ناکەن، لە حاڵێکدا قورئانەکە هەر یەك قورئانە، بەڵام ڕۆژێ پێنج جاران نوێژیان کردوە؟!.
شتێکی زۆر بێجێیە تۆ لەلایەکەوە بڕوات بە هاوەڵان بێ، کە قورئانیان بۆتۆ نەقڵ کردوە، بەڵام لەوی دیکە بڕوات پێیان نەبێ، ئنجا گوتم: کاکە گیان! تۆ نازانی هەڵگرانی ئەو بیرۆکەیە پێشێ تانە لە سوننەت دەدەن، دوایی تانە لە قورئانیش دەدەن، تۆ باوەڕ بە هاوەڵان نەکەی، چواردە سەدەیە نوێژیان بۆتۆ نەقڵ کردوە!! ئێ قورئانیش هەروا!، کە تەعنت لەودا، لەویش دەدرێ.

أ- ئەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە میانی ڕێباز (سنة)ەکەیدا بۆی ڕوون کردووینەوە کە خوا سبحانه و تعالى فەرموویەتی: (وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ).

لە (مالك بن حويرث)ەوە هاتوە، بەلای کەمەوە ئەوە دووجاران لە ژیانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دووبارە بۆتەوە، کە لەسەر مینبەر نوێژی کردوە، کاتێ هاوەڵان ئامادە بوون، دوایی فەرموویەتی:

{وَ صَلّوُا كَما رَأَيْتموني أُصَلِّي} أخرجه البخاري برقم (٦٨١٩).

واتە: چۆن منتانی بینی نوێژ دەکەم، ئاوا نوێژ بکەن.

بۆ ئەوەی لەسەر مینبەرەوە هەموویان ببینن، بەلای کەمەوە ئەمە دووجار لە ژیانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دووبارە بۆتەوە، ئەوەی بۆ ئێمە نەقڵ کراوە، ڕەنگە زیاتریش دووبارە بووبێتەوە، ئنجا هەموو ڕۆژێ پێنج فەرزە لە میحرابدا لەبەر چاویان نوێژی کردوە، بەڵام ڕەنگە فەرموویێتی نەوەك یەکێ لەدواوە بێ، من نەبینێ داخۆ چۆن سەجدەو کڕنووش دەبەم، با لەسەر مینبەر هەموویان تەماشا بکەن.

ب- ئنجا کە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ... ﴾ البقرة.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە حەجی ماڵ ئاواییدا حەجی کرد، خوا پەرستییەکانی حەجی هەموو پێشاندان، وەك بەسەنەدێکی ڕاست هاتووە لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە، دوایی فەرمووی:

{لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ} أخرجه مسلم برقم (١٢٩٧)، وابن خزيمة برقم (٢٨٧٧)، وأخرجه أيضا: أبو داود برقم (١٩٧٠).

واتە: با خوا پەرستییەکانی حەجم لێ وەربگرن.

ج- دەربارەی زەکات، کە خوا دەفەرموێ: (وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ) زەکات بدەن، چۆن زەکات بدەن؟، لەچی بدرێ و، چەندو چۆن بدرێ؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ مِنْ الْإِبِلِ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ}، أخرجه مالك برقم (٥٧٧)، وأحمد برقم (١١٢٧١)، والبخاري برقم (١٤١٣)، ومسلم برقم (٩٧٩)، وأبو داود برقم (١٥٥٨)، والترمذي برقم (٦٢٦)، والنسائي برقم (٢٤٧٦)، وابن ماجه برقم (١٧٩٩)، وابن خزيمة برقم (٢٢٩٤)، وابن حبان برقم (٣٢٦٨)، والدارقطني (٩٣/٢).

**شی کردنەوەی هەندێ لە وشەکانی فەرموودەکە:**

(**الذوْد**): {من الإبل ما بين الثلاث إلى العشر، وهي مؤنثة لا واحد لها من لفظها والكثير أذواد}، واتە: (ذوْد) بە حوشتر دەگوترێ، لە پێنج (٥) هەتا دە (١٠)، حوشتری مێ، کە تاکی نیە لە بێژەکەی خۆی، هەر (ذوْد) دەگوترێ، بەڵام لە دە (١٠) زیاتر، پێی دەگوترێ: (أژواد).

(**الأوقية، أُوَاق**) {الأُوقِيَّةُ في الحديث أَربعون دِرهماً، وكذا كان فيما مضى وأما اليوم فيما يتعارفه الناس فالأُوقية عند الأطباء وزن عشرة دراهم وخمسة أَسباع درهم}[1]، کۆی (أوقيە)، (أواق)ە، لە فەرموودەدا هاتوە، یانی (٤٠) درهەم، بەڵام بەپێی باوی ئێستا (ئوقیە) لە (١٠) درهەمی زیو، وە (٧/٥)ی درهەمێك، یانی: ئەندازەیەك لە زیو یاخود زێڕ.

(**الوَسْق**): بە (**وِسْق**)یش هاتوە، {الوَسْقُ: سِتُّون صاعاً، الوَسْقُ: حَمل البَعير، والوِقر حَمل البَغل والحِمار}[2]، وەسق بریتیە لە (٦٠) ڕبە، هەر ڕبە (صاع) یێکیش چوار مستە.

کەواتە: پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: بە نسبەت حوشترانەوە، ئەگەر لە پێنج وشتری مێیینە کەمتر بن، زەکاتیان لێ ناکەوێ.

وە بە نسبەتماڵی نەقدینەوە کە ئەو کاتە زێڕو زیو بووە، ئەگەر لە پێنج ئوقیە کەمتر بێ، زەکاتی لێ نادرێ.

---

(١) مختار الصحاح، ص ٧٣٣.

(٢) مختار الصحاح، ص ٧٢١.

وە بە نسبەت دەغڵ و دانەوە (دانەوێڵە) ئەگەر لە پێنج (وِسق) كەمتر بێ، ئەویش زەكاتی لێ نادرێ.

كەواتە: وانیە هەر ئاژەڵێ بوو، زەكاتی لێ بكەوێ، جا چ ئاژەڵی وردە وەك مەڕو بزن، چ ڕەشە وڵاغ، چ حوشتر.

هەروەها ئەوە نیە هەر كەسێ پارەی نەقدینەی هەبێ، زەكاتی لێ بكەوێ، یان هەركەس دەغڵ و دانی بوو، هەرچەند بوو، زەكاتی لێ بكەوێ، نا، شەرع دیاریی كردوە، كێ دیاریی كردوە؟ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم.

**بەڵگەی دووەم:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەرجەستەكارو جێبەجێ كاری قورئانێ بووە، یانی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆیە نێردراوە، تاكو قورئان جێ بەجێ بكات، وەك خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ..﴿٢﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بەدوای ئەوە بكەوە كە لە پەروەردگارەوە بۆت نێردراوە.

با لەو بارەوە سەرنجی دوو دەق بدەین، وەك نموونە:

١)- خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ: ﴿ .. وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشورى.

واتە: تۆ خەڵك ڕێنمایی دەكەی بەرەو ڕاستە ڕێ.

كەواتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جێ بەجێكاری قورئان بووەو چۆنیەتی جێ بەجێ كردنەكەشی لە سوننەتەكەیدایە، ئنجا تۆ كە سوننەتت ڕەفز كرد، نازانی قورئان چۆن جێ بەجێ دەبێ، بۆ وێنە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو هەموو ئایەتانەی بۆ هاتوون لەسەر جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە لەدژی كافران و دوژمنان، ئایا هەر كامیان لە كوێداو لە چ هەل و مەرجێكدا جێ بەجێ دەكرێن؟!

ئەگەرنا لە شوێنێك دەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا ..﴿٣٩﴾﴾ الحج، كە دیارە ئەمە تەنیا مۆڵەتە.

لە شوێنێكی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ..﴿١٩٠﴾﴾ البقرة. لێرەش جەنگ لە دژی كافرانی شەڕفرۆش پێویست كراوە.

لە شوێنێكی دیكە دەفەرموێ: ﴿...وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً ..﴿٣٦﴾﴾ التوبة.

تێكڕاتان لەدژی موشریكەكان بجەنگن، وەك چۆن ئەوان تێكڕایان لە دژتان دەجەنگن، (نەك لەگەڵ تێكڕای موشریكان بجەنگن، وانیە، چونكە هەموو موشریكەكان جەنگ لە دژیان دروست نیە).

كەواتە: ئێمە چۆن دەزانین هەر ئایەتە لە چ هەل و مەرجێكدا جێ بەجێ دەكرێ؟، بەهۆی سوننەتەوە دەزانین، ئەگەرنا قورئان، هەمووی قورئانە، بەڵام سوننەت هەر حوكمەی لە شوێنی خۆیدا دادەنێ.

٢)- دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پرسیاری لێ كراوە دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، گوتوویەتی:

{فَإِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللَّهِ كَانَ الْقُرْآنَ}، أخرجه مسلم (٧٤٦).

واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قورئان بوو.

كەواتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاكارو ڕەفتارو هەڵس و كەوتەكەی بریتی بوو لە بەرجەستە كردنی قورئان، ئنجا ئایا ئەوە لەكوێدا بۆمان نەقڵ كراوە؟ لە سوننەتدا، كەواتە: تۆ بەبێ سوننەت نازانی قورئان چۆن بەرجەستە كراوەو، چۆن كاری پێ كراوە؟ ئنجا ئەگەر تانە لە ڕەوشت و ئاكاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بدەی، مانا ئەوەیە تۆ قورئانت بەبەرجەستە كراویی نابێت و تەنها بە خوێنراویی لە بەردەستتدا دەبێت.

بەڵگەی سێیەم: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەری پێویست بووە قورئان بە خەڵك ڕابگەیەنێ، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ .. ﴿٦٧﴾ ﴾ المائدة.

واتە: ئەی پێغەمبەر! ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتۆتە خوار، بە خەڵکی بگەیەنە، ئەگەر نەیگەیەنی تۆ پەیامی خوات نەگایاندوە.

ئنجا کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەری پێویست بووە پەیامی خوا بگەیەنێ، ئایا چۆنی گەیاندوە؟ بێگومان بە فەرمایشتەکانی گەیاندوویەتی، وە بە کردەوەکانی گەیاندوویەتی، وە بەدان پێداهێنانەکانی گەیاندوویەتی، دانپێداهێنان: یانی شتێك لەبەر چاوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کراوە ئەویش پەسەندی کردووە، ئەوە پێی دەگوترێ: (تقرير - إقرار).

وە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

واتە: (ذكر)مان بۆ لای تۆ ناردوە، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێردراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیتەوە.

چۆنی بۆ ڕوون کردوونەتەوە؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو قورئانەی لە ژیانی تاکیی و کۆمەڵایەتیی و خێزانیی و سیاسیی و لەبواری جەنگ و لە ئاشتییدا، بەرجەستە کردوە، دیارە ئەو بەرجەستە کردن و جێبەجێ کردنەش لە دوو توێی سوننەتدا هەیە.

کەواتە: کاتێك ئێمە قورئانمان بە جێ بەجێ کراویی و بەرجەستە کراویی لەبەر دەستدا دەبێ، کە تەماشای سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەین، بۆیە هیچ کات ئێمە بێنیاز نابین لە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وەك سەرچاوەی دووەمی شەریعەت.

٤- بەڵگەی سوننـــەت

ئەم بەڵگەیان تەنها بۆ بەرچاو ڕوونییە بۆ کەسانێکی مسوڵمان، بۆ زیاتر دڵنیا بوونیان، بۆچی؟ چونکە بەپێی مەنتیق و لۆژیك ناگونجێ شتێك بکرێتە بەڵگە لەسەر بوونی خۆی، بەڵام بۆ ئێوەو بۆ هەرکەسێ کە گوێی لە قسەکانی ئێمە دەبێ، بۆ دڵنیا بوون و بەرچاو ڕوونیی، با تەماشا بکەین بزانین پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) چۆن باسی سوننەت و ڕێ و شوێنی خۆی دەکا؟:

١- لە فەرموودەیەکیدا دەفەرموێ: {أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْقُرْآنَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ، لَا يُوشِكُ رَجُلٌ يَنْثَنِي شَبْعَانًا عَلَى أَرِيكَتِهِ، يَقُولُ: عَلَيْكُمْ بِالْقُرْآنِ فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلَالٍ فَأَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ} أخرجه أحمد برقم (١٧٢١٣)، وأبو داود برقم (٤٦٠٤)، والطبراني برقم (٦٧٠)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

واتە: ئاگادار بن! من کیتابم پێ دراوە، وە وێنەی ئەویشم لەگەڵ ئەودا پێ دراوە، ئاگادار بن! من قورئانم پێدراوەو وێنەی خۆیشم لەگەڵیدا پێدراوە، (دیارە مەبەست سوننەتە) ئاگادار بن! نزیکە پیاوێکی تێر لەسەر قەنەفەیەك پاڵ بداتەوە بڵێ: ئێوە هەر خەریکی قورئان بن، هەرچی حەڵاڵێکتان لەوێدا بینی، بە حەڵاڵی دابنێن، وە هەر حەرامێکتان لەوێدا بینی، بە حەرامی دابنێن.

واتە: گوێ مەدەن بە هیچی دی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ئەمەی فەرمووە، دیارە ئەمە هەواڵە بە نادیار، کە کەسانێك دەبن لە ئۆممەتی خۆی بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە.

٢- لە فەمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا خَطَبَ، يَقُولُ أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَخَيْرَ الْهَدَي

هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرَّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ} أخرجه أحمد برقم (١٤٣٧٣)، ومسلم برقم (٨٦٧)، والنسائي برقم (١٥٧٨)، وابن ماجه برقم (٤٥).

جابری كوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە ووتاری دەدا (واتە: هەمیشە لە وتاردا ئەمەی فەرمووە) دەیفەرموو: دوای ستایشی خوا، بێگومان باشترین فەرمووده كتێبی خوایە، وە چاكترین ڕێ و شوێن ڕێ و شوێنی موحەممەدە، وە خراپترینی شتەكان، پەیدا كراوەكانن، وە هەر پەیدا كراوێكیش گومڕاییە.

٣- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ، لَهُ لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عن سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي} أخرجه البخاري برقم (٤٧٧٦)، وأخرجه أيضا: ابن حبان برقم (٣١٧)، والبيهقي برقم (١٣٢٢٦).

ئەم فەرموودەیە بەسەرهاتێكی هەیە: ڕۆژێك سێ كەس هاتنە ماڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لە هاوسەرانی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) پرسیار كرد، دەربارەی تاعەت و خوا پەرستیی ئەو، ئەوانیش هەواڵیان پێدان، بەڵام ئەوان ئەوەندە خوا پەرستییەی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) پێ كەم بوو، یەكێكیان گوتی: من لەمەودوا هەر ڕۆژوو دەگرم و ناپیسێنمەوە، یەكێكی دیكەیان گوتی: من شەوانە هەر شەونوێژ دەكەم و ناخەوم، ئەوی دیكەیان گوتی: هەر بە ڕەبەنیی دەمێنمەوەو ژن ناهێنم، {وادیارە بیریان لەوە كردۆتەوە: بە هەرسێكمان لە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بەدینتر دەبین، سەركێڵیی ئینسان تووشی كەم فامیی عەجایب دەكات، هەڵبەتە ئەوانە لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بوون، بەڵام لەو مەسەلەیەدا نەفام بوون}، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە گەڕایەوەو بۆیان گێڕایەوە، ئەمەی فەرموو: {ئاگادار بن! سوێند بەخوا من لە هەمووتان زیاتر لەخوا دەترسێم و سام و هەیبەتی لێ دەكەم و بەمەزن و گەورەی دەگرم، وە لە هەمووشتان باشتر پارێزیی لێ دەكەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژووی سوننەت

دەگرم، جاری واش هەیە بە ڕۆژوو نابم، وە شەونیژیش دەکەم و دەشخەوم، وە هاوسەرگیرییش دەکەم، ئنجا هەر کەسێ لە ڕێبازی من لابدا، لەمن نیە}

نابێ پێت وابێ دەتوانی کە لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زیاتر بۆ خوا فەرمانبەرتر بی و، بۆ خوا ملکەچتر بی، ئەمە ناگونجێ، هەرکەسێ بیەوێ لە ئیسلام بەولاوە هەورازتر بچێ، وەك ئەو کەسە وایە کە لە ئیسلام کورتی دێنێ، دین چ لێی تێپەڕێنی، چ لێی بەجێ بمێنی، هەردووکی گومڕایی و سەرلێشێواوییە.

٥- هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەکانی نکووڵیی لێکەرانی سوننەت

ئەوانەی کە نکووڵیی دەکەن لەوەی سوننەت سەرچاوەی دووەمی شەریعەتی خوایە، چەند شتێك بەبەڵگە دەهێننەوە[1]، ئەوەندەی سەرنجی قسەکانی ئەوانم داوە، پێنج بەڵگەم کەوتوونە بەرچاو:

**بەڵگەی یەکەم:** دوو ئایەتان بەبەڵگە دێننەوە، کە ڕەنگە ئایەتی دیکەش لەو بارەوە هەبن، بەڵام هەر لە چوار چێوەی ئەو دوو ئایەتەدان:

١)- ئایەتی ژمارە (٣٨)ی سووڕەتی (الأنعام)، خوا دەفەرموێ: ﴿ ...مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَـٰبِ مِن شَىْءٍ ..﴿٣٨﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: لە کتێبدا هیچ شتێکمان زایە نەکردوە، (واتە: هەموو شتێکمان باس کردوە).

٢)- لە ئایەتی ژمارە (٨٩)ی سووڕەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ ...وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ النحل.

واتە: کتێبمان بۆ سەرتۆ دابەزاندوە، ڕوونکردنەوەیە بۆ هەموو شتێك، وە ڕێنماییە، وە بەزەییە، وە موژدەیە، بۆ مسوڵمانان.

**بەڵگەی دووەم:** وە دەقێکیش بەبەڵگە دەهێننەوە کە گوایە فەرموودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، کە بەم شێوەیە: {ما أتاكم عنِّي فأَعْرِضوه على كتاب الله، فما وافق كتاب الله فأنا قُلتهُ! فإنْ خالَفَ فلم أَقُلْهُ} قال الألباني في السلسلة الضعيفة برقم (٩٤٥): وقد صرح بعض أئمتنا بأنه حديث باطل، من وضع الزنادقة -كما ذكرت ذلك في بعض تخريجاتي وتحقيقاتي-.

---

(١) من عادەتم وایە بەردەوام کە بمەوێ بەرپەرچی بیرۆکەیەك بدەمەوە، ئەو بیرۆکەیە، چ بەڵگەیەکی هەیە، بە ئەمانەتەوە دەیهێنم.

واتە: هەر شتێکتان لەمنەوە پێ گەیشت ڕاینوێنن، بەراوردی بکەن لەگەڵ کتێب خوادا، ئەوەی لەگەڵ کتێبی خوادا گونجا، ئەوە من گوتوومە، وە ئەگەر لەگەڵی نەگونجا، ئەوە من نەمگوتوە[1].

**بەڵگەی سێیەم:** ئەوەیە کە دەڵێن: دەقی هەڵبەستراو زۆرن، بەناوی سوننەتەوە.

**بەڵگەی چوارەم:** بەڵگەی چوارەمیان ئەوەیە دەڵێن هەندێك لە زانایان هەندێك دەقی نێو (صحيح البخاري) و (صحيح مسلم)یشیان ڕەت کردوونەتەوە.

**بەڵگەی پێنجەم:** دەڵێن: دەقی وا هەیە پێچەوانەی قورئان، یان پێچەوانەی عەقڵ و زانیارییە، یان پێچەوانەی واقیعە.

ئەم پێنج بەڵگانە دەهێننەوە، ڕەنگە شتی دیکەش هەبێ، بەڵام پێم وایە لەم چوار چێوەیە دەرناچن.



---

(١) کە ئەوە ماناکەی ڕاستە، بەڵام فەرموودەکە - وەك دوایی باسی دەکەین- هەڵبەستراوە.

هەڵوەشاندنەوەی بەڵگە و گومانەكانیان :

**یەكەم:** أ- ئایەتی یەكەم، كە دەفەرموێ: ﴿ ...مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ.. ﴿٣٨﴾ ﴾ الأنعام.

هیچ گومانی تێدا نیە، كە (الْكِتَابِ) لێرەدا هیچ پەیوەندیی بە قورئانەوە نیەو (الْكِتَابِ) لێرەدا بەمانای (اللّوح المحفوظ)ە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ ﴾ النمل،

﴿ ..وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾ يس.

زۆر لە زانایانیش دەڵێن: شتێك نیە بەناوی (اللّوح المحفوظ)، بەڵكو ئەوە تەعبیرێكی ڕەمزییە بۆ زانیاریی بێ سنوورو بێ سەرەتای خوا، كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿ ...مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ.. ﴿٣٨﴾ ﴾ واتە: هیچ شتێك نیە لە زانیاریی ئێمەدا نەبێ، مەبەست ئەوەیە، ئەمما بڵێی: واتە: لە قورئاندا باسی هەموو شتێكمان كردوە، ئەوە هەموو كەس دەزانێ وانیە!! ئەدی كوا باسی سەیارە و تەیارە و.. هەزاران شتی دیكە، ئەگەر خوا شتێك بفەرموێ، دەبێ وابێ، كوا لەكوێدایە؟!.

ب- ئایەتی دووەم، كە دەفەرموێ: ﴿ ...وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ.. ﴿٨٩﴾ ﴾ النحل.

واتە: كتێبمان بۆ سەرتۆ دابەزاندوە، ڕوونكەرەوەیە بۆ هەموو شتێك.

ئەمە مەبەست پێی قورئانە، بەڵام زانایان دەڵێن: (تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ) یانی: بۆ هەر شتێك كە ژیانی ئێوە پێویستی پێیەتی، وە لە مەودای عەقڵ بەدەرە، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە هەموو شتێكی تێدابێ، چونكە وردەكارییەكانی

پیشەسازیی و کشتوکاڵ و ڕێکخستنی وڵات و هەزاران شتی دیکە لەقورئاندا نیە، بەڵام ئەوانە لەمەودای عەقڵدان و، عەقڵ دەتوانێ درکیان بکا، خوا بۆیە بە پێویستی نەزانیوە باسیان بکات، کەواتە: (تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ) یانی: هەموو ئەو شتانەی لە مەودای عەقڵتاندا نین و عەقڵتان پێیان ناشکێ و، پێویست بەوە دەکات خوای زانا بۆتان ڕوون بکاتەوە، ئەمە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ، کە قورئان وامان لێ بکات بێنیاز بین لە سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

**دووەم:** بەنسبەت ئەو دەقەوە کە گوایە فەرموودەیە، ئەوە زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە قسەیەکی هەڵبەستراوە، واتە: لە ڕووی سەنەدەوە هەڵبەستراوە، بەڵام لەڕووی نێوەڕۆکەوە، مانایەکەی ڕاستە، هەرگیز پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچ شتێکی نەفەرمووە، پێچەوانەی قورئان بێ و لەگەڵ قورئاندا دژ بوەستێ، بەڵام ئەو دەقەی نەفەرموە، ئەوە زۆر لە زانایان باسیان کردوە[1].

**سێیەم:** دەڵێن: دەقی هەڵبەستراو زۆرن لەنێو سوننەتدا، ئێمەش دەڵێین وایە، بەڵام زانایان لێکیان جیا کردوونەتەوە، هەر ئەوانەی ئێستا لە خەیاڵمدان:

١)- (تذكرة الموضوعات)ی (إبن الجوزي).

٢)- (كشف الخفاء ومزيل الإلباس عما اشتهر من الأحاديث على ألسنة الناس)ی إسماعيل العجلوني.

٣)- (اللآلئي المصنوعة في الأحاديث الموضوعة)ي السيوطي.

٤)- (سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة)ی (شيخ ناصرالدين الألباني). كە هەشت نۆ بەرگە.

بەڵێ زانایان فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوایان (صلی الله علیه وسلم) بژار کردوە، کەواتە: بە بیانووی بوونی دەقی هەڵبەستراو لەنێو سوننەتی پێغەمبەری

------------------------------

(١) شەوكانی لە (إرشاد الفحول في علم الأصول) ص (٣٣)دا، دەڵێ: ئەوە قسەیەکی هەڵبەستراوە، بەدەمی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم.

خوادا (صلى الله عليه وسلم)، هیچ عاقڵێك ناچێ ئەوەش كە ڕاستە ڕەتی بكاتەوە، ئایا هیچ خاوەن باخێك دەچێ لەبەر دوو سێ میوەی خراپ، باخێك لەنێو ببات؟ یان كەسێ هەیە لەبەر دوو سێ بیرۆكەی هەڵە لە كتێبێكدا، بڵێ: ڕاستەكانیشم ناوێن؟ یان ئایا دەبێ كەسێك كە دوو سیفەتی خراپی هەن سیفەتە باشەكانیشی ڕەت بكەیتەوە؟!.

**چـــوارەم:** دەڵێن: هەندێ لە زانایان هەندێ دەقی نێو دوو كتێبەكەی (بوخاریی و موسلیم)یشیان ڕەت كردۆتەوە، ئەوە ڕاستە، بەڵام گرنگ ئەوەیە زانایان بەگشتی گوتوویانە: ئەوانەی لە (صحیح)ی بوخاریی و موسلیمدا هاتوون، ڕاستترینن كە پاڵ بدرێنە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام نەیانگوتوە: وەك قورئان هیچیان ڕەت ناكرێتەوە، تەنیا قورئان لە ئەلیفی تاكو یای، لێی دڵنیای كە ئەوە فەرمایشتی خوایە، چونكە هەمووی بە تەواتور پێمان گەیشتوە، بەڵام فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هەموی بە تەواتور پێمان نەگەیشتوە، بەڵكو جۆری موتەواتیرەكەی زۆر كەمەو زۆربەی هەرە زۆری جۆری (آحاد)ە.

**پێنجـــەم:** دەڵێن: دەقی وا هەیە پێچەوانەی قورئانە، یان پێچەوانەی عەقڵ و زانستە، یان پێچەوانەی واقیعە، ئێمەش دەڵێین: وایە، بەڵام هیچ دەقێكی ڕاست و دروستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نیە پێچەوانەی قورئان و عەقڵ و زانست و واقیع بێ، وە ئەگەر گریمان دەقێكیش هەبێ با لە دوو كتێبەكەی بوخاریی و موسلیمیشدا بێ، كە بۆمان دەركەوت پێچەوانەی قورئانە، یان پێچەوانەی عەقڵ و زانست و واقیعە، دەبێ ڕەت بكرێتەوە، بەڵام ئەوەش ئەهلی خۆی هەیە، هەركەسێك ڕاست بۆوە، بۆی نیە بڵێ: ئەو حەدیسە لەگەڵ ئەو ئایەتەدا تێك دەگیرێ.

بەڵام لێرەدا دەبێ وریابین: ئایەت هەیە بەڕواڵەت لەگەڵ ئایەتی دیكەدا تێك دەگیرێ، بەڵام ئەگەر قووڵ و ورد سەرنج بدرێ، دەبینین وانییە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار باسی گیان كێشان دەكات و پاڵی دەداتە لای سێ لایان:

١- لەسوورەتی (الزمر) ئایەتی (٤٢)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ .. ﴿٤٢﴾ ﴾.

واتە: خوا نەفسەکان دەکێشێ لەکاتی مردنیاندا لێرەدا پاڵی داوەتە لای خۆی.

٢- وە لە سوورەتی (السجدة) ئایەتی (١١)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: فریشتەی گیان کێشان کە پێتان سپردراوە، دەتانمرێنێ (گیانتان دەکێشێ). لێرەدا ڕووح کێشانی پاڵداوەتە لای فریشتەی گیان کێشان.

٣- هەروەها لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (٦١)دا دەفەرموێ: ﴿ .. إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

واتە: هەرکات مردن هاتە لای یەکێکتان ڕەوانەکراوەکانمان گیانیان کێشا، وە هیچ کەمتەرخەمیی ناکەن. لێرەش خوای کارزان گیانکێشانی پاڵداوەتە لای فریشتەکان.

ئنجا ئەمانە هەرسێکیان بە ڕواڵەت تێك دەگیرێن، بەڵام ئەگەر لێی ورد بوویەوە، پێیدا قووڵ بوویەوە، وانیە، چونکە:

١)- هیچ کەسێ نامرێ بەبێ زانیاریی و فەرمانی خوا، بەبێ ئیرادەو دەسەڵاتی خوا، بۆیە پاڵی داوەتە لای خۆی.

٢)- فریشتەی گیان کێشان (ملك الموت) سەرپەرشتیی هەموو گیان کێشانەکان دەکات.

٣)- بەڵام ئایا کێن ئەوانەی جێبەجێی دەکەن؟ فریشتەکانن.

کەواتە: هەرسێکیان هیچ دژایەتییەك نیە لەنێوانیاندا، بەڵام هەرکامیان بە ئیعتیبارێك، کارەکەی پاڵدراوەتە لا.

ئنجا هەر دەقێكی سوننەت، ئەگەر لەلایەن پسپۆڕانەوە سەلما، كە لەگەڵ قورئان، یان عەقڵ، یان زانست، یان واقیعدا، دژ دەوەستێ، ئەوە بەتەئكید دەڵێین: ئەوە هی پێغەمبەری خوا نییە (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شتێك نافەرمویٚ لەگەڵ ئەمانەدا دژ بوەستێ، بەڵام وەك گوتم: نابێ پەلە بكرێ، دەبێ خەڵكی شارەزاو پسپۆڕ لەو بارەوە بڕیار بدات.

**هۆكارێكی بنەڕەتیی لە سوننەت كەوتنە گومان، لە قەبارەی خۆ گەورەتر كردنی سوننەتە لەلایەن هەندێك كەسەوە:**

شایانی باسیشە: هەندێ لە مسوڵمانان یەكێ لە هۆكارە سەرەكییەكانی كەوتنە گومانیان لە سوننەت، كاردانەوەیانە بۆ زێدە ڕۆیی و تێپەڕاندنی هەندێ لەوانەی خۆیان بەبەرگرییكاری سوننەت دادەنێن، واتە: (أهل الأثر، وأهل الحدیث)، كە سوننەتیان هێناوەتە ڕیزی قورئان، ئێوە زۆر جار بیستووتانەو دەیبیستن، كەسانێك لەوانەی كە خۆیان بە شوێنكەوتەی سەلەفی صالح لەقەڵەم دەدەن، قورئان و سوننەت لە دوو تای تەرازووێكدا دادەنێن، یاخود هێندێكیان دەیگەیەننە ڕادەیەك دەڵێن: سوننەت بەسەر قورئانەوە چاودێرەو حوكمی بەسەردا دەدا، كە ئەوە شتێكی زۆر نامەنتیقییەو بێ ئەدەبییەكی زۆر گەورەیە بەرامبەر بە خواو بە فەرمایشتی خوا، وە بەرامبەر بە پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم)، بەڵێ پێم وایە: لە كاردانەوەی هەندێ لەوانەدا كە بە حیساب بەرگرییان لە سوننەت كردوە، كە زۆریان تێپەڕاندوە، وە دژی عەقڵ وەستاونەتەوەو قورئانیان ئیهمال كردوەو، سوننەتیان لە قەبارەی خۆی زۆر گەورەتر كردوە، لەكاردانەوەی ئەوەدا كەسانێك هاتوون هەموو سوننەتیان خستۆتە ژێر نیشانەی پرسیار، گوتوویانە: قورئان بەدیلە بۆ سوننەتیش پێویستیمان بە سوننەت نیە، بەڵام وەك گوتم: ئەوە بە نسبەت كەسانێكی مسوڵمانەوە، هەندێكیش وەڵامی ئەو پرسیارانەیان ئاوا نەزانیون و گوتوویانە مادام دەقی هەڵبەستراو زۆربن، دەبێ هەڵنەبەستراوەكانیشیان پێوە ڕەفز بكەین، مادام تەنانەت لەنێو هەردوو كتێبی (بخاري و مسلم)یشدا هەندێ دەق هەن، كە هەندێ لە زاناو پسپۆڕان ڕەفزیان كردوون، كەواتە: با سوننەت هەمووی ڕەفز بكرێتەوە، وە مادام لە نێو

سوننەتدا چەند دەقێك هەن، كە دژی قورئان، یان دژی عیلم و عەقڵن، كەواتە: با هەمووی ڕەفز بكرێتەوە!! كە لە ڕاستیدا هیچ عاقڵێك واناكا، وە ئەو بیر كردنەوەیەش چەوتە[١].

## قورئان و سوننەت لێك جیان:

شتێكی ئاشكرایە كە قورئان و سوننەت لێك جیان، قورئان قورئانەو، سوننەت سوننەتە، قورئان چەند جیاوازییەكی هەن لەگەڵ سوننەت، من لێرەدا شەش جیاوازییم هێناون، وە پێم وایە دەرك كردنی ئەو ڕاستییانە، دەبێتە مایەی ڕاستكردنەوەی باری لاری مامەڵە كردن لەگەڵ سوننەتدا، ئنجا هەر كات بارەكە ڕاست كرایەوە زێدەڕۆیی نەكرا لە بەرز كردنەوەی سوننەت بۆ ئاستی قورئان، یان بەرزتریش لە قورئان، ئەو كاتە ئەو كاردانەوە نەفامانەیە دروست نابێ، كە كۆی سوننەت هەمووی بخەیە ژێر نیشانەی پرسیارەوە:

## جیاوازییەكانی نێوان قورئان و سوننەت :

١- قورئان دەقی فەرمایشتی خوایە سبحانە و تعالى، یانی: هەم واتایەكەی و هەم داڕشتنەكەی هی خوایە، بەڵام سوننەت دەقی فەرمایشتی خوا نیە، ئەوەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) وەك دین و وەحی گوتوویەتی، بەڵكو تەنیا مانایەكەی هی خوایە عز وجل، بەڵام داڕشتنەكە هی پێغەمبەرە (صلى الله علیه وسلم)، تەنانەت فەرمووده قودسییەكانیش كە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لە خواوە دەیانگێڕێتەوە، ئەوانیش داڕشتنیان هەر داڕشتنی خۆیەتی، واتە: سوننەت هەمووی داڕشتنی بەشەرییە.

---

(١) وەك دوایی باسی دەكەین: هەرگیز دەقێكی ڕاست (صحیح)ی سوننەت چنگ ناكەوێ كە لەگەڵ قورئان یان عەقڵ یان زانستدا دژ بوەستێ.

٢- قورئان دەستە وستانكەرە، واتە: بەرانبەرەكانی خۆی دەستەوستان دەكات و وەك قورئانیان بۆ نایەت، هەر بۆیە قورئان یەك وشەی هەڵبەستراوی تێدا نیەو، ناگونجێ بێتە نێوی، بەڵام سوننەت وانیە، هەر بۆیەش سوننەت هەڵبەستراوی تێدا پەیدا بووە.

٣- قورئان خوێندنەوەكەی عیبادەتە، بەڵام سوننەت وانیە، واتە: فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوە نیە (خودی ) خوێندنەوەكەی، بە عیبادەت لەقەڵەم بدرێ[1].

٤- قورئان هەمووی لە لووتكەی تەواتور دایە[2]، قورئان هەمووی بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، بەڵام سوننەت وا نیە، هەندێ لە زانایان دەڵێن: یەك فەرموودەی موتەواتیری قسەیی (قولي)مان هەیە، ئەویش ئەوەیە كە دەفەرموێ:

{مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ}

هەندێك دەڵێن: تەنها ئەو فەرموودەیەمان موتەواتیر هەیە، بەڵام موتەواتیری كردەیی (عملي)مان زۆر زۆرە: خوا پەرستییەكانی حەج و عومرە، پێنج نوێژە فەرزەكان، ڕۆژوو، زەكات، هەموو ئەمانە بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوون، هەڵبەتە من ناڵێم: موتەواتیری قسەیی (قَوْلی) تەنیا ئەو فەرموودەیە، بەڵام زۆر لە زانایان وا دەڵێن.

---

(١) دەڵێن: كاتی خۆی كە ناپلیۆن لە فەڕەنساوە چوو میصر بگرێ، ئەو كاتە دواكەوتوویێتیی مسوڵمانان تا ئەو ڕاددەیە بووە كە زانایانی ئەزهەر گوتیان: باشترین چارەسەر ئەوەیە (صحيح البخاري) بخوێنینەوە، ئیدی هەموویان چووبوون دەیانخوێندەوە، بۆ ئەوەی خوا ئەو بەڵایەیان لێ لابا، بێ ئاگا لەوەی كە لە پێش بوخاریی، لە قورئانداو لە بوخارییشدا هاتوە، كەدەبێ هێز بۆ دوژمنان ئامادە بكەی، ئەوە نەهاتوە كەتۆ لەوكاتەدا دەبێ صەحیحی بوخاریی بخوێنیتەوە، بەڵكو خوێندنەوەكەی بۆ ئەوەیە، چی گوتوە، تۆ وابكەی.

(٢) {التواتر: ما يرويه العدد الكبير، تحيل العادة تواطئهم على الكذب، أو على الخطأ} واتە: تەواتور بریتیە لەوەی ژمارەیەكی هێندە زۆر ئەو شتە بگێڕنەوە ئەوانیش بگەیەننە ژمارەیەكی زۆری دوای خۆیان، تا دەگاتە ئێمە، كە بە عادەتە بە عەقڵ مەحاڵبێ لەسەر ئەوە كۆببنەوە،

٥- سوننەت هاوتاو بەرامبەری قورئان نیە، واتە: ئەوە نیە بڵێین: ئەمە قورئان و ئەمەش سوننەت، وەك دوو شتی هاوتاو یەكسان، كە من ئەو ڕاستییەم لە مەوسووعە عەرەبییەكەی خۆمدا[1] جوان باس كردوە، وە لەو كتێبەشدا، كە دەربارەی سوننەت نووسیومە، هەر باسم كردوە، كە هەرگیز درووست نییە بڵێی: ئەوە قورئان و ئەوەش سوننەت، وەك دوو تای تەرازوو، بۆچی؟ چونكە قورئان كاكڵەو كرۆكی سوننەتە، یانی ڕێ و شوێن و ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، كاكڵەكەی قورئانە، ئایا ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چی بووە؟ پێغەمبەری خوا بەس قورئانی هێناوە، ئەدی سوننەت بریتیە لەچی؟ بریتیە لە پراكتیزە كردنی قورئان لە دنیای واقیعدا، هەڵبەتە ناشڵێم سوننەت جگە لە قورئان، چی دیكەی تێدا نیە، وەك دوایی باسی دەكەم، چونكە هەندێ شت هەیە لە سوننەتدا هاتوە، لە قورئاندا نەهاتوە، وەك كۆكردنەوەی خوشكی بابیی و (عمّة) خوشكی دایكیی (خالة) هاوسەر لەیەك كاتدا ناگونجێ پیاوێك لەیەك كاتدا لەژێر نیكاحی خۆیدا ژنێك و پوور (عمّة) یان پلك (خالة)ی پێكەوە كۆ بكاتەوە، ئەمە تەنها لە سوننەتدا هاتوە، یان وەك قەدەغە بوونی هەموو خاوەن كەڵبەیەك لە دڕندان، وە هەموو خاوەن چڕنووكێك لە پەڕندەو باڵندان، ئەوەش تەنها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە، بەڵام ئەمانەش دیسان دەكەونەوە نێو بازنەی ئەوەی لەقورئاندا هاتوە، كە دواتریش زیاتر باسی دەكەین.

ئنجا پێویستە ئەوەش چاك بزانین، كە سوننەت جیا نیە لە قورئان، بەڵكو هەر بریتیە لە قورئان، بەڵام بە پراكتیزە كراویی، بە جێبەجێ كراویی لەسەر ئەرزی واقیع، وە كە جێبەجێ دەكرێ، ڕوونیش دەبێتەوە كە ئایا ئەو ئایەتە لە كوێدا، وە ئەو حوكمە چۆن جێبەجێ دەبێ، وە كێ بەكاری دەهێنێ؟!

٦- قورئان یەك جۆرەو هەمووی لەیەك پلەدایە، بەڵام سوننەت پۆلێن دەكرێ بۆ چەند جۆرێك و هەمووی لەیەك پلەدا نیە، بەلای كەمەوە سوننەت دەبێتە شەش جۆر.

---

(١) الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تعالى.

که زانینی ئەم ڕاستییەش زۆر ئیشکال و تەم و مژ دەڕەوێنێتەوە، زۆر کەس وا دەزانێ کە دەگوترێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وای کردوە، یان وای فەرمووە، هەمووی حوکمی قورئانی هەیە، یان هەموو وەك دین وایە، لێرەدایە کە خەڵکێك تووشی هەڵەو کاردانەوە بووە، بەڵام ئەوە ڕاست نیەو سوننە بۆ چەند جۆرێك دابەش دەبێ و، هەر جۆرە حوکمی تایبەتی خۆی هەیەو، مامەڵەی تایبەتی خۆی لەگەڵدا دەکرێ، با سەرنج بدەین:

# بـەش و جـۆرەكانی سـوننەت

**جۆری یەكەم:** (سنّةٌ لِلتّشريِع والتّبليغ بِمُقتضى نُبوّته ورِسالَتِهِ)، ئەم جۆرەی سوننەت حوكمەكەی گشتییە، چونكە بۆ یاسا دانان و ڕاگەیاندنە بەپێی ئەوە كە (موحەممەد) پێغەمبەرو ڕەوانە كراوی خوایە صلى الله عليه وسلم.

بۆ وێنە فەرموویەتی: {بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً} أخرجه أحمد برقم (٦٤٨٦)، والبخاري برقم (٣٢٧٤)، والترمذي برقم (٢٦٦٩) وقال: حسن صحيح، برقم (٦٢٥٦)، وأخرجه أيضا: الدارمي برقم (٥٤٢). واتە: لە منەوە بیگەیەنن ئەگەر ئایەتێكیش بێ.

لێرەدا وەك ڕەوانە كراوێك ئەوەی فەرمووە.

یان كە دەفەرموێ: {إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ} أخرجه أحمد برقم (١٦٨)، والبخاري برقم (١)، ومسلم برقم (١٩٠٧)، والترمذيبرقم (١٦٤٧)، وأبو داود برقم (٢٢٠١)، والنسائي برقم (٣٤٣٧)، وابن ماجه برقم (٤٢٢٧).

واتە: بە دڵنیایی كردەوە (چاكە)كان بە گوێرەی نیاز (نیە)كان وەردەگیرێن.

لێرەدا ئەوەی وەك حەقیقەتێكی ڕەها فەرمووە، وەك پێغەمبەرایەتی ئەمەی فەرمووە، ئنجا ئەم جۆرەیان وەك دین پابەندكەرە بۆ هەموو كەس، وە لە هەموو حاڵاندا.

**جۆری دووەم:** (سُنَّةٌ بِمُقتضى إِمامِتِهِ ورِسالَتِه)، ئەم جۆرەش هەر سوننەتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام وەك پێشەوایەتیی و سەرۆكایەتیی بۆ دەوڵەت و قەوارەی سیاسی فەرموویەتی.

بۆ وێنە: دەفەرموێ: {مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ} أخرجه أحمد برقم (١٤٦٧٧)، وأبو داود برقم (٣٠٧٣). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين، وقال الألباني: صحيح.

واتە: هەركەسێ زەوییەكی بەیار، {یان زەوییەكی مردوو} زیندوو بكاتەوە، ئەوە بۆ خۆیەتی.

ئەمەی چۆن فەرمووە؟ بێگومان وەك سەرۆكی دەوڵەت فەرموویەتی، ئنجا كە وەك سەرۆكی دەوڵەت فەرموویەتی، كەواتە: هەر مەلایەك ناتوانێ بڵێ: هەر زەوییەكی بەیارتان بینی، بچن بیكێڵن، بۆخۆتان، چونكە مەلایەك بۆ یەكێك ئەم فەتوایە دەدات، مەلایەكی دیكە بۆ یەكێكی دیكە ئەم فەتوایە دەدات .. وە هەروەها، ئەمەش دەبێتە هۆی ناكۆكیی، بەڵام ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی و حوكمڕان بڕیاریدا، كێشەی لەسەر پەیدا نابێ.

كەواتە: ئەم فەرموودەیەی بە سیفەتی سەرۆكی دەوڵەت فەرمووە، نابێ لێت تێك بچێ، نە بەسیفەتی موفتی و، نە بەسیفەتی پێغەمبەرایەتیی نەیفەرمووە، كە لە هەموو حاڵاندا جێبەجێ بكرێ.

**جۆری سێیەم:** (سُنَّةٌ بِمُقتضى كَونهِ قاضِياً أَو حاكِماً)، جۆرێكی دیكەی سوننەت وەك قازیی و دادوەر هەندێ شتی فەرمووە، كە لەو چوار چێوەیەدا وەردەگیرێ، بۆ وێنە: دەفەرموێ: {إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَلْحَنُ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا بِقَوْلِهِ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنْ النَّارِ، فَلَا يَأْخُذْهَا} أخرجه مالك برقم (١٣٩٩)، وأحمد برقم (٢٦٦٦٨)، وابن أبي شيبة برقم (٢٢٩٧٣)، والبخاري برقم (٢٥٣٤)، ومسلم برقم (١٧١٣)، وأبو داود برقم (٣٥٨٣)، والترمذي برقم (١٣٣٩)، والنسائي برقم (٥٤٠١)، وابن ماجه برقم (٢٣١٧).

واتە: ئێوە دەبێتە ناكۆكیی و مشت و مڕتان، دێنە لای من، ڕەنگە هەندێكتان باشتر بەڵگەی خۆی بێنێتەوە، (لەسەر ناهەقیش بێ، بەڵام زمان لووس و قسە زانتر بێ)، هەر كەسێك حەقی برایەكی پێ بدەم، لەبەر ئەوەی كە قسە زانتر

بووە (ناحەقیش بێ، بەڵام حەقەکەی پێ بدەم) ئەوا با وەری نەگرێ، چونکە ئەوە پارچەیەك ئاگرە بۆی دەبڕم.

لێرەدا پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بۆ خۆی دەفەرموێ: جاری وا هەیە ناپێیکێ، کاتێك وەك قازیی یان وەك حاکم بڕیار دەدا، تۆش نابێ بڵێی: ئەوە دینێکی پابەندکەرە بۆ هەموو لایەك، نا، چونکە وەك قازی فەرموویەتی، کە دەگونجێ هەر هەمان کێشە دووبارە قەزاوەتی بۆ بکرێتەوە، بڕیارێکی دیکەی لەبارەوە بدرێ، چونکە بۆ خۆی فەرموویەتی: ئەو کەسە کە ناحەقە، بەڵام قسە زانترە، ڕەنگە من حەقەکەی پێ بدەم، بەڵام ناهەقیەتی با وەری نەگرێ.

**جۆری چوارەم:** (سُنَّةٌ بِمُقتضى كَونِه مُفتياً)، یانی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێ شتی فەرمووە وەك موفتی فەتوای داوە، بۆ وێنە: {قَالَتْ هِنْدٌ أُمُّ مُعَاوِيَةَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ آخُذَ مِنْ مَالِهِ سِرًّا؟ قَالَ: (خُذِي مَا يَكْفِيكِ أَنْتِ وَبَنُوكِ بِالْمَعْرُوفِ)} أخرجه البخاري برقم (٢٠٩٧) ومسلم برقم (١٧١٤).

واتە: هیندی دایکی موعاویە چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەبو سوفیان پیاوێکی چرووکە، هێندەم ناداتێ کە بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات، مەگەر لە ماڵەکەی گل بدەمەوە، بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێ، (پێی خۆش نەبووە بڵێ: لێی دەزم دەنا هەر وا دەکاتەوە)، بیکەمە خەرجیی خۆم و منداڵەکانم، ئایا گوناهم لەسەرە؟ فەرمووی: ئەوەندەی کە بە شی خۆت و منداڵەکانت دەکات، بە شێوەیەکی بەپەسند زانراو (وەك باوو عورف) وەری بگرەو گوناهت ناگاتێ.

ئنجا ئایا هەر ئافرەتێ چوو بۆ لای مەلایەك و پێی گوت: پیاوەکەم چرووکە، مەلایەکە بۆی هەیە بڵێ: بەکەیفی خۆت لێی لادە؟! بێگومان نەخێر، دیارە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ئەو فەتوایەی بۆ ئەو ئافرەتە داوە، بەتەئکید لێی کۆڵیوەتەوە، یان زانیویەتی، کە ئەبو سوفیان وایە، وە زانیویەتی

كە ئەو ئافرەتە ڕاست دەكات، ئیدی هەر ئافرەتێك چووە لای مەلایەك بڵێ: پیاوەكەم چرووكە، كە ڕەنگە زۆریش سەخیی بێ، بۆی نیە بڵێ: لە سامانەكەی بۆخۆت لادە، كەواتە: فەتوا دەبێ وەك فەتوا وەربگیرێ، نەك وەك حوكمێكی شەرعیی گشتی بۆ هەموو حاڵەتەكان.

**جۆری پێنجەم:** (سُنَّةٌ بِمُقتضى اجتهادِهِ في الأمورِ الدّنيويّة، كَالزِّراعةِ، والطِّب، والحَرب، إلى آخِرِهِ)، جۆری پێنجەمی سوننەت ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، بەپێی ئەوە كە كۆششی كردوە لەكاروباری دنیادا، وەك: كاروباری كشتوكاڵ، پزیشكیی، جەنگ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە كاروباری دنیاییدا، وەك ئێمەو مانان، ڕەفتاری كردوە بۆ نموونە: من هاتووم ئەو كاغەزو پەڕانەم هاویشتووتە نێو ئەم دەفتەرەوە، بەڵام یەكێكی دیكە لەجیاتی ئەوە كۆمپیوتەرێك بەكاردێنێ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە كاروباری دنیاییدا، عەقڵی خۆی بەكار هێناوەو جاروباریش نەیپێكاوە، ئنجا ئایا ئەوە بۆ ئێمە دەبێتە دینێكی پابەندكەر؟ نەخێر، چونكە بۆخۆی وایفەرمووە، وەك لەو دەقەی سوننەتەوە دیارە كە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەلای كۆمەڵێكدا ڕۆیشت (لە مەدینە) دارخورمایان موتوربە دەكردن[1]، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوانی بینی بەسەر ئەو دارخورما بەرزانەوە (ڕەنگە مەترسیی ئەوەی لێیان بووبێ بەربنەوە) فەرمووی: ئەوە چی دەكەن؟ گوتیان: تۆوی نێرەكە دەبەینە سەر مێیەكە، فەرمووی: ئەگەر ئەوەش نەكەن، هەر دەبێ، پێم وایە ئەوە سوودی نیە، ئەوانیش وازیان لێهێنا، ساڵ هاتەوە دارخورمایەكان بەریان نەگرت، یاخود بەرێكی خراپیان گرت، چوونە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! دەزانی

---

(١) بۆ زانیارییتان! هەرچی ڕووەكە هەمووی نێرو مێی هەیە، جا هەیە نێرو مێیەكەی لەنێو خۆیدایە، وە هەیە لەدەرەوەی خۆیدایە، بەتایبەت دارخورما زۆر بەرزە، ئەگەر تۆوی نێرەكە نەبەنە سەر مێیەكە، متوربە نابێ، ڕووەكەكانی دیكە بەهۆی هەنگ و پەپوولەو باڵندەكان و (با)وە، موتوربە دەبن و تۆوی نێرەكە دەگوازرێتەوە، بەم شێوەیە بەخۆیان موتوربە دەبن، بەڵام دارخورما لەبەر ئەوەی زۆر بەرزە، دەبێ بەشێوەی تایبەت موتوربەی بكەن.

دارخورمایەكان بەریان نەگرت؟ فەرمووی: بۆچی بەریان نەگرت؟ گوتیان: تۆ بەویدا هاتی فەرمووت: ئەگەر واش نەكەن، هیچ زیانی نیە، ئێمەش لێی گەڕاین، ئەویش فەرمووی: ئەگەر شتێك بۆخۆتان دەزانن باشە بیكەن، ئەوە تەنیا بۆچوونی خۆم بوو، ئنجا فەرمووی: {أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ}[1] أخرجه مسلم برقم (٢٣٦٣). واتە: ئێوە لەكاروباری دنیاتاندا زاناترن.

واتە: شتێك دڵنیان كە بەو شێوەیە باشە، لەبەر ئەوەی من پێشنیارێكم بۆ كردوون، مەچن واز لە زانیارییەكەی خۆتان بێنن، لەبەر پێشنیارەكەی من.

لە ڕیوایەتێكدا هاتوە دەفەرموێ: ئەگەر شتێكم پێ گوتن وەك دین، ئەوە وەری بگرن، بەڵام ئەگەر شتێكم پێ گوتن، وەك ڕای خۆم، ئەوە سەرپشكن، دەتوانن لێم وەربگرن، وە دەتوانن بڵێن: ڕای خۆمان باشترە.

ئەوە لە ڕووی كشتوكاڵەوە.

لە ڕووی جەنگەوە: لە (السيرة النبوية)ی (ابن هشام)دا هاتوە[2]، كە پێغەمبەری خوا لە شەڕی بەدردا لە شوێنێك مەنزڵگایان خست، سوپایان مۆڵدا لە شوێنێك، (الحبّاب بن المنذر)یش چووە خزمەت پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم مەنزڵگایە خوا پێی فەرمووی: لێرەدا بارگەو بنە بخەین، یان بۆچوونی خۆتەو تاكتیكی جەنگە؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەڵكو ئەوە جەنگەو بۆچوونی خۆمەو تاكتیكی جەنگییە، (حباب) گوتی: كەواتە ئێرە باش نیە، {پێشتر ویستی بزانێ خوا فەرموویەتی، چونكە لەبەرامبەر وەحییدا عەقڵ و ئیجتیهاد پاساوی نیە، كە خوا شتێكی فەرموو، تەواو، ئنجا دوای ئەوەی كە دڵنیا بووە خوا نەیفەرمووە، عەقڵی خۆی بەكار هێناوە، چونكە ئەو شارەزایی زیاتر بووە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

---

(١) درێژەی بەسەرهاتەكە بەم شێوەیە هاتوە: {عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ بِقَوْمٍ يُلَقِّحُونَ، فَقَالَ: لَوْ لَمْ تَفْعَلُوا لَصَلُحَ، قَالَ: فَخَرَجَ شِيصًا فَمَرَّ بِهِمْ، فَقَالَ: مَا لِنَخْلِكُمْ؟ قَالُوا: قُلْتَ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ}

(٢) ج٢ ص ٣٣٦، وأخرجه الحاكم في المستدرك (٣/٤٢٦-٤٢٧).

لەو مەسەلەیەدا}، ئێرە شوێنەکەی وایە ئەگەر بارانی لێ بباریٚ، ئینسان لە قوڕیٚ دەچەقیٚ، با بچینە سەریٚ، زووركەڵێنە، زیخ و چەوری لێیە، ئەگەر باران بباریٚ خاكەكەی توندو پندر دەبیٚ و باشتر پێمان پێوەی گیر دەبن، پاشان لەسەریٚ حەوزێك دروست دەكەین و ئێمە ئاومان دەبیٚ و، ئەوان ئاویان نابیٚ، پێغەمبەری خواش فەرمووی: بۆچوون بۆچوونی تۆیە (الرَّأْيُ ما رأيت).

هەروەها لەمەسەلەی صوڵحی (غطفان)دا، پێغەمبەری خوا بانگی هەردوو سەعدی كوڕی موعاذو سەعدی كوڕی عوبادەی كرد، فەرمووی: ئایا بۆ ئەوەی عەشیرەتی غەتەفان لەكۆڵ خۆمان بكەینەوە، سیٚ یەكی بەروبوومی مەدینەیان بدەینیٚ؟ ئەوانیش گوتیان: ئایا ئەمە شتێكە بەفەرمانی خوا دەیكەی، یان بۆ ئێمەی دەكەی و وات پیٚ چاكە؟ فەرمووی: نەخێر خوا نەیفەرمووەو خۆم وام پیٚ چاكە، گوتیان: جگە لە شمشێر هیچی دیكەیان نادەینیٚ، بەر لەوەی خوا ئێمە بەرێز بكا بەهۆی تۆوە، ئەوان تەماعیان لە ماڵ و میوەی ئێمەدا نەبوو، ئێستا كە خوا ئێمەی بەتۆ شەرافەتمەند كردوە، چۆن تەنازولیان بۆ دەكەین! هەرچەندە نووسیبووشیان بەڵام فەرمووی: بیدڕێنن[1].

لێرەدا دەبینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستبەرداری ڕایەكەی خۆی بووە لەبەر ڕای ئەوان.

كەواتە: ئەوە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك كاروباری دنیایی كردوویەتی، وەك دین بۆ ئێمە پابەندكەر نیە.

ئنجا لە بواری پزیشكیی (طب)دا: ئایا ئەگەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شتێكی فەرموو بیٚ بۆ چارەسەرێك، بەڵام ئێستا زانستی پزیشكیی دەریخستبیٚ كە شتێكی لەو باشتر هەیە، تۆ هەر دەبیٚ بچی ئەوەی ئەو بەكار بێنی؟، نەخێر، وە زانایان لەسەر ئەوە هاوڕان، چونكە ئەو كاتە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی فەرمووە، شتێكی لەوە باشتر نەبووە، بۆ

---

(١) ج٣ ص ١٠٨،١٠٩، هەروەها بڕوانە: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا) لاپەڕە: ٥٨٥، چاپی: ٣.

وێنە: باسی سووتاندنی کردوە، وەك فەرموویەتی: {إِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ شِفَاءٌ، فَفِي شَرْطَةٍ مِنْ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةٍ مِنْ عَسَلٍ، أَوْ كَيَّةٍ بِنَارٍ، تُصِيبُ أَلَمًا، وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ} أخرجه أحمد برقم (٢٧٢٥٦) والبخاري برقم (٥٣٥٧).

واتە: شیفا ئەگەر هەبێ لەسێ شتاندا هەیە: کەڵە شاخ بگیرێ، یاخود خواردنەوەیەکی هەنگوین یان سووتاندن، وەمن سووتاندنم پێ باش نیە.

ئێستا هەموومان دەزانین عەمەلیات هەیەو باشترە لە سووتاندن، ئنجا ئایا دەبێ بڵێین: نا، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی فەرمووە؟ نەخێر، چونکە ئەو بەپێی شارەزاییی سەردەمی خۆی و، ئاستی فیکریی بەشەر لەو کاتەدا، ئەوەی پێ چاك بووە، بەڵام ئێستا ئەگەر شتێکی لەوە باشتر هەبێ، ئەوەی وەك دین بەئێمە نەفەرمووە.

**جۆری شەشەم:** (سُنّة بِمقتَضى جِبلّته البَشريّة كَحبِّه لِلحَلواءِ والعَسَل)، جۆری شەشەمی سوننەت ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا، وەك سروشتی مرۆڤانەی خۆی کردوویەتی یان فەرموویەتی، بۆ وێنە: حەزی لە حەلواو شتی شیرین، وە حەزی لە هەنگوین کردوە، وەك لە دایکمان عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێ هاتوە: {عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ} أخرجه البخاري برقم (٥١١٥).

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆر حەزی لەحەلوا (حەلوا جۆرێك لە شیرینی وەك پاقلاوە)، هەنگوینیش دەکرد.

ئنجا ئایا دەبێ تۆ ئەگەر نەخۆشیی شەکرەشت بێ، هەر شتی شیرین بخۆی و بڵێی: سوننەتە؟ نەخێر ئەوە سوننەت نیە، چونکە وەك سروشتی بەشەریی ئەوەی کردوە، هەروەها جل و بەرگ و پێڵاوو کەل و پەلی ژیان و گوزەرانی ڕۆژانەو ...هتد، سەرجەمیان پەیوەستن بە حاڵەتی سروشتیی مرۆڤ و ژینگەو جوگرافیاو عادەت و نەریت و کلتووری کۆمەڵگایەکانەوەو هیچ پەیوەندییان بە دینداریییەوە نیە، با لە سوننەتی پێغەمبەریشدا هاتبن.

## ڕوونكردنەوەیەكی پێویست دەربارەی چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان قورئان و سوننەت[1]:

هەندێك دەڵێن: قورئان مەتنەو سوننەت شەڕحە، كە ئەوە بەتەئكید ڕاست نیە، چونكە ئەگەر وابووایە، دەبووایە ئێمە لەبەرامبەر هەر ئایەتێكدا فەرمایشتێكی پێغەمبەرمان (صلى الله علیه وسلم) هەبووایە، كە نیمانە، بۆیە قورئان مەتن نیە، سوننەت شەڕحی بێ، بەڵێ: قورئان مەتنی ئیسلامە، بەڵام سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) شەڕحی ئەو مەتنە نیە، بەڵكو چۆنیەتی جێبەجێ كردن و پڕاكتیزە كردنی ئەو بەرنامەیە، چۆنیەتی جێ بەجێ كردنیەتی لەسەر ئەرزی واقیع، ئەگەرنا دەبوو ئێستا ئێمە كتێبێكمان لەبەر دەست دابووایە بە ناوو نیشانی (التفسیر النبوي للقرآن الكریم) كە ئەوە وا نیە، وە هەموو ئەو ئایەتانەی كە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) قسەی لەسەر كردوون، پێم وانیە زۆر لەژمارەی پەنجەكانی هەردوو دەستان تێپەڕن.

چەند ئایەتێكی كەم هەن كە هاوەڵان وشەیەكیان لێ ئیشكال بووە، پێغەمبەری خواش شتێكی دەربارەی فەرمووە، بۆ وێنە: خوای كاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢﴾

الأنعام.

واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، زوڵمیان لەگەڵ ئیمانەكەیان تێكەڵ نەكردوە، ئا ئەوانە دڵنیاییان بۆ هەیە، وە ئەوانە ڕێی ڕاست گرتووانن.

---

(١) ئەم ڕوونكردنەوەیەم لە مەوسوعەی: (الإسلام كما یتجلى في كتاب الله)دا و، لە كتێبی: {شوێنكەوتنی ڕێبازی پێغەمبەری خوا، لە نێوان كەمتەرخەمیی و تێپەڕاندن دا}ش باسكردوە.

کە ئەم ئایەتە هاتە خوار، هاوەڵان چوونە لای پێغەمبەری خوا گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئنجا کێ لە ئێمە زوڵمی لەخۆی نەکردوە؟

ئەویش فەرمووی: مەبەست ئەوە نیە، ئەدی گوێتان لەبەندە ساڵحەکە نەبووە، کە بە کوڕەکەی دەفەرمویٚ:

﴿ .. يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴿١٣﴾ ﴾ لقمان.

واتە: ڕۆڵە گیان! هاوەڵ بۆ خوا دامەنێ، هاوەڵ دانان بۆ خوا ستەمێکی مەزنە[1].

کەواتە: مەبەست لە (ظلم) لێرەدا (شرك)ە، (بِظُلۡمٍ ) یانی: (بشركٍ) یانی: ئیمانیان هێناوەو شیرکیان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردوە، بەڵام ئەگەر کەسێك ئیمانی هەبوو، دوایی هاوەڵی بۆ خوا پەیدا کرد، ئیمانەکەی هەڵدەوەشێتەوە، بۆیە ئەو کەسە دڵنیا نابێ لە ڕۆژی دواییداو ئەمین نابێ، چەند شتێکی وا کەم لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوون، بۆ ڕەواندنەوەی چەند گومان و ئیشکالێك.

کەواتە: ڕاست ئەوەیە بڵێین: سوننەت ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئانە، وە سوننەت لە ڕاستییدا کاکڵەکەی هەر قورئانە، بەڵام بەپراکتیزە کراویی و جێ بەجێ کراویی لەلایەن پێغەمبەری کۆتاییەوە.

---

(١) رواه البخاري: ٤٤٩٨، ومسلم: ٣٤٢.

### ٣ ـ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی پەیوەندیی نێوان قورئان سوننەت

لە مەوسووعەی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا، باسی ئەو بابەتەم کردوە، کە پەیوەندیی نێوان قورئان و سوننەت چۆنە، سەرەتا بە کورتیی و بە پوختیی دەڵێم: سوننەت شتێك نیە لەبەرامبەر قورئاندا، واتە: وەك دوو تای تەرازوویەك نین، ئەوە قورئان ئەوەش سوننەت، هەڵبەتە پێشتریش باسم کرد کە قورئان چەند جیاوازییەکی هەن لەگەڵ سوننەتدا، بەڵکو لەڕاستیدا سوننەت بریتیە لە قورئان بەبەرجەستەکراویی، بریتیە لە جێبەجێ کردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع، نەك هەر هاوتای قورئان نیە، بەڵکو هەر شتێکی جیاش نیە لە قورئان، کەواتە: ئەو بۆچوونە کە دەڵێ: سوننەت بریتیە لە شەرح و تەفسیری قورئان، تێی نەگەیشتوون، ئەوان ئەو ئایەتە بەبەڵگە دەهێننەوە، بەڵام لەڕاستییدا تێی نەگەیشتوون:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: (ذکر)مان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو بۆ خەڵك ڕوون بکەیەوە ئەوەی کە بۆیان هاتۆتە خوار، وە بۆ ئەوەی خۆشیان بیر بکەنەوە.

هەڵبەتە ڕوون کردنەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەوە نەبووە دابنیشێ قورئانمان بۆ شەرح و تەفسیر بکات، بەڵکو مەبەست لە ڕوون کردنەوەی قورئان لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)، ئەوە بووە کە پیشانمان بدات قورئان چۆن جێ بەجێ دەکرێ؟ ئایا بەڵگەم چییە لەسەر ئەمە؟ بەڵگەم ئەوەیە: ئێمە کەئێستا تەماشای سیرەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەین، دەبینین قورئانی بۆ جێبەجێ کردووین و، پیشانمان دەدا چۆن جێ بەجێ دەکرێ، بەڵام نابینین قورئانی بۆ تەفسیر کردبین، بەمانا

ڕواڵەتییەکەی، ئێمە ئێستا: {ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر بۆ قورئان} (التفسير النبوي للقرآن)مان لەبەر دەست نیە، بەڵام {جێبەجێکردنی پێغەمبەر بۆ قورئانی مەزن} (التطبيق النبوي للقرآن العظيم)مان لەبەر دەستە، ئەوە شتێکی گرنگە هەموو لایەك بیزانین، بۆ ئەوەی پێمان وا نەبێ، هەموو ئایەتەکانی قورئان پێویستییان بە ڕوون کردنەوە هەیە، چ بەلایەنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، چ لەلایەنی غەیری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، چونکە ئەوە ڕووبوڕوومان دەکاتەوە لەگەڵ ئیشکالێکی زۆر گەورەدا - کە دوایی باسی دەکەم - ئەویش ئەوەیە کە خوا سبحانه و تعالى لە چەندان شوێندا، قورئان بە ڕوون و ڕۆشن پێناسە دەکات، ئنجا ئەگەر خوا بۆخۆی بفەرموێ: قورئان ڕوون و ڕۆشن و ئاشکرایە، لەولاشەوە بگوترێ: قورئان پەکی کەوتوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕوونی بکاتەوەو تەفسیری بکات، ئەو دوو قسەیە تێك دەگیرێن.

بەڵام ڕاستە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قورئانی بۆ ڕوون کردووینەتەوە بە کردەوەی خۆی، وە پێشانی داوین: چۆن جێبەجێ دەکرێ؟ وەك پێشتریش وێنەم هێنایەوە، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: نوێژ بکەن، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فێری کردووین، چۆن نوێژ بکەین، ئەوانەی فەرزن پێنجن، وە سوننەتەکانیش زۆرن، وە ژمارەی ڕکاتەکان، وە ئەوە کە نوێژ سەجدەی تێدایە، وە ڕکووعی تێدایە، وە تەحییاتی تێدایە، ئەوە هەمووی سوننەت ڕوونی کردۆتەوە، وە مەسەلەی ڕۆژوو گرتن، وە حەج، وە شتەکانی دیکەش، ئەوەی کە پێویستی بەوە بووە، جێبەجێ بکرێ و پێشانمان بدرێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەر ئەرزی واقیع جێ بەجێی کردوە، وە پێشانییشی داوین، نوێژی کردووەو فەرموویەتی: نوێژ بکەن بەو شێوەیەی من دەیکەم، {صَلّوا كَمَا رَأَيْتموني أُصَلِّي} رواه البخاري، وە حەجی کردووەو فەرموویەتی: مەناسیکەکانی حەجم لێ وەربگرن، {لِتَأخُذوا مَناسِكَكُم} رواه مسلم، وە جەنگ و جیهادی کردووەو زانیومانە چۆنی کردوە، وە کاری سیاسیی کردووەو زانیومانە چۆنی کردوە، هەڵس و کەوتی خێزانیی، زانیومانە چۆن هەڵس و کەوتی

بووە، لەگەڵ منداڵ، خزم، دراوسێ، هاوسەر، نەوە، لەکاتی توڕەییدا، لەکاتی ئاشتییدا، هەمووی پێشان داوین، وەك خوا سبحانە و تعالى پێمان دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ..﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە سەرمەشقییەکی باش هەیە.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چاوساغ و سەرمەشق و سەرداری ئێوەیە، بۆ چۆنیەتی دینداریی کردن و، دنیاداریی کردن، چۆنیەتی گوزەراندنی ئەو ژیانە دنیاییە، کە ئەویش هەمووی لە چوار چێوەی جێبەجێ کردنی قورئاندایە، وەك دایکمان عائیشە کاتێ پرسیاری لێ کراوە، دەربارەی ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، گوتوویەتی: {كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ} أخرجه أحمد برقم (٢٤٦١) شعيب الأرنؤوط : حديث صحيح، واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا قورئان بوو.

وشەی ڕەوشتیش - وەك پێشتر باسمان کرد - واتە: کۆی هەڵس و کەوت و ڕەفتارەکانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، ئنجا لێرەوە بە پێویستی دەزانم دەقێك لە شافیعییەوە بێنم، ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەربارەی پەیوەندیی نێوان قورئان و سوننەت، لە چەند شوێنێکی کتێبەکەی (الرسالة)دا لەو بارەوە قسە دەکات، لە شوێنێکیاندا دەڵێ: {فلم أعلم من أهل العلم مخالِفاً في أن سنن النبـي من ثلاثة وجوهٍ، فاجتمعوا منها على وجهين، والوجهان يجتمعان ويتفرّعان:

**أحدهما:** ما أنزل الله فيه نصّ كتابٍ، فبيَّنَ رسولُ الله مِثلَ ما نصّ الكتابُ.

**والآخر**: مما أنزل الله فيه جملة كتابٍ، فبيَّن عن الله معنى ما أراد، وهذان الوجهان اللذان لم يختلفوا فيهما.

**والوجه الثالث:** ما سنَّ رسولُ الله، فيما ليس فيه نصُّ كتابٍ.

١- فمنهم مَنْ قال: جعل الله له بما افترض من طاعته، وسبق في علمه، من توفيقه لرضاه، أن يَسُنَّ فيما ليس فيه نصُّ كتاب.

٢- ومنهم من قال: لَمْ يَسُنَّ سنةً قط، إلا ولها أصل في الكتاب، كما كانت سنته لتبيين عدد الصلاة وعملها..

٣- ومنهم مَن قال: بل جاءته به رسالة الله، فَأُثْبِتَتْ سُنَّتُهُ بفرض الله.

٤- ومنهم مَن قال: أُلقي في رُوُعِهِ كلُّ ما سَنَّ وسُنَّتُه: الحكمة الذي أُلقي في رُوُعه عن الله، فكان ما أُلْقي في روُعه، سُنَّتُهُ، أخبرنا عبد العزيز عن عمرو بن أبي عمرو عن المطلب قال: قال رسول الله (إن الروح الأَمين قد أَلقى في رُوُعي، أنه لن تموت نفسٌ حتى تستوفي رِزْقَها فَأَجْمِلوا في الطلب)[1]}[2].

واتە: نەمزانیوە هیچ کام لە زانایان ڕایان جیابێ، لەوە کە سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سێ ڕووی هەن و سێ بەشە، هەموو زانایان لەسەر دووانیان یەکدەنگن، وە ئەو دوو بەشەش جاری واهەیە بەیەکەوە کۆدەبنەوە، جاری واش هەیە لەیەك جیا دەبنەوە، ئەو دووبەشە کە هەموو زانایان لەسەریان یەکدەنگن:

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا، زۆر بەڕوونیی ئەو شتەی گەیاندوە، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) وەك ئەوەی کە خوا هێناویەتی، وەك ئەوی فەرمووە[3].

---

(١) أخرجه الشافعي (٢٣٣/١)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١١٨٥).

(٢) الرسالة ص ١٢١-١٢٢.

(٣) بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی ئەمە، بۆ وێنە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ..﴿٥﴾﴾ البينة، واتە: فەرمانیان پێ نەکراوە مەگەر بەوە کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، بە پاکیی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى} أخرجه البخاري برقم (١)، ومسلم برقم (١٩٠٧). واتە: کردەوەکان بەپێی نیازەکانن، وە هەر مرۆڤێك بەپێی ئەو نیازەی کە لە دڵیدا هەیە، کردەوەکەی بۆ حیسابە.

ئەوەی کە ئایەتەکە فەرموویەتی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هەروای فەرمووە، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە.

**دووەمیان:** كە هەموو زانایان لەسەر ئەوەش یەكدەنگن، ئەوەیە كە خوا شتێكی بە كورتیی فەرمووە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوەی كە خوا بە كورتیی فەرموویەتی، ڕوونی كردۆتەوە[١].

ئەم دوو بەشەی سوننەت زانایان تێیدا نەكەوتوونەتە ڕاجیایی.

**سێیەمیان:** ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شتێكی بڕیارداوە لە سوننەتی خۆیدا {چ بە كردەوە، چ بە قسە، چ بە دانپێداهێنان}[٢]، ئەوەی كە لە قورئاندا نەهاتبێ، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆخۆی فەرموویێتی[٣]، زانایان چوار جۆرە هەڵوێستیان هەیە بۆ ئەو جۆرەی سوننەت (بۆ جۆری سێیەمیان):

---

(١) بۆ وێنە خوا فەرموویەتی: نوێژ بكەن، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕوونی كردۆتەوە چۆن نوێژ بكەین، وە خوا فەرموویەتی: زەكات بدەن، ئەویش ڕوونی كردۆتەوە: چۆن زەكات بدەین.

(٢) وەك لە پێناسەی سوننەتدا باسمان كرد سوننەت دەبێتەوە بەو سێ بەشە: قسە، كردەوە، دان بۆ پێدانان.

(٣) بۆ وێنە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:
{لَا يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا وَلَا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا} أخرجه مالك برقم (١١٠٨)، والبخاري برقم (٤٨٢٠) ومسلم برقم (١٤٠٨)، والنسائي برقم (٣٢٨٨)، وأخرجه أيضا: الشافعي (٢٧٣/١).

واتە: كەسێك هاوسەرگیریی دەكات لەگەڵ ئافرەتێكدا، نابێ ئەو ئافرەتە لەگەڵ خوشكی بابی، یان خوشكی دایكیدا، كۆ بكاتەوە.

بەڵێ: پوور یان پلكی ئەو ئافرەتەی بۆ حەڵاڵە، بەڵام بۆی نیە پێكەوە كۆیان بكاتەوە، مەگەر خێزانەكەی وەفات بكات، یان لێیك جیا ببنەوە، ئنجا بۆی هەیە بیهێنێ، ئەمە لە قورئاندا نەهاتوە، بەڵام پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی.

هەروەها لە فەرمایشتێكی دیكەدا هاتوە: {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنْ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنْ الطَّيْرِ}.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەدەغەی كردوە گۆشتی هەر خاوەن كەڵبەیەك لە دڕندان، وە گۆشتی هەر خاوەن چڕنووكێك لە باڵندان، كە ئەوەش لە قورئاندا نەهاتوە، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هێناویەتی، وێڕای زۆر شتی دیكەش.

١- هەندێ لە زانایان ڕایان وایە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، خوا مافی پێداوە، لەبەر ئەوەی فەرمووبەتی: فەرمانبەریی بکەن، بە قسەی بکەن، وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە زانیویەتی شتێك ناکات و ناڵێ ڕەزامەندیی وی لەسەر نەبێ، ئەو مافەی پێداوە بێ ئەوەی قورئان شتێکی فەرمووبێ، دەتوانێ ئەو بڕیارە بدات ئەوە حەڵاڵە ئەو حەڕامە، با دەقی قورئانیشی لەسەر نەبێ.

٢- هەندێك دیکە لەزانایان گوتوویانە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هیچ شتێکی بڕیار نەداوەو هیچ حەڵاڵ و حەڕامێکی دیاریی نەکردوە، لە سوننەتدا، مەگەر ئەصڵەکەی لە قورئاندا هەیە، {واتە: لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا ئیجتیهادی کردوەو هەندێ شتی دیکەی هێناوە، فەرموویەتی: وا بکەن و وا مەکەن، ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەڕامە، بۆ ئێمە دیار نیە، بەڵام بۆ ئەو دیار بووە، بۆ وێنە: ڕوونی کردۆتەوە، نوێژەکان چەند نوێژ بن، وە چۆن بکرێن.

٣- هەندێکی دیکە لەزانانایان دەڵێن: بەڵکو ئەوەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) لە سوننەتیدا کردوویەتی، یان فەرموویەتی، یان بڕیاری لەسەر داوە، بەبێ ئەوەی لە قورئاندا هەبێ، ئەوە بەتایبەت خوای پەروەردگار بۆی ناردوە، جبریل هاتوە پێی فەرمووە: ئەوە حەڵاڵە و ئەوە حەڕامە، با بۆ ئێمەش دیار نەبێ {یانی: مەرج نیە هەموو جارێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بفەرموێ: ئەوە جبریل هات، ئاوای فەرموو، بەڵام هیچ شتێکی نەفەرمووە، ئەگەر نامەی تایبەتی بۆ نەهاتبێ، بۆی هاتوەو ئەویش چەسپاندوویەتی}.

٤- هەندێکی دیکەش گوتوویانە: هەرچی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڕیاری لەسەر داوەو فەرموویەتی، وە کردوویەتی، ئەوە خراوەتە دڵییەوە[1].

هەروەها سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو حیکمەتەیە، کە خراوەتە دڵ و دەروونیەوە ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إن الروح الأمين قد ألقى في رُوُعي أنه لن تموت نفس حتى تستوفي رزقها، فأَجْمِلوا

---

(١) ئەمە لە سێیەمەکە نزیکە.

في الطلب}[1]، واتە: (روح الأمين) خستوویەتە دڵم، كە هیچ نەفسێك نامرێ، تاوەكو ڕزق و بژێویەكەی كە بۆی دیاریی كراوە، تەواوی نەكا، كەواتە: بەجوانیی داوای ڕۆزیی بكەن، خۆتان تووشی حەڕام و عەیب داریی مەكەن.

كەواتە: جاری وا هەیە (الروح الأمين) شتی خستۆتە دڵی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ئەمەی كە لێرە فەرمویەتی بەڵێ لە قورئاندا نییە بەڵام بەتایبەت خراوەتە دڵیەوە.

**خوێنــەرە بەڕێــزەكان!**

كەواتە: سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم):

**یەك:** یان هەر تەئكید كردنەوەی ئەوەیە كە لە قورئاندا هاتوە.

**دوو:** یان ڕوونكردنەوەو شیكردنەوەو چۆنیەتی جێبەجێ كردنیەتی.

**سێ:** یان هەندێ یاساشی تێدان، كە لە قورئاندا نەهاتوون، ئنجا ئایا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو شتانەی هەر لە قورئان هەڵێنجاون، یان خوای پەروەردگار بە تایبەت بە جبریلدا بۆی ناردوون، یان خستوونیە نێو دڵی؟ گرنگ ئەوەیە هەندێ شت لە سوننەتدا هەیە، كە لە قورئاندا نیە، كە چەند نموونەیەكمان هێنانەوەو نموونەی دیكەش زۆرن.



(١) پێشتر تەخریج كراوە.

### ٤ـ بەبێ شارەزایی لە قورئان، مەحاڵە تەنیا بەهۆی سوننەتەوە بتوانرێ تێگەیشتنێکی ڕاست و هاوسەنگ، لەبارەی ئیسلامەوە دەستگیربێ

ئەوەش شتێکی زۆر گرنگە ئێمە بیزانین، هەندێ کەس هەر دەچێ خەریکی سوننەت دەبێ، چ وەك شارەزا بوون لە فەرمایشتەکان و لەبەر کردنیان، چ وەك شارەزا بوون لە ڕاوییەکان، سەنەدو زنجیرەی ڕاوییەکان، ئەو وردە کارییانەی لە زانستی فەرمووده‌ناسییدا هەن، ئەو زانستەش لق و پۆپی زۆرن، هەر خەریکی ئەوەیە.

بەڵام هیچ گومانی تێدا نیە، کە ئینسان هەتا لە قورئان شارەزا نەبێ بەگشتی، ناتوانێ بڵێ: ئیسلام ئەوەیە، وە تەنها بەهۆی شارەزایی لە سوننەتەوە، ناتوانێ وێنەی ئیسلامێکی ڕاست و دروست لە دڵ و عەقڵی خۆیدا وێنا بکا، بۆیە ئەو کتێبەی کە لە زیندانی ئەمریکاییەکاندا نووسیومە، مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) چەند جاریك دەربارەی ئەو کتێبە پرسیارم لێ کراوە: مامۆستا بۆچی نەتنوسیوە: (في كتاب الله وسنة رسول الله)؟! گوتوومە: ئاخر من تەنیا لە ڕووی قورئانەوە کتێبەکەم داناوەو، پێشم وایە کە ئیسلام لە هێڵە گشتییەکانیداو، لە زۆر لە وردەکارییەکانیشیدا، لە قورئاندا هەیە، وەك حەقیقەتێکی عیلمیی و تیۆریی (نظري).

بەلام ئایا قورئان ئێمە بێ نیاز دەکات لە سوننەت؟ نەخێر، چونکە وەك گوتم: سوننەت هەر بۆخۆی بریتیە لە چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئان، وە بەڕاستیی بەبێ سوننەت، نازانرێ قورئان چۆن جێبەجێ دەکرێ.

پاشان سوننەت هەندێ شتی تێدایە کە لە قورئاندا نیە، یان لانی کەم بۆ ئێمە دیار نیە، ئەگەر پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دیار بووبێ، بەڵام بۆ ئێمە نەخێر، بەڵام ئایا بەبێ سوننەت دەتوانین وێنەیەکی ڕاست و

دروست دەربارەی ئیسلام بزانین؟ بەتەئکید نەخێر، بەڵام وەك کردارو جێبەجێ کردن، ئیسلامەمان بۆ بەرجەستە ناکرێ بەبێ سوننەت، قورئانمان بۆ جێبەجێ ناکرێ بەبێ سوننەت، بەبێ سیرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئنجا کە دەڵێین: بەبێ قورئان و تەنها بەهۆی سوننەتەوە، مەحاڵە لە بناغەو ئەصڵی ئیسلام تێبگەین، ئایا بەڵگەمان چییە بۆ ئیسپاتی ئەوە؟!.

بەڵگەی یەکەم: بە دڵنیاییەوە قورئان ئەصڵی ئیسلامەو بۆ تێگەیشتنی پێویستمان بە سوننەت نیە، ئنجا ئەگەر گریمان ئەو قسەیەش ڕاست بێ، کە دەڵێ: قورئان مەتنە، وە سوننەتتیش شەرحی ئەو مەتنەیە هەرچەندە ئەمە ڕاست نیە، بەڵام ئەگەر ڕاستیش بێ مسۆگەر هەتا مەتن نەخوێنینەوەو تێی نەگەین لە شەرحەکەی تێ ناگەین، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە لەسەر ئەوە کە قورئان لە ئەصڵدا پێویستی بە شەرح نیە؟ ئایەت لەو بارەوە زۆرن، من هەندێکیانم هێناوە، زۆربەشیان مانایەکانیان لێك نزیکە:

١- خوا فەرموویەتی ﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ١﴾ الحجر.
واتە: (الٓر) ئەوانە ئایەتەکانی کتێب و قورئانێکی ڕۆشنن.

وشەی: (مُّبِينٖ) هەم دەگونجێ بۆ (کتاب) بچێتەوە، هەم بۆ (قرآن)، ئاشکراشە: (ٱلۡكِتَٰبِ) واتە: نووسراو، بەڵام (وَقُرۡءَانٖ) واتە: خوێنراو، چونکە قورئان هەم بە نووسراویی لەبەردەستمانە، هەم بە خوێنراویی، وشەی (مُّبِينٖ)یش دەگونجێ لە (أَبانَ)ی (لازم)ەوە بێ، دەشگونجێ لە (أبان)ی (متعدِّي)ەوە بێ، چونکە وشەی (أبان) یانی: ڕوونی کردەوە، یان ڕوون بوو، بە هەردووکیان دێ، ئەگەر بەمانای: (ڕونی کردەوە) بێ، (متعدی)یە، بەڵام ئەگەر بەمانای: {ڕوون بوو} بێ، (لازم)ە، وێنەی (متعدِّي): (أبانَ المدرِّسُ الدرسَ) یانی: مامۆستایەکە وانەکەی ڕوون کردەوە.

وێنەی (لازم): (أَبانَ القَمَرُ) یانی: مانگەکە دەرکەوت، کەواتە: قورئان هەم ڕوونە، هەم ڕوونکەرەوەشە، هەم ڕۆشنە، هەم ڕۆشن کەرەوەشە.

٢- خوا دەفەرمویٚ: ﴿ طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ ﴾ الشعراء.

٣- هەروەها خوا عز وجل دەفەرمویٚ: ﴿ طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ﴿١﴾ ﴾ النمل.

٤- هەروەها خوا عز وجل دەفەرمویٚ: ﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ ﴾ هود، واتە: ئەمە کتێبێکە ئایەتەکانی پتەوو قایم کراون، دوایی ڕوون کراونەتەوە لەلایەن خوای کارزانی شارەزاوە.

٥- هەروەها خوا دەفەرمویٚ: ﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿١﴾ ﴾ یوسف.

٦- هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿ طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ ﴾ القصص.

٧- هەروەها خوا دەفەرمویٚ: ﴿ حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ ﴾ الزخرف.

٨- وە خوای زانا فەرموویەتی: ﴿ حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ ﴾ الدخان.

٩و١٠و١١و١٢- لە سوورەتی (القمر) ئایەتەکانی: (١٧، ٢٢، ٣٢، ٤٠)دا، ئەمە چوار جار دووبارە بۆتەوە کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٢٢﴾ ﴾، وە بە دڵنیایی قورئانمان ئاسان کردوە بۆ تێگەیشتن {یان بۆ لەبەر کردن}، ئایا کەسێ نیە بێ لێی تێبگا؟

(عبدالرحمن بن ناصر السعدي) ئەو ئایەتە ئاوا تەفسیر دەکا دەڵێ: {أي: ولقد يسرنا وسهلنا هذا القرآن الكريم، ألفاظه للحفظ والأداء، ومعانيه للفهم والعلم، لأنه أحسن الكلام لفظاً، وأصدقه معنىً، وأبينه تفسيراً}[1].

واتە: بێگومان ئەو قورئانەمان بەڕێزو بەپێزەمان ئاسان کردوەو سێنا کردوە، بێژەکانی بۆ گوتن، وە واتایەکانی بۆ لێ تێگەیشتن و شارەزا بوون، چونکە باشترین فەرموودەیە: لە ڕووی بێژەو واتاوە ڕاستترینیەتی، وە لەڕووی ڕوونیەوە ئاشکراترینیەتی.

---

(١) تیسیر الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، ص ٤٢٥- ٤٢٦.

کەواتە: مادام خوای متعال لەو هەموو ئایەتانەدا بفەرموێ: قورئان ڕوونەو ڕوونکەرەوەیە، بەتەئکید ئەو کاتە هیچ مانایەك نامێنێتەوە، بۆ ئەو قسەیە کە دەڵێ: قورئان پێویستی بە ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەیە، ڕەنگە یەکێ بڵێ: ئەدی بۆچی ئەو هەموو زانایانە قورئانیان تەفسیر کردوە؟ دەڵێین: تەفسیریان کردوە لەبەر ئەوەی خەڵك عەرەبی نازانێ و شارەزا نییە، بۆیەش هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، مەگەر وشەیەکیان لێ ئیشکال بووبێ ئەگەرنا هەموویان قورئانیان زانیوە، چونکە بە زمانی خۆیان بووە، ئێستاش هەر کەسێ زمانی عەرەبی بزانێ، لە قورئان تێدەگا، هەڵبەتە قورئان سادەترین کەس بەشی خۆی لێی تێدەگا، بەڵام زاناترین کەسیش ناگاتە ئەوپەڕی، هەمیشە پێویستی بە تەفسیرو لێکدانەوە هەیە، کە چۆن جێبەجێی بکەین و، چۆن باشتر لێی تێبگەین، بەڵام ئەوە نیە بڵێی تاکو تەفسیر نەکرێ، لێی تێناگەی، زۆربەی قورئان وایە کە تێی دەگەی، بۆ وێنە: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ﴾ الإخلاص، کێ هەیە لێی تێنەگا، بڵێ: خوا تاکە، هەروەها زۆربەی ئایەتەکانی قورئان هەروان، بەڵام ئایا قورئان تەنیا ئەو مانا ڕواڵەتییەی هەیە، کە کەسێکی سادە تێی دەگا؟ نەخێر، بەڵکو هەر ئەو ئایەتە دەگونجێ یەك کتێبی لەسەر دابنێین.

**بەڵگەی دووەم:** لەبەر ئەوەی سوننەت بریتیە لە چۆنیەتی جێبەجێ کردنی قورئان، بۆیە تەنیا بە شارەزا بوونی سوننەت، ناتوانین وێنەیەکی ڕاست و دروست لە ئیسلام وەربگرین.

بەڵێ سوننەت وەك (الجرجاني) دەڵێ: {السنة في اللغة: الطريقة، مرضية كانت أو غير مرضية، والعادة، وفي الشريعة هي الطريقة المسلوكة في الدين}[1]، واتە: سوننەت لە زماندا بریتیە لە: ڕێباز، ئنجا ئەو ڕێبازە پەسند یان ناپەسند بێ، وە بە نەریتیش دەگوترێ، بەڵام لە زاراوی شەریعەتدا، بریتیە لە ڕێبازێك کە لە دینداریيدا گیراوتە بەر، {کە ڕێبازی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم}.

---

(١) التعريفات، ص١٢٤.

بەڵێ، سوننەت: یانی: چۆنیەتی دینداریی کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەنجا ئایا دینداریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەچی بووە؟ بێگومان بە جێبەجێ کردنی قورئان بووە.

هەروەها (راغب الأصفهاني) دەڵێ: {وسنة النبي: طريقته التي كان يَتحرّاها}[1]، واتە: وە سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو ڕێبازەیە کە لێی خەفتاوە.

منیش دەڵێم: {السنة: هيَ كيفية تطبيق النبي للقرآن الكريم، وتجسيده إياه في واقع الحياة}، واتە: سوننەت: بریتیە لە جێبەجێ کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ قورئانی بە پێز، وە بەرجەستە کردنی لە واقیعی ژیاندا.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {إِنَّمَا هُمَا اثْنَتَانِ: الْكَلَامُ وَالْهَدْيُ، فَأَحْسَنُ الْكَلَامِ كَلَامُ اللَّهِ، وَأَحْسَنُ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ} أخرجه ابن ماجه برقم (٤٦)، قال البوصيري: هذا إسناد ضعيف عبيد بن ميمون أبو عبيد قال فيه أبو حاتم مجهول، والطبراني برقم (٨٥١٨).

(ئەمە هەر زۆر جوان بۆمان ڕوون دەکاتەوە)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: دوو شتن[2]: (الْكَلَامُ وَالْهَدْيُ)، فەرمایشت و ڕێ و شوێن، باشترین فەرمایشت فەرمایشتی خوایە، وە باشترین ڕێ و شوێن و ڕێبازو چۆنیەتی جێبەجێ کردنیش بریتیە لە ڕێ و شوێن و ڕێبازی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم).

ئەنجا لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: {ما أحسن هَدِيَّةُ فلانٍ وَهَدْيَه، أي طريقته، وما أحسن هَديَّتهُ، أي: سيرته، والجمع (هَدْيٌ) مثل: تَمْر وَتَمْرة، ويقال: هَدَى هَدْيَ

-----------------------------

(١) مفردات ألفاظ القرآن ص ٤٢٩.

(٢) واتە: ئیسلام دوو پێکهێنەری سەرەکیی هەن: فەرمودەو ڕێباز، باشترین فەرمایشت فەرموودەی خوایەو، چاکترین ڕێبازیش ڕێبازی موحەممەدە.

فلانٍ: أي سار سيرته)[1]، واته: وشەی (هَدي، هدية) واته: ڕێبازو ڕێ و شوێن، دەگوترێ: (ما أحسن هَدْيَ فلانٍ وهديَّتُهُ) واته: ڕێ و شوێن، (هِديَّة) یان (هَدِيّة)، بە (هَدي) كۆ دەكرێتەوە، وەك: (تمرة، وتمر) یەك دەنكە خورما، خورما وە دەگوترێ: (هَدَى هَدْيَ فلانٍ أي: سار سيرته) واته: بەڕێی فلانكەسدا ڕۆیشت.

ئنجا كەسێك كە بەرنامەی خواو فەرمایشتی خوا كە قورئانە، نەزانێ، بەتەئكید نازانێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆچی بەو شێوەیەی جێبەجێ كردوەو لە چۆنیەتی جێبەجێ كردنەكەی، بەهرەمەند نابێ.

**بەڵگەی سێیەم:** بەڵگەیەكی دیكەی ئەوە كە تەنها بەهۆی سوننەتەوە بە شێوەیەكی ڕاست و دروست، ئیسلاممان بۆ ناناسرێ، ئەوەیە كە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەگەر بۆ جەخت كردنەوەو داكۆكیی كردن ئەگەرنا هەرچی لە قورئاندا هاتوە، باسی نەكردوەو مسوڵمانانی حەواڵەی قورئان كردوە، چونكە بێگومان هەرچی بۆ دنیاداریی و دینداریی پەكمان لەسەری دەكەوێ، خوای كارزان لە قورئاندا باسی كردوە:

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿.. وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾﴾ النحل.

واته: ئێمە ئێمە كیتابمان بۆ سەرتۆ دابەزاندوە، ڕوونكەرەوەیە بۆ هەموو شتێك، (شتانێك كە ئێوە پێویستتانن و پەكتان لەسەریان كەوتوە)، وە ڕێنمایی و بەزەیی و موژدەیە، بۆ مسوڵمانان.

---

(١) مختار الصحاح، ص٦٩٣.

**ئنجا با سەرنج بدەین:**

**ئایا قورئان بە گشتی چی تێدایە؟**

١)- بوونناسیی، (گەردوونناسیی) بەتەواویی تێدایە، لە مەوسووعەکەی خۆم: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا، کتێبی یەکەمم هەموو بۆ ئەوە تەرخان کردوە.

٢)- ئیمان و عەقیدەی هەموو تێدایە، ئێمە بۆ زانینی ئیمان و عەقیدە، مەگەر چۆن دەنا پێویستیمان بە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نیە، چونکە پێکهاتەو هەموو پایەکانی ئیمان و عەقیدە لە قورئاندا هاتوون، کە حەوت کتێبی مەوسووعەکەم بۆ ئەوە تەرخان کردوون.

٣)- عیبادەتی تێدایە.

٤)- تەقواو تەزکیەو ڕەوشت و ئاکاری جوان، سیفەت و کردەوە دزێوو خراپەکان، بە تەواویی لە قورئاندا ڕوونکراونەوە.

٥)- باری کەسێتیی، ئەوانە هەموویان نوختەیان تێدا خراوەتە سەر پیت.

٦)- بەڵام بوارەکانی: ١- حوکم و سیاسەت، ٢- ئابووری، ٣- جەنگ و ئاشتیی، ٤- پەیوەندییەکان، هتد. تەنها هێڵە گشتییەکانیان لە قورئاندا باس کراون، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ئەوانە پەیوەندییان بە لایەنی ماددیی ژیانەوە هەیە، وە گۆڕانیان بەسەردا دێ، بۆیە خوای کاربەجێ نەیویستوە دەست و پێی خەڵك ببەستێ و بۆشاییەکی زۆری بەجێ هێشتوە، تەنانەت پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەو بوارانەدا نەچۆتە نێو وردەکارییەکانەوە، بۆ ئەوەی ڕێ بۆ خەڵك تەخت و ئاچووغ بێ و، بتوانن بۆخۆیان ئیجتیهاد بکەن، وە ژیانی دنیای خۆیان بەو شێوەیە ڕێك بخەن کە دەیانەوێ، لەو چوار چێوەیەدا کە قورئان دیاریی کردوە.

زانایان لەو بارەوە بنچینەیەکیان داناوە، زۆر گرنگە بیزانین: (إجمالٌ في المتغيِّرات، تفصيلٌ في الثَّوابت)، هەموو ئەو شتانەی کە دەگۆڕێن و گۆڕانیان

بەسەردادێ لە ژیانی تاك و خێزان و كۆمەڵدا، قورئان بە كورتیی باسی كردوون، بەڵام هەموو ئەو شتانەی كە ناگۆڕێن، قورئان بە تەفصیل باسی كردوون، بۆ وێنە: بابەتی بوونناسیی: من كێم؟ ئەو بوونە كێ خاوەنیەتی؟ ژیانی دنیا، دوارۆژو سەرەنجامی چی دەبێ؟ هەمووی بە وردیی باس كراوەو نوختەی تێدا خراوەتە سەر پیت.

بابەتی ئیمان و عەقیدە، ڕەوشت و ئاكار، باری كەسێتی، ئەوانە هەموویان بە وردیی باس كراون، چونكە ناگۆڕێن. پەیوەندییان بەڕووحی ئینسانەوە هەیە، یان پەیوەندییان بە خوای پەروەردگارەوە هەیە، یان بە فریشتەكان، یان بە ڕاستییەكانی (بوون)ەوە هەیە، ڕۆژی دوایی، بەهەشت و دۆزەخ، ئەوانە ناگۆڕێن.

بەڵام بابەتەكانی: حوكم و سیاسەت و ئابووریی و جەنگ و ئاشتیی، پەیوەندییان بە ژیانی ماددییەوە هەیەو گۆڕانیان بەسەردا دێ، بۆیە قورئان ئەو شتانەی كە ناگۆڕێن، چۆتە نێو وردەكارییەكانەوە، بەڵام ئەو شتانەی كە دەگۆڕێن، بە كورتیی باسی كردوون.

كەواتە: تەنیا بەهۆی لێ تێگەیشتنی قورئانەوە، ڕوانینێكی ڕاست و دروست و گشتگیرمان لەبارەی ئیسلامەوە، دەستگیر دەبێ، چونكە وەكو گوتم: ئەوشتانەی كە قورئان باسی كردوون، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باسی نەكردوون، مەگەر جار جار بۆ تەئكید كردنەوە، یان ڕوون كردنەوە، ئەگەر هاوەڵان ئیشكالێكیان بۆ پەیدا بووبێ.

**بەڵگەی چوارەم:** هەم پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەم خەلیفە ڕاشیدەكانی تا ڕاددەیەك ڕێگرییان كردوە لەنووسینەوەی فەرموودەكانی (أحادیث)ی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەرچەندە وەك دوایی باسی دەكەم -نابێ ئەوە ببێتە بیانووی ئەوە كە سوننەت جێی متمانە نیە، چونكە كاتی خۆی بۆیە ڕێگریی لێكراوە بنووسرێتەوە، تاكو مسوڵمانان یەكلابووەوە (متفرغ) بن بۆ تەماشا كردنی قورئان، وە فەرموودەكانی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەبەرجەستەكراویی و بە جێبەجێ كراویی، لە سوننەتدا بوونیان

بووه، واته: ئەگەر فەرمووده‌كانیشیان لەبەر نەبووبێ، بەڵام لەبەرچاویان له ژیانی ڕۆژانەیاندا پیاده كراون، واته: له ڕێبازی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بۆ دینداریی و مسوڵمانەتیی و، پراكتیزه كردنی قورئاندا، سوننەت بووه به كردەوه، بەڵام لەبەر ئەو حیكمەتەی باسمان كردو حیكمەتی دیكەش كه دوایی باسیان دەكەین، لەسەرەتاوه ڕێگریی كراوه له نووسینەوەی دەقەكانی سوننەت، وەك لەو فەرموودەیەدا دیاره:

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا تَكْتُبُوا عَنِّي وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ)} أخرجه أحمد برقم (١١٣٦٢) ، ومسلم برقم (٣٠٠٤) ، وأبو يعلى برقم (١٢٠٩)، والدارمي برقم (٤٥٠)، وابن حبان برقم (٦٢٥٤).

واته: ئەبو سەعیدی خودریی دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (جگە له قورئان شتێكی دیكه له دەمی منەوه مەنووسن، وه هەر كەسێ جگە له قورئان شتێكی دیكەی نووسیوه، با بیسڕێتەوه.

هەڵبەته هەندێ لەوانەی كه دەڵێن: متمانه به سوننەت ناكرێ، ئەو جۆره دەقانه بەبەڵگه دێننەوه، بەڵام ئێمه دوایی ئەو بابەته دەتوێژینەوەو بەرپەرچی ئەو بیرۆكەیەو بەبەڵگه هێنانەوەی ئەو دەقانه دەدەینەوه، ئێستاش بۆ سەلماندنی ئەوه هێنامەوه كه له ڕاستییدا بەبێ تێگەیشتنی قورئان، ئێمه ڕوانینێكی گشتگیرو ڕاست و دروستمان بۆ ئیسلام دەستەبەر نابێ، ئنجا كه پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) له قۆناغێكدا ڕێگریی كردووه لەوه كه فەرمایشتەكانی بنووسرێنەوه، بۆ ئەوەی لەگەڵ قورئان تێكەڵ نەبن، وه تاكو هەموو زەین و بیرو هۆشی خۆیان بخەنه سەر قورئان، زانیویەتی كه قورئان بریتیه له دەرخەری جەوهەرو ماهیەتی ئیسلام، بەڵام لەبەرامبەر ئەم فەرمایشتەدا فەرمایشتێكی دیكەش هەیه كه پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك وتاری دا له (حجة الوداع)دا، پیاوێك بەناوی ئەبو شاه كه خەڵكی یەمەن بوو، وه هەندێ دەڵێن: لەكاتی فەتحی مەككەدا بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! یا ئەو وتارەی تۆم بۆ بنووسنەوه، ئەویش فەرمووی: {اكْتُبُوا لِأَبِي شَاهٍ} أخرجه البخاري برقم : (٢٣٠٢)، وأحمد برقم (٧٢٤١)، والترمذي برقم: (٢٦٦٧).

واتە: بینووسنەوە بۆ (أَبِـي شَاهٍ).

کەواتە: کە جارێك فەرموویەتی مەینووسنەوەو جاری واش هەبووە فەرموویەتی: بینووسنەوە، دواتر ڕوونی دەکەینەوە: بۆچی هەندێ جار ڕێگریی لێ کردوەو، هەندێ جاریش فەرمانی پێ کردوە؟ لەبەر ئیعتیباری جیا جیا بووە.

(إبن الصّلاح)ی شارەزووریی کە بە دامەزرێنەری {زانستی فەرموودە} (علم الحديث) دادەنرێ، دوای ئەوەی ئەو فەرموودەیەی سەرەوە دێنێ، دەڵێ: {ومن صحيح حديث رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الدَّالِ على جوازِ ذلك: حديث أبي شاهٍ اليمنيّ، في التماسهِ من رسولِ الله أن يكتب له شيئاً سَمِعَه من خطبته عام فتح مكّة} وە دەڵێ: {١- ولَعَلَّهُ أذِنَ في الكتابة عنه، لمن خشي عليه النسيان. ٢- ونهى عن الكتابة عنه، من وَثِقَ بحفظه، مخافَةَ الإتِّكال على الكتاب. ٣- أو نهى عن كتابة ذلك عنه، حين خاف عليهِ اختلاط ذلك، بصحف القرآن العظيم، وأذِنَ في كتابتهِ حين أَمِنَ من ذلك}[1].

(إبن صلاح) لێرەدا چەند پاساوێکی جوان دەخاتە ڕوو، لەو بارەوە کە بۆچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێ جار قەدەغەی کردوە فەرمایشتەکانی بنووسرێنەوەو، هەندێ جارییش ڕێگای پێداوە؟!

دەڵێ: (وە لە فەرمایشتی صەحیحی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە فەرمایشتەکانی بنووسرێنەوەو لەسەردەمی خۆیدا ڕێی داوە: ئەو فەرموودەی ئەبی شاهی یەمەنییە کە داوای لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کرد کە ئەوەی لە وتاری ئازاد کردنی مەککەدا فەرمووی، بۆی بنووسنەوە، ئەویش فەرمانی پێ کردن و فەرمووی بۆی بنووسنەوە.

دوایی (إبن صلاح) لەبارەی جۆراو جۆریی هەڵوێستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبواری ڕێ پێدان و ڕێ پێنەدانی نووسینەوەی سوننەتەوە گوتوویەتی:

---

(١) معرفة أنواع علم الحديث، ص ٢٩٣- ٢٩٤.

١)- ڕەنگە بۆ كەسێك ڕێی دابێ ئەوەی لێی بیست بینووسێتەوە، كە مەترسیی لەبیرچوونەوەی لێی بووبێ.

٢)- وە ڕێگریی لە كەسێك كردوە بنووسێتەوە كە متمانەی بە لەبەر كردنی بووە، نەوەك پشت بە نووسینەكەی ببەستێ.

٣)- كاتێك مەترسیی بووە ئەو نووسینەیان لەگەڵ پەڕەكانی قورئانی مەزندا لێ تێكەڵ ببێ ڕێی لێگرتوە، بەڵام لە كاتێك لەوە دڵنیا بووە، ڕێی پێداوە.

یانی: كە مۆڵەتی داوە سوننەت بنووسرێتەوە، بۆ كەسێك بووە كە مەترسیی لێبووبێ كە لەبیری بچێتەوە، كەسێك كە تێی ڕانەدیبێ فەرمایشتەكەی لەبەر دەكا، فەرموویەتی: بینووسەوە، یان بۆی بنووسنەوە.

وە كە فەرموویەتی: مەینووسنەوە، لەبەر ئەوە بووە كە زۆر متمانەی پێیان بووە كە دەتوانن لەبەری بكەن، ئەو كاتە وەك ئێستا نەبووە، لەبەر ئەوەی نووسین كەم بووە، خەڵك زاكیرەی زۆر بەهێز بووە، هی وابووە توانیویەتی ئەو دەقەی كە دەگوترێ، بەكسەر لەبەری بكات، شیعری دوورو درێژیان بیستوە، بەیەكجار لەبەریان كردوە، ئیدی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەی كە متمانەی پێی هەبووە لەبەری دەكات، فەرموویەتی: مەینووسەوە، بۆ ئەوەی پشت بە نووسینەكە نەبەستێ و چاك گوێ لە قسەكان بگرێ، یاخود ڕێگریی كردوە لە نووسین، لەكاتێكدا مەترسیی هەبووە، كە ئەو فەرمایشتانە لەگەڵ ئایەتەكانی قورئاندا لێیان تێكەڵ بن، چونكە قورئانیان بە تەواویی وەك ئێمە لەبەردەستدا نەبووە، بەڵكو هەر سوڕەت سوڕەت و ئایەت ئایەت بووەو هەر كامیان ئەوەی بۆی لەبەر نەكراوە، نووسیویەتەوە لەلای خۆی، ئنجا ئەگەر ڕێگای دابایە فەرمایشتەكانی بنووسرێنەوە، لەگەڵ ئایەتەكاندا لێیان تێكەڵ دەبوون، ئیدی لەبەر دووربینی و ئیحتیاگ ئەوەی كردوە.

دوایی كە مۆڵەتی داوە لەبەر هەندێ كەس مۆڵەتی داوە، وەك دوایی باسی دەكەین، یەكێ لەوانە عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ پێی فەرمووە: بنووسە لەبەر ئەوەی زانیویەتی لێی تێكەڵ

نابێ، بەڵام ئەوەی كە زانیویەتی لێیان تێكەڵ دەبێ، فەرموویەتی: مەینووسن، هەركەسێ نووسیویەتی با بیسڕێتەوەو تەنها قورئان بهێڵنەوە.

كەواتە: ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە بەڕاستیی بەبێ لێ تێگەیشتنی قورئان، ئێمە لە ئیسلام تێناگەین، بۆیەش ئەوەندە جەخت لەسەر ئەوە دەكەمەوە، چونكە: كۆمەڵێ گەنجی خوێن گەرم و دڵ گەرم هەن، كە زۆر خەریكی سوننەت و دەقەكانی سوننەت دەبن و، لە قورئان ئاگادار نین، لە ڕابردووشدا ئەو دەردە هەر هەبووە، كاتی خۆی بەشێك لەوانەی كە ئەهلی فەرموودە بوون، هەر نەیانزانیوە قورئان چاك بخوێنن، یان ئیهمالیان كردوەو گوتویانە: سوننەت قورئانیشی تێدایە، كە بەتەئكید وانیە.

هەر لەو بارەوە (البقاعي)یش هۆكارێكی دیكەی چوارەم باس دەكات، دەربارەی ئەوە كە بۆچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگریی كردوە لە نووسینەوەی فەرمایشتەكانی؟! دەڵێ: {أي: بسبب أنه لم يكن قد إشتدَّ إلفُ الناس لهُ وكثُر حُفّاظُه المُعْتنون به، فلما أَلِفَه الناسُ، وعرفوا أساليبه وكمال بلاغته، وحُسنَ تناسب فواصله وغاياته، وصارت لهم ملكة يُمَيِّزون بها من غيره، فلم يُخْشَ اختلاطه بعد ذلك}[1].

واتە: هۆكارێكی دیكە ئەوە بووە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەماشای كردوە جارێ ئەو خەڵكە ئەوەندە لە نووسیندا شارەزا نین، بەڵام دوای ئەوەی خەڵك وردە وردە بە نووسینەوە ڕاهاتن، وە زانییان چۆن دەنووسرێ، وە دێڕ لە كوێ كۆتایی پێ دێ؟ وە چۆن وشەكان لەیەك بپچڕێنرێن؟ دوایی بۆیان بووە بە (مەلەكەیەك) كە قورئان لە سوننەت لێك جیا بكەنەوە، مەترسیی ئەوە نەبووە كە سوننەت و قورئانیان لێ تێكەڵ بێ {ئنجا مۆڵەتی داون، كە بینووسنەوە}.

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٢٩٣.

پوختەی خاڵی چوارەم:

بناغەو جەوهەری ئیسلام بریتیە لە قورئان، وەك پێشتریش چەند جارێك گوتمان، سوننەتیش جگە لە جێبەجێ کردنی قورئان و بەرجەستە کردنی لە دنیای واقیعدا شتێکی دیکە نیە، کە واش دەڵێین بە تەئکید نکوولیی لەوە ناکەین کە لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) کۆمەڵێ شت هەیە، کە ڕاستەوخۆ لە قورئاندا، یان بە ئاشکرا لە قورئاندا نین، کە وەك قسەکەی شافیعیمان ڕەحمەتی خوای لێبێ هێنا:

أ- یان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە قورئان هەڵیهێنجاون.

ب- یان وەحیی دیکەی غەیری قورئانی بۆ هاتوە، وە بەتەئکید قورئانیش ئێمە بێ نیاز ناکات لە سوننەت، چونکە قورئان بە تیۆریی (نظري) ئیسلاممان دەخاتە بەرچاو، بەڵام سوننەت بە کردەوەو جێبەجێ کراویی.

## ٥ ـ ڕەواندنەوەی تەم و مژ لەسەر کۆکردنەوەی سوننەت

بەڕێـــزان!

خۆتان دەزانن لەو بارەوە مشت و مڕ زۆرە لەم ڕۆژگارەدا، دەگوترێ: چۆن متمانە بکرێ کە ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) لە حاڵێکدا ئەو هەموو قسە هەڵبەستراو (موضوع)انە هەن، وە فەرموودەی بێهێز (ضعیف) زۆرن؟!

هەڵبەتە ئێمە لە بابەتەکانی پێشتر باسی هەڵوێستی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) کرد، دەربارەی نووسینەوەی سوننەت، باسی ئەوەشمان کرد کە جاری وا هەبووە ڕێی پێداوە بنووسرێتەوەو فەرمانیشی پێ کردوە، ئنجا لێرەدا دەپرسین: ئایا زوو کۆنەکردنەوەی دەقەکانی سوننەت - واتە: بەشێوەی نووسین-، ئیشکال لەسەر کۆی سوننەت دروست ناکا؟ دیارە هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان وایان گوتوە، گوتوویانە: نەك هەر لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانیشداو دواتریش تاکو سەد (١٠٠) ساڵ[(١)]، ئنجا فەرموودە بەنووسین، کۆکراوەتەوە، ئەمەش ئیشکال دەخاتە سەر کۆی سوننەت.

بەڵام ئێمە دەڵێین: نەخێر، نووسینەوەو کۆکردنەوەی سوننەت، وێڕای ئەوەی لە سینەکاندا هەبووەو لە مێشکەکاندا پارێزراو بووە، بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، وە ئەوە بە ڕەهایی ڕاست نیە کە لەسەردەمی پێغەمبەری خواو (صلی الله

---

(١) دوایی باسی دەکەین لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا بەڕەسمی دەست کرا بە کۆکردنەوەی دەقەکانی سوننەت، عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش لەساڵی (١٠١)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە، یانی: دەوری نەوەد (٩٠) ساڵێك دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەقەکانی سوننەت کۆکراونەوە.

عليه وسلم) خەلیفە ڕاشیدەكاندا، سوننەت نەنووسرابێتەوە، بەڵكو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە ڕێگریی لە نووسینەوەی سوننەت كردوە، دوور بینیی و ئاگر بڕی ئەوەی كردوە كە خەڵك خەریكی نووسینەوەی فەرموودەكان بن، لەسەر حیسابی قورئان، وە بۆ ئەوەش كە لێیان تێكەڵ نەبێ، بەڵام بەڕەهایی قەدەغەشی نەكردوە.

قۆناغەكانی نووسینەوەو كۆكردنەوەی سوننەت :

**بەگشتی دەتوانین بڵێین: كۆكردنەوەی دەقەكانی سوننەت بە پێنج قۆناغدا تێپەڕیوە:**

**قۆناغی یەكەم: لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم):**

لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) چەند شوێنەوارێكمان هەن، بەڕوونی ئەوە دەگەیەنن، كە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمایشتەكانیان نووسیوەتەوە، بۆ وێنە:

**١)** (الترمذي) هێناویەتی كە سەعدی كوڕی عوبادەی ئەنصاڕیی صەحیفەیەكی هەبووە، كە كۆمەڵێك لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوای تێدا نووسرابۆوە.

**٢)** (سَمُرة بن جندب) كە لە ساڵی (٦١)ك وەفاتی كردوە، ئەویش ژمارەیەكی زۆری لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە چەند لاپەڕەیەكدا كۆ كردبوونەوە، كە سولەیمانی كوڕی (سَمُرة بن جندب) لە بابی ڕیوایەتی كردوون، وەك لە (تهذيب التهذيب)دا (١٩٨/٤) هاتوە، وە (إبن سيرين) دەڵێ: (في رسالة سمرة إلى بنية، علمٌ كثير)[1]، واتە: لەو نامەیەی كە سەموڕە بەجێی هێشتوە بۆ كوڕەكانی، زانیارییەكی زۆری تێدایە، {كە بریتییە لەو دەقانەی سوننەت}.

---

(١) تهذيب التهذيب ص ٤٠٢.

٣) (جابر)ی کوڕی عەبدوڵلا کە لە ساڵی (٧٨)ك وەفاتی کردوە، (إبن سعد) لە (الطبقات)دا[١] هێناویەتی، کە صەحیفەیەکی هەبووە سوننەتی تێدا نووسیوەتەوە، وە (مسلم) لە صەحیحی خۆیدا گوتوویەتی: ئەوەی کە (جابر) کۆی کردۆتەوە دەربارەی مەناسیکی حەج بووە، کە بە صەحیفەی (همام)[٢] مەشهوور بوو.

٤- عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص خوا لێیان ڕازی بێ، کە لە ساڵی (٦٥)ك دا وەفاتی کردوە، کتێبێکی هەبووە بەناوی: (الصحیفة الصادقة)، ڕێك لە دەمی موبارەکی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) چی بیستوە، نووسیویەتەوە، وە هەزار (١٠٠٠) فەرموودەی تێدا بووە[٣]، وە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص کاتێك دەستی کرد بە نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ئەوەی دەیبیست لە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەینووسیەوە، گوتیان: تۆ چۆن هەمووی دەنووسیەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) ڕازی دەبێ، تووڕە دەبێ، قسەیەك دەکا ڕەنگە پێی خۆش نەبێ بنووسرێ؟! ئەویش پرسیاری لە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) کرد گوتی: { يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكْتُبُ مَا أَسْمَعُ مِنْكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ فِي الرِّضَا وَالسُّخْطِ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَإِنَّهُ لَا يَنْبَغِي لِي أَنْ أَقُولَ فِي ذَلِكَ إِلَّا حَقًّا} أخرجه أحمد برقم: (٦٩٣٠) قال: شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

واتە: پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم): ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا هەرچی لەتۆی دەبیستم بینووسمەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتی: لە حاڵەتی تووڕەبوون و ڕازیی بوونیشتدا؟ فەرمووی: بەڵێ، چونکە من چ تووڕە بم، چ ڕازی بم هەر حەق دەڵێم، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە فەرمووی: لەو زارەی من حەق نەبێ، نایەتە دەرو ناهەقی پێدا نایەت.

---

(١) طبقات ابن سعد (٣٤٤/٥).

(٢) صحيفة همام ص ١٤.

(٣) أُسُد الغابة، ابن الأثير (٢٣٣/٣).

٥- عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس كە لە ساڵی (٦٩)ك وەفاتی كردوە، ئەویش زۆر گرنگیی داوە بە نووسینەوەی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها سیرەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەچەند لەوحێكدا دەینووسیەوە كە زۆربەی كات لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرتن، بۆ كوڕی زانست[1].

٦- ئەبو هورەیرەش كە لە ساڵی (٥٨)ی كۆچیی دا مردوە، هەندێ لەو فەرمایشتانەی كە لە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی بیستوون نووسیونیەوە، بەڵام دوایی لەدەستی فەوتاون، بە هەر هۆكارێك بێ، جگە لە هەندێكیان كە قوتابییەكەی بەناوی (همام بن منبه)، كە لە ساڵی (١٠١)ك وەفاتی كردوە، لە ئەبو هورەیرەی گێڕاوەتەوەو ناویان ناوە (صحيفة همام) كە لە حەقیقەتدا هی ئەبو هورەیرە بووە، وە ئەو صەحیفەیە هەمووی لە (مسند)ی ئەحمەددا ڕەحمەتی خوای لێبێ هاتوە، هەندێكیشی لە (صحيح)ی بوخاریدا هاتووە، كە ژمارەیان (١٣٨) فەرموودە بووە[2].

٧- وە ئەو صەحیفەیەی كە مافی كۆچكەران و پشتیوانان و، چۆنیەتی مامەڵە كردن لەگەڵ جوولەكەكاندای تێدا تۆمار كراوە، كە پێی دەگوترێ: (الصحيفه) یان (الوپیقه) ئەوەش دیارە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) خۆی فەرمانی كردوەو نووسیویانەتەوە، كە سەرەتاكەی ئاوایە: (هذا كتاب محمد رسول الله...) هتد[3].

هەڵبەتە ئەمە قۆناغی یەكەمی نووسینەوەو كۆكردنەوەی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر لەسەردەم و ڕۆژگاری خۆیدا.

---

(١) طبقات ابن سعد (١٢٣/٢).

(٢) تهذيب التهذيب ص ١٠٦.

(٣) الوثائق السياسية في عهد النبوي، والخلافة الراشدة، لمحمد حميد الله، رقم:١.

**قۆناغی دووەم: لە ڕۆژگاری خەلیفە ڕاشیدەکاندا:**

لەو بارەوە دوو دەق دەهێنین:

١- لە (تذكرة الحفاظ)دا هاتوە دەڵێ: (جمع أبو بكرٍ بَعض الأَحاديثِ ثُمَّ حَرَّقها قبل وفاته)[١]، واتە: ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ، چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) نووسیبوونەوە، پاشان لەنەخۆشی مەرگیدا سووتاندنی، {بانگی دایکمان عائیشەی خوا لێی ڕازی بێ کرد، گوتی: ئەو فەرموودانەم بۆ بێنە کە نووسیمبوونەوە، بۆی هێنان، ئەویش سووتاندنی}.

لە هەندێك ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە گوتی: (خاوەن کتێبەکان بەهۆی ئەو کتێبانەوەو بەهۆی شوێنەواری پێغەمبەرانیانەوە، کە لەگەڵ ئەصڵی وەحی خوادا تێکەڵیان کرد، سەریان لێشێوا) دووربینیی ئەوەی کردوە، کە هیچ شتێك لەگەڵ قورئاندا تێکەڵ نەبێ.

٢- {عن عروة بن الزبير أن عمر بن الخطاب رضي الله عنه أراد أن يكتب السنن، فاستشار في ذلك أصحاب رسول الله صلّى الله عليه وسلّم، فأشاروا عليه عامتهم أن يكتبها، فلبث شهراً يستخيرالله في ذلك شاكاً فيه، ثم أصبح يوماً وقد عزم الله له، فقال: إني ذكرت لكم من كتاب السنن، ما قد علمتهم ثم تذكّرت: فإذا أُناسٌ من أهل الكتاب قبلكم قد كتبوا مع كتاب الله، فأكَبُّوا عليها، وتركوا كتاب الله، وإني والله لا ألبس كتاب الله بشيء أبداً، فترك كتاب السنن}[٢].

واتە: عورِوەی کوڕی زوبەیر خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: (عومەر خوا لێی ڕازی بێ ویستی سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بنووسێتەوەو کۆی بکاتەوە، ڕاوێژی بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا کرد لەو بارەوە، زۆربەیان یان بە گشتی گوتیان: شتێکی باشەو بە پەسندیان زانی، ئەویش یەك

---

(١) تذكرة الحفاظ (١/٥).

(٢) طبقات ابن سعد (١/٣) ص ٢٠٦، وكنز العمال (٥/٢٣٩).

مانگ مایەوە، ئیستیخارەی دەكرد، چونكە دوو دڵ بوو، لەوەدا ئایا فەرمان بكا بینووسنەوە یاخود لێی گەڕێ؟، دوایی ڕۆژێك كە دڵی خۆی ساغ كردبۆوە لەسەر بڕیارێك گوتی: من ڕاوێژم پێ كردن دەربارەی نووسینەوەی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دوایی بیرم كردەوە كە زۆر لە خاوەن كتێبەكان لەپێش ئێوەدا لەگەڵ كتێبی خوادا هەندێ كتێبی دیكەیان نووسیبوون، دوایی گرنگییان بەو كتێبانەی دیكەداو وازیان لە كتێبی خوا هێنا، منیش هیچ شتێك لەگەڵ كتێبی خوادا تێكەڵ ناكەم، بۆیە وازی لە نووسینەوەی سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هێنا.

ئەم دوو دەقەش ئەوە دەگەیەنن كە هیچ ڕێگرێك نەبووە بۆ ئەوەی سوننەت نەنووسرێتەوە، هەم ئەبو بەكر خوا لێی ڕازی نووسیویەتەوە، كە دوایی سووتاندوونی، هەم عومەر خوا لێی ڕازی بێ بەتەما بووەو ڕاوێژی كردوەو دوایی وازی لێهێناوە، كەواتە: دەقێكی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەبووە ڕێیان لێ بگرێ، كەواتە: لەبەر چی ئاوایان كردوە؟ لەبەر دووربینی و ئاگر بڕی ئەوە كە قورئان وەك خۆی بمێنێتەوە، وە مسوڵمانان زیاتر سەرگەرم و خەریكی قورئان بن، گوتووشیانە ئەوەی كە پێویستە لە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژانە پراكتیزە دەكرێ لە ژیانی مسوڵماناندا: نوێژە، ڕۆژووە، حەجە، ڕەوشت و هەڵس و كەوتەكانە، هەڵسوكەوتی كۆمەڵایەتییە، سیاسییە، ڕۆژانە پراكتیزە كراوە، من وێنەیەكتان بۆ بێنمەوە، بەریتانیا كە وڵاتێكی زلهێزو پێشكەوتوە، تاكو ئێستا دەستوورێكی كۆكراوەی نییە، دەستوورێكی نووسراوی نیە، بەڵكو دەستوورەكەیان بریتییە لە عورفێكی سیاسی، بۆخۆیان دەزانن ئەوەی كە هەڵدەبژێردرێ بۆ سەرۆك وەزیران، دەبێ ماوەكەی چوار ساڵ بێ، دوای چوار ساڵەكە بۆخۆی دێتە خوار، بێ ئەوەی لە دەستوورێكدا نووسرابێتەوە، هەروەها وە زۆر شتی دیكە، هەمووی دەگەڕێننەوە بۆ عورفی سیاسی خۆیان، مەبەستم ئەوەیە بڵێم: بەڵێ، دەقەكانی سوننەت نەنووسراونەتەوە بە نووسین، بەڵام تێكەڵ بە كلتوورو ژیانی ڕۆژانەیان بووە بە كردەوە.

**قۆنـاغی سێیەم: لە ڕۆژگاری شـوێنكەوتووان (التـابعین)، وە شـوێنكەوتەی شوێنكەوتوواندا:**

شوێنكەوتووان جیلی دوای هاوەڵانن، شوێنكەوتووانی شوێنكەوتووانیش، جیلی دوای ئەوانن، (هاوەڵان، شوێنكەوتووان، شوێنكەوتەی شوێنكەوتووان) بۆیە دەڵێم: ئەو سێ جیلە چونكە زۆربەی زانایان دەڵێن: ساڵی (٢١٠)ك سنووری جیاكەرەوەیە لەنێوان ئەو سێ جیلەو جیلەكانی دواییدا، چونكە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {خَيْرُكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} أخرجه أحمد برقم (١٩٨٤٨)، والبخاري برقم (٢٥٠٨) ومسلم برقم (٢٥٣٥)، وأبو داود برقم (٤٦٥٧)، والترمذي برقم (٢٢٢٢) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٣٨٠٩).

چاكترینتان سەدەی منن، ئنجا هی دوای وان، ئنجا هی دوای وان.

هەروەها لە ڕیوایەتێكی دیكەدا هاتووە: {خَيْرُ أُمَّتِي الْقَرْنُ الَّذِينَ يَلُونِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ} أخرجه مسلم برقم (٣٩).

واتە: باشترینی ئۆممەتم ئەو سەدەیە كە لە دوامەوە دێ، ئنجا ئەوانەی دوای وان دێن، ئنجا ئەوانەی دوای وان دێن.

پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) سێ جیلی باس كردوون، هاوەڵان، دوایی ئەوانەی دوای وان (تابعین)، دوایی ئەوانەی دوای ئەوان (تابعی التابعین) ئەوانە ئیمتیازێكی تایبەتییان هەیە، پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) شاهێدیی بۆ داون كە ئەو سێ جیلە، ئەو سێ پشتە، لە هەموو جیل و نەوەكانی دیكەی مسوڵمانان خێریان زیاتر تێدایە، هەڵبەتە كەم و كوڕیش هەبووە لەو جیلانەدا، بەڵام خێریان زیاتر تێدایە، ئنجا قۆناغی سێیەمی كۆكردنەوەی سوننەت لەو دوو جیلەدا بووە: شوێنكەوتووان و شوێنكەوتووانی شوێنكەوتووان.

وە سەرەتای بەفەرمیی نووسرانەوەی دەقەكانی سوننەت، لە ڕۆژگاری عومەری كوڕی عەبدولعەزیزدا بوو، لەوێدا دەستی پێ كرد (إبن سعد) ئەو

دەقەی هێناوە، دەڵێ: {كتب عمر بن عبد العزيز إلى عامله[١] على المدينة أبي بكر بن محمد بن عمرو بن حزم:

أُنظر ما كان من حديث رسول الله صلى الله عليه وسلم، أو سنة ماضية، أو حديث عَمْرَة، فاكتبه فإني قد خِفْتُ دَرْسَ العلم وذَهَابَ أهله}[٢].

واتە: عومەر نامەی نووسی بۆ عامیلەكەی خۆی لەمەدینە كە (أبی بكر بن محمد بن عمرو بن حزم) بوو، {بۆی نووسی} سەرنج بدە! فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (سێ شتی لە نامەكەدا هێناون):

١) ئەوەی بەدەمی موبارەكی فەرموویەتی،

٢) یان كردەوەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە تێپەڕیوەو مسوڵمانان بەو شێوەیە ڕەفتاریان كردوە،

٣) یاخود ئەو فەرمایشتانەی (عەمرە)ش[٣]، هەموویان بنووسە چونكە من مەترسییم هەیە كە زانیاریی لەبیر بچێتەوە، وە زانایان بمرن {سەرەنجام ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زایە ببن}.

---

(١) (عامل) لەجێی پارێزگاری ئێستا بووە.

(٢) طبقات ابن سعد (٢/٢) ص ١٣٤.

(٣) ئینسان ئەگەر نەگەڕێتەوە بۆ ئەو كتێبانەی شەرحی سوننەت دەكەن دەڵێ: عەمرە دەبێ مەبەستی پێ چی بێ؟ ڕەنگە هەندێ كەس بڵێ: مەبەستی پێ عومرەیە، ئەوەی كە لەگەڵ حەجە، من كە گەڕامەوە بۆ سەرچاوەكان دەڵێ: (عمرة: هي عمرة بنت عبدالرحمن الأنصاري، وقد ضمّ إليها في بعض الروايات اسم القاسم بن محمد بن أبي بكر الصديق (١٠٧)هـ، وكلاهما من تلاميذ عائيشة، فكانا أعلم الناس بأحاديثها عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) علوم القرآن ومصطلحه، د. صبحي الصالح ص٢٤-٤٥ ط١٣ سنة ١٩٨١.
دەڵێ: (عەمرە) كچی (عبدالرحمن)ی ئەنصارییی بووە، لە هەندێ ڕیوایەتاندا گوتوویەتی فەرموودەی عەمرەو قاسمی كوڕی ئەبو بەكری صدديق، كە ئەو دووانە هەردووكیان قوتابی عائیشە بوون خوا لێی ڕازی بێ، وە لە هەموو كەس شارەزا تر بوون بەو فەرمایشتانەی دایكمان عائیشە كە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هێناونی

چۆن دەست بە کۆکردنەوەی سوننەت کرا؟

(إبن عبدالبَر) دەڵێ: {وكان أول من استجاب له: عالم الحجاز والشام محمد بن مسلم ابن شهاب الزهري المزني (١٢٤)هـ، الّذي دوّن له في ذلك كتابًا فغدا عمر يبعث إلى كل أرض دفترًا من دفاتره}[١]، واتە: یەکەم کەس کە وەڵامی داوایەکەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی دایەوە: زانای حیجازو شام زوهریی بوو، فەرمایشتەکانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی کە بەدەستی کەوت بەسەنەدی ڕاست نووسی، بۆ عومەری نارد، عومەریش چەند نوسخەی لەبەر گرتنەوە، بە شارەکاندا دابەشی کردن، کە ئەوە فەرمایشتەکانی پێغەمبەرن (صلى الله عليه وسلم).

بۆیە زوهریی گوتوویەتی: {لَم يدوِّن أحدٌ هذا العلم قبل تَدْويني}[٢]، واتە: ئەم زانیارییە هیچ کەس لەپێش مندا نەینووسیوەتەوە.

یەکێ بۆی هەیە بڵێ: ئەدی ئەو هاوەڵانەی لە پێش ئەودا نووسیویانەتەوە، وەك پێشتر هێنامان؟ زوهریی مەبەستی ئەوەیە بەشێوەیەکی ڕەسمیی کەس پێش وی نەینووسیوەتەوە، کە بەڕەسمیی سەرۆکی دەوڵەت ڕایسپێرێ و بینووسێتەوە، ئەو یەکەم کەس بوو، ئەگەرنا کەسانی دیکە وەك کاری شەخصیی خۆیان، فەرمایشتیان نووسیوەتەوە.

ئنجا لەم ڕۆژگارەدا واتە: لەسەردەمی (تابعين) و (تابعي التابعين)دا کە هەتا ساڵی (٢١٠)ك دەکا، ئەم زانایانە سوننەتیان کۆ کردەوە، ئەویش لەژێر چوار جۆرە ناوو نیشاندا:

أ- المصنَّفات، وەك (مصنَّف)ی (عبدالرزاق).

---

(١) جامع بيان والعلم (٧٦/١).

(٢) الرسالة المستطرفة، ص٤.

ب- المسانيد، وەك (المسند)ی (أحمد).

ج- الموطأ، وەك (الموطأ)ی (مالك).

د- الجامع.

بەڵام بەزۆریی ناوو نیشانی یەكەم و دووەم بەكار هێنراون.

أ- المصنَّفات:

١- (إبن إسحاق) لە (١٥١)ك وەفاتی كردوەو لە مەدینە بووە.

٢- (إبن جريج) لە (١٥١)ك وەفاتی كردوەو لە مەككە بووە.

٣- (الأوزاعي) لە (١٥٦)ك وەفاتی كردوەو لە شام بووە.

٤- (شعبە بن حجاج) كە لە (١٦٠)ك وەفاتی كردوەو لە بەصرە بووە.

٥- (سفيان الثوري) كە لە (١٦١)ك وەفاتی كردوەو لە كووفە بووە.

٦- (ليث بن سعد) لە (١٧٥)ك وەفاتی كردوەو لە مصر بووە.

٧- (مالك بن أنس) لە (١٧٩)ك وەفاتی كردوەو لە مەدینە بووە.

٨- (عبدالله بن مبارك) لە (١٨١)ك وەفاتی كردوەو لە خۆڕاسان بووە.

٩- (سفيان بن عيينة) لە (١٨٥)ك وەفاتی كردوەو لە مەككە بووە.

١٠- (عبدالرزاق بن همام) لە (٢١١)ك وەفاتی كردوەو لەیەمەن بووە.

ئنجا لەو قۆناغەدا كە دەقەكانی سوننەت كۆكراونەوە، ئەوە نەبووە بەس فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ، یان بەس سوننەتە كردەییەكانی بێ، بەڵكو (فیقهو، ئیجتیهادو، ڕای هاوەڵان و، هەندێ جار ڕای تابعینیشی) تێدا بووە، یانی كۆكردنەوەی هەم فەرمووودەو هەم فیقهیش بووە، ئەگەر تەماشای (الموطأ)ی ئیمام مالیك بكەن، هەم فەرموودەیە، هەم قسەی هاوەڵانە، هەم قسەی شوێنكەوتووانیشی تێدایە، وە جاری وایە ڕای خۆشی دەڵێ.

ب- المسانيد:

له قۆناغێكی دیكەدا هەر له چەرخی (تابعين و تابعي التابعين)دا، شێوەیەكی دیكەی كۆكردنەوەی فەرمووده دەستی پێ كرد، كه بریتییه له شێوەی (مسانيد)دا، - (مسانيد) كۆی (مسند)ه -، ئەو زانایه هاتوه بۆ وێنه عەبدوڵڵای كوڕی عومەر چەند فەرموودەی له پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەرگرتوون، هەمووی بەیەكەوه كۆكراوەتەوەو ناوی نراوە: (مسند عبدالله بن عمر)، هی (أبو هريرة) ناوی نراوە: (مسند أبو هريرة) هی عائیشه ناوی نراوە: (مسند عائشة)، چەند فەرمووده لەو هاوەڵانەوه هاتوون، هەموو فەرموودەكانی ئەو هاوەڵەی بەیەكەوه هێناون، چونكه هەبووه زیاتر متمانەی به عائیشه بووه، هەبووه زیاتر متمانەی به عەبدوڵڵا بووه، چونكه بەره بەره كه ململانێی سیاسی دەستی پێ كردوه، هەبووه هەستیاریی هەبووه بەرامبەر یەكێك، ئەو فەرموودانەی كه لەو كەسەوه هاتوون، وەری نەگرتوون، بەهەر حاڵ لەوانەیه هۆكاری دیكەشی هەبووبێ، جارێ ئەو زانستی فەرموودەیه كامڵ نەبووەو باش پێنەگەیشتوه، ئەمەش هەوڵێك بووه.

١- یەكەمین كەس كه (مسند)ێكی كۆ كردەوە: (أبو داود الطيالسي) بوو كه له ساڵی (٢٠٤)ك وەفاتی كردوه.

٢- هەروەها (مسند)ەكەی (أحمد بن حنبل) یەكێكی دیكەیه لەو (مسند)انه، كه (٤٠٠٠٠) فەرمایشتی تێدایه، وەپێشەوا ئەحمەد له ساڵی (٢٤١)ك دا، وەفاتی كردوه، ئەم دووانه وەك نموونه باسكران.

**قۆناغی چوارەم: قۆناغی کامڵ بوونی کۆکردنەوەی سوننەت.**

دیارە قۆناغی چوارەم دەکەوێتە نێو سەدەی سێیەمی کۆچیی، چونکە خاوەنانی شەش کتێبەکە (أصحاب الكتب الستة) بوخاریی، موسلیم، ئەبو داوود، تیرموذیی، ئیبن ماجە، نەسائیی، هەر شەشیان لە سەدەی سێیەمی کۆچییدا وەفاتیان کردوە، جگە لە (نەسائیی) کە لە (٣٠٣)ك وەفاتی کردوە، واتە: سێ ساڵ دوای سەدەی سێیەم.

١- (محمد بن إسماعيل البخاري) لە (٢٥٦)ك دا، وەفاتی کردوە، کتێبەکەی (الجامع الصحيح) (٩٠٨٢) دەقی تێدایە، بە دووبارەوە، بەبێ دووبارەش (٢٠٦٢) دەقی تێدایە، بۆیە دەڵێم: دەق، چونکە مەرج نییە هەمووی فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ، هەندێ کەس وا دەزانێ کە گوترا: (صحيح البخاری) ئەوە هەمووی فەرمایشتی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، نا، تەماشای بکەن: هەم قسەی هاوەڵان و، هەم قسەی تابعینیشی تێدایە.

٢- (مسلم بن حجاج النيسابوري) لە ساڵی (٢٦١)ك دا، وەفاتی کردوە، ئەویش هەر (الجامع الصحيح)ی هەیە کە (٤٠٠٠) فەرموودەی تێدایە، مەگەر چۆن ئەگەرنا هەمووی فەرموودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، بۆیە هەندێك لە زانایان (صحيح مسلم)یان پێ صحيح ترو ڕێك ترە لە هەندێ ڕووەوە لە هی بوخاریی.

٣- (أبو داود سليمان بن أشعث السجستاني) لە (٢٧٥)ك دا، وەفاتی کردوە، ئەویش کتێبەکەی بەناوی (سنن أبي داود)ە.

٤- (أبو عيسى محمد بن سَورة الترمذي السُّلَمي) لە (٢٧٩)ك دا، وەفاتی کردوە، ئەویش کتێبەکەی بە (سنن الترمذي) مەشهوورە، هەرچەندە کتێبەکەی ناوی (الجامع الصحيح)ە.

٥- (محمد بن يزيد بن ماجه القزويني) لە (٢٧٣)ك دا، وەفاتی کردوە، ئەویش کتێبەکەی بەناوی (السنن)ە.

٦- (أحمد بن شعیب بن علی النسائي) له (٣٠٣)ك دا، وەفاتی کردوه.

هەڵبەته که هەردوو کتێبەکەی: (بوخاریی و موسلیم) لەلای زۆربەی زانایان به باشترین و ڕاستترین کتێبی فەرمووده دانراون، لەدوای، وان ئەو چوارەی دیکه، بەڵام که دەڵێین بەباشترین و ڕاستترین سەرچاوەی فەرمووده، مانای وا نیه که هیچ تێبینیشیان لەسەر نیه، هەندێ له زانایانی لێکۆڵەرەوەی فەرمووده، تێبینییان هەیه لەسەر هەندێ لەو فەرموودانەی هەم بوخاریی، هەم موسلیم و، هەم چوارەکەی دیکەش هێناویانن.

بەڵام ئەوەش نابێ ببێته بیانووی ئەوەی له کۆی فەرموودەکانیان بکەوینه گومانەوە، که وەك دیاره ئەوانه زۆر لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دوور نەکەوتوونەوە، پاشان ئەوان زۆر دووربینییان کردوه له گێڕانەوەی فەرمووداندا.

بۆ وێنه: له ژیانی بوخارییدا هاتوه: گوێ بیست بووه که پیاوێك فەرمایشتێکی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) له لایه، ویستوویەتی بچێ لێی وەربگرێ، که دەبوو خۆی بچێ ببینێ، ئنجا تۆ لەکێت بیستووه؟ له فلان، وه ئەویش له فلان، تاکو دەچێتەوه سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، که دەچێته لای، دەبینێ ئەو پیاوه وڵاخێکی لێ بەرهەڵدا بووه، چووه بیهێنێتەوه، تەماشای پیاوەکه دەکا کۆشی خۆی کردۆتەوه، بوخاریی پێی دەڵێ: ئەوه ئالیکت له کۆشت کردبوو؟ ئەویش دەڵێ: نەخێر لمم بۆ تێکردبوو که وابزانێ ئالیکه، بۆ ئەوەی بیگرمەوە، بوخاریی دەڵێ: هاتووم فلان فەرموودەت لێ وەربگرم، پیاوەکەش دەڵێ: له لامه، بوخاریی دەڵێ: تازه لێت وەرناگرم، چونکه تۆ لەگەڵ ئەو وڵاخەدا ڕاست نەکەی، ڕەنگه لەگەڵ منیشدا ڕاست نەکەی، تۆ ئەو وڵاخەت هەڵخەڵەتاندوه!! ئەوان ئەوەنده هەستیار بوون له وەرگرتنی فەرمووده‌دا، کەسێك هەر تۆزێك تێبینیان لەسەر هەبووبێ، فەرموودەیان لێ وەرنەگرتوه، بەهەرحاڵ ئەوەی ئێمه (١٠٠٪) لێی دڵنیاین، هەر کتێبی خوایه، بەڵام لەکتێبەکانی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەو شەش کتێبه بەپلەی یەکەم دێن، وه لەنێو ئەوانیشدا بوخاریی و موسلیم، ئنجا چوارەکەی دیکه.

## قۆناغی پێنجەم: قۆناغی كۆتایی تۆمار كردنی سوننەت:

بە حەقیقەت ئەو شەش كتێبەی باسمان كردن، - مەگەر چۆن ئەگەرنا - هیچ فەرموودەیەكیان نەهێشتۆتەوە كە ڕاست بووبێ و، ئەوان نەیانهێنابێ، بەڵام لە قۆناغی پێنجەمیشدا كۆمەڵێك زانا، دیسان لە بواری كۆكردنەوەی سوننەت دا، هەوڵیاندا كە من هەندێكیانم لێ بە نموونە هێناونەوە:

١- (إبن خُزيمه النيسابوري)، كە لە (٣١١)ك دا، وەفاتی كردوە، كتێبێكی هەیە بەناوی: (صحيح إبن خزيمه)، زانایان دەڵێن: كۆمەڵێك فەرموودە كە لە كتێبەكانی دیكەدا نەهاتوون، ئەو هێناونی، هەندێكیان دووبارەن، بەڵام ئەو بە سەنەدی خۆی دەیانهێنێ[1].

٢- (أبو حاتم إبن حِبّان البستي) لە (٣٥٤)ك دا، وەفاتی كردوە، كتێبەكەی بەناوی: (صحيح إبن حِبّان)، كتێبێكی زۆر نایابە، زۆر لە فەرمایشتەكانی كۆ كردۆتەوە، بەڵام مەرج نییە كە ناوی ناوە (صحيح)، هەمووشیان (صحيح) بن.

٣- (علي بن عمر الدارقطني) لە (٣٨٥)ك دا، وەفاتی كردوە، كتێبەكەی بەناوی: (سنن الدارقطني).

٤- (أبو بكر بن الحسين البيهقي) لە (٤٨٥)ك دا، وەفاتی كردوە، واتە: لەسەدەی پێنجەمدا، (السنن الكبرى) وە (شِعَب الإيمان)ی هەن، كتێبی زۆرن.

٥- (أبو قاسم سليمان بن أحمد الطبراني) لە (٣٦٠)ك دا، وەفاتی كردوە، (الطبراني) زیاتر بە سێ (معجم)ەكەی مەشهوورە، كە (معجم)یش شێوەیەكی

---

(١) بۆزانیاریتان! جاری وایە بوخاریی و موسلیم یەك فەرموودە دەهێنن، هەریەكەیان بە سەنەدی خۆی، جاری وا هەیە بۆ فەرموودەیەك دەڵێن: (رواه أصحاب الكتب الستّة)، یانی چی؟ نەچوون هەریەكەیان لە ئەوی دی وەربگرێ، بەڵكو هەر كامیان بەسەنەدی خۆی، ئەو دەقەی هێناوە، مانای وایە هێزی زیاتر دەداتە ئەو فەرموودەیە، فەرموودەیەك لە شەش ڕێگاوە هاتبێ، لە شەش لە هاوەڵان، یاخود جاری وایە لە سەد (١٠٠) هاوەڵەوە هاتوە، ئەمەش دیارە زۆر لەوە دوور دەكەوێتەوە كە جێی گومان و دوو دڵیی بێ.

دیکە بووە لە کۆکردنەوەی فەرموودە، (معجم) کە بە (معاجم) کۆ دەکرێتەوە، بە پێی پیتی (ئەبجەدیی) هێناویانە، (الطبراني) سێ (معجم)ی هەن: (الکبیر، الوسیط، الصغیر).

٦- (الحاكم النیسابوری) کە لە ساڵی (٤٠٥)ك دا، وەفاتی کردوە، کتێبێکی هەیە: (المستدرك علی الصحیحین) واتە: ئەو فەرموودانەی کە بەپێی مەرجەکانی بوخاریی و موسلیمن، بەڵام ئەوان نەیانهێناون، ئەو لەو کتێبەی خۆی هێناونی.

٧- (حسین بن مسعود البغوی) لە (٥١٦)ك دا، وەفاتی کردوە، واتە: لە سەرەتای سەدەی شەشەمەوە، کتێبێکی هەیە بەناوی (مصابیح السنه) وە یەکی دیکە بەناوی (شرح السنة).

٨- (إسماعیل بن عمر بن کثیر) لە (٧٧٤)ك دا، وەفاتی کردوە، واتە: لەسەدەی هەشتەمی کۆچیدا وەفاتی کردوە، کتێبێکی هەیە بەناوی: (جامع المسانید والسنن) کۆکەرەوەی هەموو ئەو فەرموودانەیە کە بەشێوەی (سنن) یان (مسانید) هاتوون.

ئەمە قۆناغەکانی کۆکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو.

## ٦- جۆرەكانی سوننەت

ئایا كە دەگوترێ: ئەمە فەرمایشتی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، هەمووی یەك پلەیەو یەك جۆرە؟ نەخێر، سوننەت بە گشتی دەبێتە سێ بەش، بۆخۆی دوو بەشی سەرەكییە، (صحیح) وە (حسن) بەڵام بەشێكی دیكەشی هەیە، كە پێی دەگوترێ: (ضعیف)، بەم شێوەیە:

### جۆرەكانی سوننەت:

**سوننەت بەگشتی (لەڕووی سەنەدەوە) سێ جۆرە:**

١- ڕاست (صحیح) ٢- باش (حسن) ٣- بێ هێز (ضعیف)

**یەكەم: جۆری یەكەمی سوننەت لەڕووی سەنەدەوە:**

### ڕاست (صحیح):

كە زانایان ئاوا پێناسەیان كردوە: {فهو الحديث المسند الذي يتَّصِلُ إسناده بنقل العدل الضابط عن العدل الضابط إلى منتهاه، ولا يكون شاذّا ولا مُعَلَّلاً}، واتە: بریتیە لەو فەرموودەیەی پاڵ دراوەتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لە ڕێی زنجیرەیەك ڕاناوی دادگەرو پارێزەری پێكەوە پەیوەست لەسەرەتای تاكو كۆتایی {كە دەگوترێ (عدل) یانی: كەسێك كە گوناهی نەكردبێ، خۆی لە گوناهان پاراستوە، گوناهی گەورەی نەكردوون و لەسەر گوناهی گچكەش بەردەوام نەبووە، وە (ضابط) ئەوەیە جاری وا هەبووە بابایەك فەرمانبەر بووە بۆ خوا، بەڵام پاراستن (ضبط)ی نەبووە، واتە: خۆی كۆنترۆڵ بكا، شتی لەبیر نەچێ، شتەكە باش لەبەر بكا، لێی تێكەڵ نەبێ، دەبێ ئەو دوو سیفەتەی تێدا هەبن،

تا دەگاتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) یاخود، تاكو دەگاتە سەر هاوەڵ یان تابعیی، ئنجا ئەگەر بگاتە سەر تابعیی ئەوە پێی دەگوترێ: (مرسل)} و دەبێ (شاذ) نەبێ، (شاذ) ئەوەیە ئەو دەقە شتێ بێنێ، هیچ كام لە دەقەكان ئەو شتەیان نەهێنابێ، (ولا مُعَلَّلاً) واتە: نەخۆشییەكی نەبێ لەو نەخۆشییانەی كە فەرموودەیان پێ ڕەت دەكرێتەوە.

**بەشەكانی سوننەتی (صحیح):**

سوننەتی ڕاست (صحیح) دووجۆرە:

**١)**- بەشی یەكەمی سوننەتی ڕاست (صحیح) (**المتواتر**): {وهو الحديث المتواتر الذي يرويه جمع يحيلُ العقلُ في العادة تواطؤَهم على الكذب، عن جمعٍ مثلهم من أول السند ووسطه وآخر}

واتە: ئەو فەرموودەیەیە كە كۆمەڵێك دەیگێڕنەوە لە كۆمەڵێكی دیكە، ئەوانیش لە كۆمەڵێكی دیكە، تاكو دەگاتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە ئەو كۆمەڵە ئەوەندە زۆربن، بە عەقڵ و عادەت نەگونجێ ئەو كۆمەڵە لەسەر درۆ كۆببنەوە، ئەوەش هەم لە سەرەتای سەنەدەكەیەوە، هەم لە نێوەڕاستی، هەم لە كۆتاییدا، (واتە: هەر كە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەست پێ دەكات، بەكۆمەڵ ئەو فەرموودەیە بەو شێوەیە هاتبێ).

**دیارە (متواتر)یش دیسان دوو جۆرە:**

**أ**- موتەواتیری بێژەیی (المتواتر اللفظي):

**ب**- موتەواتیری واتایی (المتواتر المعنوي):

**أ- موتەواتیری بێژەیی (المتواتر اللفظي):**

{وهو الذي رواه جمع مذكور من أول السند ووسطه وآخره، بلفظٍ واحدٍ وصورةٍ واحدة} واتە: ئەوەیە كە كۆمەڵێك كە نەگونجێ لەسەر درۆ كۆببنەوە، لەسەرەتای

سەنەدەکەیەوە کە لە پێغەمبەرەوە بیستوویانە، وە لە نێوەڕاستی، وە لە کۆتاییەکەیدا بەیەك بێژەو بەیەك شێوە هاتبێ.

(إبن صلاح) لەو بارەوە دەڵێ: {وهو عزيز جداً، بل لا يكاد يوجد، ومن سئل عن إبراز مثال لذلك، أعياه تطلّبه} واتە: ئەو جۆرە زۆر کەمە[1]، بەڵکو ڕەنگە بەدەست نەکەوێ، وە ئەگەر کەسێك لێی بپرسێ: فەرمووودەیەکی موتەواتیری بێژەیی بێنە، ڕەنگە زۆر ماندوو بێ تا دەیهێنێ.

ئنجا زۆر لە زانایان دەڵێن: ئەصڵەن ئەستەمە فەرمووودەیەکی وا هەبێ، لەکاتێکدا بەمەرج بگیرێ: هەمان وشە، بەهەمان شێوەو هەمان چۆنیەتی، ئەدا بکرێ، لەبەر چی؟

ئەوە لەبەر ئەوەبووە چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شتێکی فەرمووە، بۆ وێنە: لەو فەرمووودەیەدا فەرموویەتی: (قعد)، ئەو هاوەڵە وشەی (جلس)ی بەکار هێناوە، کەواتە: ئەو کاتە ئەو مەرجە نایەتەدی، هەرچەندە هەردووکیان مانایان لێك نزیکە، یان وشەی (نبي) و(رسول)، ئەگەر یەکێکیان لە شوێنی ئەوی دیکەیان بەکار بێنێ، ئەوە لێرەدا بێژەکەیان جیا بوو، بۆیە گوتوویانە، تەواتوری بێژەیی ١٠٠٪، تەنها قوڕئانمان هەیە.

بەڵام هەندێ لە زانایان دەڵێن: نەخێر هەمانە، بۆ وێنە: (السيوطي) کتێبێکی هەیە بەناوی (الأزهار المتناثرة في الأخبار المتواترة)، واتە: (گوڵەپرژو بڵاوەکان، لە هەواڵە موتەواتیرەکان).

**لەو وێنانە کە دەیانهێننەوە بۆ فەرمووودەی موتەواتیری بێژەیی:**

١- شەق بوونی مانگ، کە هەر شەش کتێبەکان هێناویانەو لە زۆر لە هاوەڵانەوە هاتوە.

---

(١) بە حەقیقەت (إبن الصَّلاح) پیاوێکی زۆر شارەزاو بە ئینصاف بووە، ئێستا هەیە لێی بپرسی، دەڵێ: ئا زۆر زۆرە.

٢- هەروەها فەرموودەی: {مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ} أخرجه أحمد برقم (١١٩٦٠)، والبخاري برقم (١٠٨) ومسلم برقم (٢)، والترمذي برقم (٢٦٦٠) والنسائي في الكبرى برقم (٥٩١٤)، وإبن ماجة برقم (٣٢).

واتە: هەركەسێ بە ئەنقەست درۆ بە دەمی منەوە بكات، با شوێنێك بۆخۆی لە ئاگردا هەڵبگرێ، (إبن صلاح) دەڵێ: (٦٢) هاوەڵ ئەو فەرموودەیەیان لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بیستوە، هەندێ لە زانایان دەڵێن: تەنها ئەم فەرموودەیە موتەواتیری بێژەییە.

٣- یەكێكی دیكە لەو فەرموودانە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ بَنَى لِلَّهِ مَسْجِدًا...}.

٤- هەروەها (حديث الشفاعة).

٥- (أنين الجَذَع)، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەر بنكە دارخورمایەك وتاری دەدا، ئافرەتێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من غوڵامێكی دارتاشم هەیە، با مینبەرێكت بۆ دروست بكا، ئەویش فەرمووی: با بۆم دروست بكا، ئنجا كە چووە سەر مینبەرەكە، ئەو بنكە دارخورمایە، وەك چۆن بەچكە وشتر بۆ دایكی دەناڵێنێ، ئاوا گریاو ناڵاندی، دیارە بۆیەش موتەواتیرە چونكە هەموو هاوەڵان لە مزگەوت گوێیان لێبوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مینبەرەكەی دابەزی دەستی پێدا هێنا، تاكو بێدەنگ بوو، فەرمووی: ئەوە پێی ناخۆش بوو كە من چیدیكە لەسەر ئەو وتار نادەم، بۆیە ئاوا ناڵاندی.

٦- یەكی دیكە لەو فەرموودانە بریتییە لە: مەسح لەسەر خوف.

٧- هەڵقوڵینی ئاو لەنێوان پەنجەكانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، چوون بۆ تەبووك ئاویان لێبڕا، هەموو چاویان لێبووە (٣٠٠٠٠) هاوەڵی لە خزمەتدا بووە.

٨- یەكی دیكە لەوانە: قەتادە كە چاوێكی بە تیر پێكراوەو دەچێتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چاوەكەی لەسەر دەستی دادەنێ، دەڵێ: ئەی

پێغەمبەری خوا! تازە ژنم هێناوە، ئەگەر دوعام بۆ بکەی، ئەویش لە شوێنی خۆی داینایەوەو دوعای بۆ کرد، هاوەڵان دەڵێن: ئەو چاوەیانی لەوەی دیکەشی جوانتر بوو.

٩- خواردنێکی کەم بایی دوو سێ نەفەر، چەند سەد نەفەر پێی تێر بووە، ئەوانە هەموویان لەجۆری موتەواتیری بێژەیی (لفظي)ن، چونکە زۆربەی هاوەڵان لەوێبوون، کە ئەو شتانە ڕوویان داوە[١].

**ب- موتەواتیری (المتواتر المعنوي):**

جۆری دووەمی موتەواتیر کە ئەوە هەموو زانایان لەسەری یەکدەنگن، موتەواتیری مەعنەویی پێ دەڵێن، ئاوا پێناسە کراوە: {الذي يُكتفى فيه بأداء المعنى ولو إختلفت رواياته، وهذا النَّوع كثير جداً مثل: أحاديث رفع اليدين في الدعاء، إذ رويَ فيه مائة حديث جمعها السيوطي في جزء} واتە: ئەوەیە کە بەوەندە ئیکتیفا دەکرێ، کە لە مانادا یەك بگرێتەوە، با بێژەکانیشی جیا جیابن، چونکە جاری وا هەبووە ئەو هاوەڵە بەپێی زار (لهجە)ی خۆی گێڕاویەتەوە، کە زمانی عەرەبییش هەمووی یەك لەهجە نەبووە، وەك چۆن لە کوردییدا بادینیی و سۆرانیی و هەورامیی هەن، لەنێو سۆرانیشدا هەولێریی و سلێمانی و پشدەریی هەن، زمانی عەرەبیش وابووە، بۆیە جاری وابوو (ڕاوی)یەك یان زانایەك، وشەیەکی لە شوێنی وشەیەکی دیکە بەکار هێناوە، بۆ ئەوەی خەڵکەکە لێی تێبگا، تەواتوری مەعنەویی ئەوەیە کە لە مانادا وەك یەك بن، با بێژەکانیشیان جیا بێ، کە ئەمە زۆر زۆرە، بۆ وێنە:

بەرز کردنەوەی دەستەکان لەکاتی پاڕانەوەدا، ئەمە بە موتەواتیری مەعنەویی دادەنرێ، چونکە (١٠٠) فەرموودە لەو بارەوە هاتوون و، (سیوطي) لە کتێبێکی سەربەخۆدا، ئەو کتێبانەی هەموو کۆ کردوونەتەوە، ئەمە جۆری یەکەمی فەرموودەی (صحیح)، کە بریتی بوو لە موتەواتیر.

---

(١) بڕوانە: علوم الحديث ومصطلحه، د. صبحي الصالح، ص ١٤٥-١٥٠.

٢)- بەشی دووەمی فەرموودەی (صحیح) (الآحـــاد):

کە بەمجۆرە پێناسەکراوە:

{هو ما لم يجمع شروط التواتر}[١]، ئەوەیە کە مەرجەکانی تەواتوری تێدا کۆ نەبووبنەوە، ئیدی مەرج نییە تەنیا یەك لە هاوەڵان لە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بیستبێ، با دە (١٠) کەس لێیان بیستبێ، بەڵام ناگاتە ڕاددەی تەواتور، تەواتور ئەوەیە ژمارەیەکی وابن کە عەقڵ ڕێ نەدا لەسەر درۆ کۆببنەوە.

ئنجا لەنێو زانایاندا لەو بارەوە ڕاجیایی هەیە، کە ئایا فەرموودەی (صحیح) کە موتەواتیر نەبێ، زانیاریی دڵنیاکەر دەگەیەنێ، یاخود تەنیا گومانی زاڵ دەگەیەنێ؟؟ (هل يفيد العلم اليقيني القطعي، أو يفيد الظن الرّاجح فقط)؟؟ ئەوەش مەسەلەیەکی زانستییە لەنێو زانایاندا، ئەگەر گوتت: فەرموودەیەك کە موتەواتیر نیە زانیاریی جێی دڵنیایی دەگەیەنێ، ئەو کاتە ئەوە حوکمی لەسەر دامەزرێ، بۆ وێنە: هاتنی دەججال، هاتنە خوارەوەی عیسا سەلامی خوای لێبێ، ئەوانە بە فەرموودەی ئاحاد هاتوون، ئنجا ئەگەر گوتت: فەرموودەی ئاحاد زانیاریی دڵنیاکەر دەگەیەنێ، ئەو کاتە ئەوەی بڵێ: بڕوام پێی نییە، بۆ ئیمانەکەی جێگای مەترسییە، بەڵام ئەگەر گوتت: نەخێر تەنها گومانی زاڵ دەگەیەنێ، ئەو کاتە ئەو کەسەی دەڵێ: بڕوام بەوە نیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویێتی، نیشانەی پرسیاری ناکەوێتە سەرێ لەو بارەوە زانایان مشت و مڕیان زۆر بووە، بۆ وێنە:

(النووي) دەڵێ: {حديث الآحاد لا يفيدُ غيرَ الظن} واتە: فەرموودەی ئاحاد تەنیا گومانی زاڵ دەگەیەنێ[٢].

---

(١) علوم الحديث ومصطلحه، ص ١٤٥-١٥٠.

(٢) شرح صحيح مسلم، لە علوم الحديث ومصطلحه، ص ١٥١.

بەڵام (إبن حزم) دەڵێ: {يفيد العلم والعمل معاً}[١]، زانیاریی جێی دڵنیایی دەگەیەنێ و كاریشی پێ دەكرێ.

هەڵبەتە لەسەر ئەوە كە فەرموودەی ئاحاد كاری پێ دەكرێ، زانایان زۆربەیان یەك دەنگن، كە هەر ئەوەش ڕاست و هەقە، چونكە بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نامەی نووسیوە بۆ (هرقل) یان بۆ (كیسرا) بەیەكێ لە هاوەڵاندا ناردوویەتی، یان یەكێكی ناردوە بۆ شوێنێك، كە ئەو خەڵكە ئاگادار بكەوە، ئنجا كە یەكێكی ڕەوانە كردوە، ئەو كەسە هەرچییەكیان پێ دەڵێ، ئەو خەڵكە پێیەوە پابەند كراو (مُلْزَم) دەبن، كەواتە: هەر هەواڵێكی ڕاستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ئێمە بگا، ئەوە ئێمە پابەند كراو دەكا كە كاری پێ بكەین، ئەدی لە چیدا زانایان كێشەیان هەبووە؟ لە بواری عەقیدەدا، كە ئایا ئەگەر كەسێك بڕوای بە فەرموودەیەك نەبێ لە بواری ئیمان و عەقیدەدا - كە دەبێ لەسەر بناغەی دڵنیایی بنیات بنرێ- كە لە ڕێگایەكی ئاحادەوە هاتوە، نەك موتەواتیر، ئایا پێی كافر دەبێ، یان نا؟ مشت و مڕەكە لەوێدایە.

**دووەم: جۆری دووەمی سوننەت لەڕووی سەنەدەوە باش (الحَسن):**

كە ئاوا پێناسە كراوە: {هوَ ما اتَّصل سَنَده بِنَقل عَدلٍ خَفيف الضَبْط، سليم من الشذوذ والعلّة}[٢]، واتە: ئەوەیە كە: زنجیرەی ڕاوییەكانی بەیەكەوە پەیوەست بن و، هەموویان دادگەر بووبن، بەڵام مەرج نیە كۆنترۆڵكردن (ضبْط)یان وەك پێویست بووبێ، بەڵام ئەو فەرموودەیەش دەبێ حاڵەتی (شذوذ)ی نەبێ و، لە هەر عیللەت و نەخۆشییەك كە فەرموودەی پێ ڕەت دەكرێتەوە، سەلامەت بێ.

ئنجا فەرموودەی (حسن)یش دوو جۆرە:

**١)- (حسن لذاته):** چاكییەكەی لە خودی خۆیدا بێ، بێ ئەوەی پێویستیی بەدەرەوەی خۆی بێ.

---

(١) علوم الحديث ومصطلحه ص ١٥١.

(٢) المقدمة، إبن صلاح، ص ١٥٦، وعلوم الحديث ومصطلحه، ص ١٥٦.

**٢)- (وحسن لغيره):** ئەوەیە كە لە سەنەدەكەیدا (راوي)یەكی حاڵ پۆشراو (مستور) هەبێ، كە نە شایستەیی، پێی زانرابێ، نە ناشایستەیەتیی، بەڵام نابێ گێل و زۆر هەڵە كار بێ یان تۆمەتبار بە درۆكردن و، (متن)ەكەی بە (متابع)ێك یان (شاهد)ێك پشتگیریی كرابێ[١].

**سێیەم: جۆری سێیەمی سوننەت لەڕووی سەنەدەوە بێهێز (ضعيف)[٢]:**

فەرموودەی بێ هێز، ئاوا پێناسە كراوە: {ما لم يجتمع فيه شروط الصحيح، ولا الحسن}[٣]، ئەوەیە كە نەسیفەتەكانی فەرموودەی (صحيح) و نە سیفەتەكانی فەرموودەی (حسن)ی تێدا كۆ بووبنەوە.

بەڵام پێم وایە، ڕاستتر وایە بگوترێ: فەرموودەی بێهێز ئەوەیە، كە یەكێك لە مەرجەكانی (صحيح) یان (حسن)ی تێدا نەهاتبێتەدی.

ئەمەش بەهەر حاڵ زانایان هەر هێناویانە، چونكە جاری وابووە هەندێ فەرموودەیان بە بێ هێز داناوە، دوایی لێیان كۆڵیەوەتەوە: نەخێر ئەو زانایە بەهەڵەدا چووە كە گوتوویەتی: بێهێزە، یان فەرموودەی دیكە بەهێزی كردوە، لەبەر ئەوە هێناویانە، نەك هەر ئەوە، بگرە زانایان هی هەڵبەستراو (موضوع) یشیان هەر هێناون، بۆ ئەوەی مسوڵمانان بزانن كە ئەوانە هەڵبەستراون و تێكەڵ نەبن لەگەڵ ئەوانەی دیكەدا، ئنجا (إبن صلاح) گوتوویەتی: جۆرەكانی بێهێز زۆر زۆرن، بەڵام لە (٤٢) جۆر تێناپەڕن[٤]، هەندێكیش گوتویانە: لەو ژمارەیەش تێدەپەڕن، بۆ وێنە: هەر كام لە: (مرسل، منقطع، معضل، مدلس، معلق، مضطرب، مقلوب، الشاذ، المنكر، المتروك ...) ئەمانە هەموویان جۆری بێهێزن، یانی: ئەوانەن كە بە بێهێز دادەنرێن، نە ڕاستن و نە باشن.

---

(١) علوم الحديث ومصطلحه ص ١٥٧.

(٢) بە حەقیقەت ئەو ناوەم پێ خۆش نیە، بەڵام زانایان وایان داناوە.

(٣) علوم الحديث ومصطلحه ص ١٦٥.

(٤) هەمان سەرچاوەو لاپەڕ.

## ٧- هۆیەکانی هەڵبەستن (أسباب الوضع) و چۆنیەتی جیاکردنەوەی فەرموودە و قسەی هەڵبەستراو

### أ- هۆیەکانی هەڵبەستن (أسباب الوضع)

**جارێ با بزانین فەرموودەی هەڵبەستراو (موضوع) یانی چی؟![1].**

پێناسەکەی ئاوایە: {فالموضوع هو الخبر الذي يختلقه الكذابون وينسبونه إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم افتراءً عليه}[2]، واتە: بریتیە لەو هەواڵەی کە درۆزنەکان هەڵیدەبەستن، وە پاڵی دەدەنە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و بەدەمی ئەوەوە هەڵی دەبەستن.

ئنجا ئایا بۆچی پەنا براوەتە بەر درۆ هەڵبەستن بەدەمی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)؟

١- زانایان دەڵێن: لە ساڵی (٤١)ك بەم لاوە، دەست کرا بە قسە هەڵبەستن بەدەمی پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم، دوای ئەوەی کە مسوڵمانان لەنێوان خۆیاندا بوونە بەش بەش، (خەواریج، شیعەی عەلی، شیعەی موعاویە)[3]. خەڵکێك پشتگیریی عەلییان دەکرد، کە بێگومان ئەو لەسەر هەق بوو، خەڵکێکیش پشتگیریی موعاویەیان دەکرد، وە خەڵکێکیی دیکەش هەبوون باوەڕیان بە هیچیان نەبوو، ئنجا وردە وردە خەڵکی دیکەش پەیدا بوون، ئیدی

---

(١) هەڵبەتە ئەوە زمان وا ڕاهاتوە دەگوترێ: فەرموودەی هەڵبەستراو، ئەگەرنا شتێك هەڵبەسترابێ، پێی ناگوترێ فەرموودە، بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا لەقەڵەم نادرێ، (صلی الله علیه وسلم)، دەبوو بگوترێ: دەقێکی هەڵبەستراو.

(٢) علوم الحديث ومصطلحه، د. صبحي الصالح، ص ٢٦٣.

(٣) وشەی (شیعة) یانی: کۆمەڵ.

لەو كاتەوە درۆ هەڵبەستن بەددەمی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) پەنای پێ برا، كەواتە: هۆكاری یەكەم، مشت و مڕو كێشەی سیاسیی بووە.

٢- هۆكاری دووەم بریتییە لە دەمارگیریی مەزهەبیی، ئەوانەی كە بۆچوونەكانی (ئەبو حەنیفە)یان پێ ڕاست بووە، دژی شافیعی قسەیان كردوە، ئەوانەش كە هی (شافیعی)یان پێ ڕاست بووە، دژی ئەبو حەنیفەو، بەهەمان شێوە مەزهەبەكانی دیكەش.

٣- خۆ بردنە پێش و ماستاوچییەتی زانایانی خراپ بۆ حوكمڕانان، بۆ وێنە: دەڵێ: (غياث بن إبراهيم النخعي الكوفي) یەكێ بووە لەو زانایانەی خۆ دەبەنە پێش لە دەسەڵات[1]، دەچێتە لای (مهدي) كە حوكمڕانی عەبباسیەكان بووە، ئەو مەهدییە عادەتی وا بووە كەیفی بە كۆتران هاتوە، لەو كاتەدا كە (غياث) چووە بۆ لای دیارە، مەهدی كۆترێكی لەپێش بووە، كە چووەتە لای دانیشتووە، بینیویەتی حوكمڕانی مسوڵمانان یاری بە كۆتر دەكات، بە (غياث)یان گوتووە: قسە بۆ (أمير المؤمنين) بكە، ئەویش یەكسەر گوتوویەتی: {حدثنا فلان عن فلان أن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: (لا سَبْقَ إلاَّ في نَصْلٍ أو حَافِرٍ أو خُفّ أو جَنَاحٍ) فلما قام، قال المهدي: (أشهد أن قفاك قفا كذّابٍ على رسول الله صلى الله عليه و سلم، وأمر بذبح الحَمَامِ وَتَرَك ما كان فيه} والحديث أصله في السنن بدون ذكر الجناح[2].

واتە: لە فڵان لە فڵان بیستوومە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پێشبڕكە كردن دروست نیە، مەگەر لە شتێكدا كە نووكی هەیە (واتە: تیرەندازیی)، یان خوفدار (حوشتر خوففی هەیە) یان سمدار (واتە: وڵاخە بەرزە)، یان باڵدار.

شایانی باسە فەرموودەكە لە (سنن)دایە، بەڵام وشەی: (جناح)ی تێدا نیە، واتە: (باڵ) یانی: پێشبڕكە كردن بە كۆتر، ئەوەی لەبەر خاتری (مەهدیی لێ زیاد كرد).

---

(١) وەك ئەوەی كاتی خۆی من قسەیەكم هەبوو دەمگوت: مەلای دین فرۆش و شێخی دڵنەخۆش و، مسوڵمانی بێ هۆش.

(٢) علوم الحديث ومصطلحه، د. صبحي الصالح، ص ١٦٨.

دەڵێ: كە ڕۆیی، مەهدیی گوتی: بەخوا شاهێدیی دەدەم كە ئەو پشتە ملەی تۆ، پشتە ملی پیاوێكی درۆزنە، درۆت بەدەمی پێغەمبەری خواوە كرد {لەبەر خاتری من}، ئنجا فەرمانی كرد كۆترەكانی سەرببڕن، {گوتی: ئەمە بەهۆی كۆترەكانی منەوە درۆی بەدەمی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) كرد}، یانی مەهدیی لەو زانایە بەدین تر بووە، لەو هەڵوێستەیدا.

هەر لەو بارەوە گێڕراوەتەوە: كابرایەك برادەرێكی هەبوو لەوانەی كە فەرموودە هەڵدەبەستن بەدەمی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، كابرا هەریسەی دەفرۆشت، كابرای درۆ هەڵبەستەش چووە لای گوتی: وەزعت چۆنە؟ گوتی: باشم، بەڵام كڕیارم كەمن، گوتی: خەمت نەبێ تەگبیرت بۆ دەكەم: {روي فلان عن فلان، أن رسول الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: (عليكم بالهريسة، فإنها تشدُّ العَظَل وتُقَوِّي الظَّهر)} واتە: هەریسە بخۆن، چونكە ماسوولكە پتەو دەكات و پشتیش بەهێز دەكات.

٤- خەڵكێك ناشارەزا بووەو زانیاریی نەبووە بە قورئان و سوننەت، ئامۆژگاریی خەڵكیشیان كردوە، وەك ئێستا هەندێ مەلا هەن هەر خەریكی حیكایەتانن، كاكە! ئیسلام دین بۆ خەڵك باس بكە، كە قورئان و سوننەتە، ئەو هەموو ئایەت و فەرموودە هەن، دەستت لە هیچیان گیر نابێ، دەچی حیكایەتان دێنی، خوا دەزانێ چەندی لەگەڵ شەرع دێتەوە، حیكایەت و بەسەرهات لەجێی خۆیدا باشە، بەڵام نابێ بكرێتە بەدیل بۆ ئایەت و فەرموودە.

٥- هەندێ لە ئەهلی زوهدو تەصەووف، فەرمایشتیان بەدەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەڵبەستوون، تاكو خەڵك هانبدەن بۆ دینداریی، بۆ وێنە: یەكێ لەوانە كە دەڵێن: پیاوی باشیش بووە، بۆ هەموو سوورەتەكان فەرموودەیەكی هەڵبەستوەو بردووشیەتەوە سەر عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس، ئەو سوورەتە خێری ئەوەندەو ئەوەندەی هەیە بیخوێنن، كە لێیان پرسیوە، گوتوویەتی: خەڵك لەجیاتی ئەوەی خەریكی خوێندنەوەی حیكایەت بێ، با خەریكی

خوێندنەوەی قورئان بێ، بەحیساب شتێكی باشی كردوە، بەڵام دین چ لێی زیاد بكەی و، چ لێی كەم بكەی، هەر خراپە.

٦- هۆكارێكی دیكە ئەوە بووە كە هەندێ خەڵكی دژی دین هەبوون، پێیان گوتراوە: (زنادقة)، ئەوانەش بەدەمی پێغەمبەری خواوە فەرمایشتیان هەڵبەستوە، وەك (عبدالكريم بن أبي العوجاء) كە دیارە كابرایەكی لادەرو بێ دین بووە، هێناویانە بیكوژن، كە دیارە حوكمی كوشتنیان بەسەر داوە، ئەویش گوتوویەتی: (٤٠٠٠) فەرموودەم بەدەمی پێغەمبەرەكەتانەوە هەڵبەستوە، هەمووی ئیشی پێ دەكرێ[1]، كە بێگومان ئەوەشی هەر درۆ بووەو زێدەڕۆیی كردوە، بەڵام خەڵكێك هەبووە لەو جۆرە كەسانە.

## ب- چۆن فەرموودەی ڕاست و قسەی هەڵبەستراو لێك جیا دەكەینەوە؟[2]

ئێمە بە پێنج ڕێگا[3] دەتوانین دەقی هەڵبەستراو (موضوع) لە فەرموودەی ڕاست (صحيح) جیا بكەینەوە:

**یەكەم:** كە ئەو كەسەی دەقەكەی هەڵبەستوە، بۆخۆی دانی پێدا بنێ، بۆ وێنە: (نوح بن أبي مريم) بۆخۆی دانی بەوەدا هێناوە، كە بۆ هەموو سوورەتەكانی قورئان، فەرموودەیەكی هەڵبەستوەو بردوویەتەوە سەر عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس، بۆخۆی دانی پێدا هێنا، گوتی: بۆ چاكە وام كردوە، بەڵام خەڵكینە! بیزانن ، دوایی ڕەنگە بیری لێ كردبێتەوە كە شتێكی باشی نەكردوەو ئەو دان پێداهێنانەی كردوە، ئەمەش مانای ئەوە نیە كە ئەو فەرموودانەی دەربارەی

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ص ٢٧٠.

(٢) چونكە هەندێ خەڵك دەڵێن: ئنجا ئەگەر ئەو هەموو فەرموودەیە هەڵبەسترابن، با سوننەت وەلا بنێین!

(٣) هەڵبەتە ڕەنگە زیاتر بن، بەڵام من ئەوەندەم بەرچاو كەوتوون.

سوورەتەکان هاتوون، هەموویان هەڵبەستراون، بەڵکو دەبێ بگەڕێینەوە سەر سەنەدەکەیان، ئنجا بەپێی سەنەدەکانیان هەڵیان دەسەنگێنین.

**دووەم:** کە ئەو عیبارەتە کە گێڕدراوەتەوە، هەڵەی زمانەوانیی تێدا بێ، لە ڕووی بێژەوە، یان لە ڕووی ماناوە، لادانی تێدا بێ، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چ لە ڕووی بێژەوە، چ لە ڕووی داڕشتنی واتاوە، لە هەموو کەس ڕەوانبێژترو فەسیح تر بووە، بۆیە هەندێ لە فەرموودەناسان گوتوویانە: فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نووری هەیە.

**سێیەم:** کە ئەوەی گێڕدراوەتەوە لەگەڵ عەقڵدا تێك بگیرێ، یان لەگەڵ واقیعدا تێك بگیرێ، یان لەگەڵ قورئاندا تێك بگیرێ، وە بە کەڵکی تەئویل کردنیش نەیەت، ئنجا لەو بارەوە شتێکی خۆشتان بۆ بێنمەوە:

{قيل: لعبد الرحمن بن زيد حدثك أبوك عن جَدِّك أَنَّ رسولَ الله صلى الله عليه وسلم قال: إن سفينة نوح طافت بالبيت، وصلَّت خَلْفَ المقام ركعتين؟! قال: نعم}[1]، واتە: پیاوێك هەبووە ناوی عەبدوڕەحمانی کوڕی زەید، پێیان گوتوە: ڕاستە بابت لە باپیرتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە گێڕاویەتەوە کە کەشتییەکەی نووح کاتی خۆی: حەوت جاران بە دەوری کابەدا سووڕاوەتەوە، پاشان لە مەقامی ئیبراهیم دوو ڕکات نوێژی کردوە؟ گوتوویەتی: بەڵێ.

ئنجا ئەوە دیارە کە درۆی کردوە، چونکە پێچەوانەی عەقڵ و واقیعە، کەشتییەکەی نووح لەوێدا هەر جێی نابێتەوە، چونکە وەك لە تەفسیری سووڕەتی (هود)دا باسم کردوە، کەشتییەکەی نووح دەوری (٣٠٠)م درێژ بووە، ئنجا ئەوە شتێکە، بێ ئەوەی تەماشای سەنەدەکەی بکەی، دیارە کە لەگەڵ عەقڵ و واقیعدا تێك دەگیرێ.

**چوارەم:** کە ئەو گێڕانەوەیە هەڕەشەیەکی گەورەی تێدا بێ، لەبەرامبەر گوناهێکی بچووکدا، یان پاداشتێکی زۆر گەورەی تێدا بێ، لەبەرامبەر چاکەیەکی زۆر

---

(١) التهذيب (١٧٩/٦).

گچکەدا، بۆ وێنە: ئەوانەی کە کڵاوێك شتێك لەسەریان دەکەن لەکاتی نوێژدا، بەناو فەرموودەیەك دەهێنن کە دەڵێ: {صلاه بعمامة خير من سبعين صلاة بدون عمامة}(١)، دەڵێم ئەوە هەر دیارە کە هەڵبەستراوە، چونکە هەر ئەوەندە کابرا پەڕۆیەك بخاتە سەر سەری خۆی، نوێژەکەی حەفتا هێندە خێری هەبێ، شتی وا چۆن دەبێ؟ نوێژی جەماعەت کە زەحمەتی زیاتری تێدایە ئنجا بە (٢٥) نوێژی دیکەیە، ئنجا ئەوە بۆ خەڵکی سەر ڕووت، هەر زۆر گرفتە! پاشان لە حەجدا پیاوان هەموویان لەسەریان فەرزە، سەریان ڕووت بکەن و، ئەگەر شتێك لەسەر بکەن، خوێنیان دەکەوێتە سەر (دەبێ ئاژەڵێك وەك قەرەبوو سەر ببڕن).

**پێنجەم:** کە ئەو کەسەی ئەو دەقەی دەخرێتە پاڵ، مەشهوور بێ بەوەی کە درۆزنە، زێدەڕۆیی کردوە، دینەکەی زەعیف بووە، لەو بارەوە ئەو نموونەیە هەیە دەڵێ: {قيل لمأمون بن أحمد الهروي: ألا ترى إلى الشافعيِّ ومن تبعه بخراسان؟ قال: حدثنا أحمد بن عبدالله عن عبدالله بن معدان الأزدي عن أنسٍ مرفوعاً: يكون في أمتي رجلٌ يقال له محمد بن إدريس، أضرُّ على أمتي من إبليس، ويكون في أمتي رجلٌ يقال له أبو حنيفة، يكون سراج أمتي}(٢).

به مەئموونی کوڕی ئەحمەدی هەڕەویی یان گوت: - کە دیارە پیاوێکی حەنەفیی مەزهەب بووە - تۆ تەماشا ناکەی خەڵکێکی زۆر لە خۆراسان بەدوای شافیعی کەوتوە؟ {ئەویش گوتی: چارەی دەکەم}، ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵلا بۆی گێڕامەوە ئەویش لە محمدی کوڕی مەعدانی ئەزدییەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە، ئەویش بەرزی کردۆتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی: (لە ئۆممەتی من پیاوێك دەبێ، ناوی موحەممەدی کوڕی ئیدریسە، بۆ ئۆممەتی من بەزەرترە لە ئیبلیس، وە لە ئۆممەتی من پیاوێك دەبێ کە چرایە بۆ ئۆممەت، پێی دەگوترێ: ئەبو حەنیفە)، ئەمە دیارە کە هەڵبەستراوە مەبەستەکەش دەمارگیریی مەزهەبییە.

---

(١) وەك سيد سابق لە (فقه السنة)دا هێناویەتی، بەڵام دەڵێ کە بێهێزە.

(٢) لسان الميزان (٥/٧-٨).

هەر لەو بارەوە، ئەوەش هاتوە: {عن سيف بن عمر التميمي قال: كنت عند سعد بن طريف فجاء ابنه من الكتاب يبكي، فقال: مالَكَ؟ قال: ضربني المعلِّمُ قال: لَأُخزينَّهم اليوم: حدَّثني عكرمة عن ابن عباس مرفوعاً: مُعَلِّمو صبيانكم شرارُكم، أقلُّهم رحمة لليتيم وأغلظهم على المسكين}[١]، واتە: سەیفی کوڕی عومەری تەمیمیی دەڵێ: لەلای سەعدی کوڕی (طریف) بووم کوڕەکەی هاتەوە لە لای (کُتّاب) (دیارە قوتابخانە لەوەوە هاتوە، یانی: لەوێدا فێری خوێندن و نووسین و ...هتدیان دەکردن) دەگریا، بابی گوتی: ها بۆچی دەگریەی؟ گوتی: مامۆستایەکەم لێی داوم، گوتی: لێی گەڕێ ئەمڕۆ دەبێ سەرشۆڕیان بکەم، {ئنجا فەرموودەیەکی هەڵبەست}، گوتی: لە عیکریمەوە ئەویش لە ئیبن عەبباسەوە، ئەویش بەرزی کردۆتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (مامۆستای منداڵەکانتان: خراپترینتانن، چونکە زۆر بێ بەزەیین لەگەڵ هەتیودا، وە زۆر دڵ ڕەقن بەرامبەر بە هەژارو نەدار).

هەر لەوێ ئەو فەرموودەیەی هەڵبەست دژی مامۆستایان، لەبەر ئەوەی کوڕەکەی مامۆستا لێی داوە! بەهەر حاڵ کەسێك کە ناسراو بووبێ کە شتی هەڵبەستوە، هەر شتێك لەوەوە هاتبێ، جێی گومانەو نیشانەی پرسیاری خراوەتە سەر.



---

(١) تدريب الراوي، ص ١٠٠.

## ٨ـ ناگونجێ فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ هیچ كام لە: عەقڵ، قورئان، واقیع و زانستدا، دژ بوەستێ

زانایان قسەو باسی زۆریان كردوە، لەبارەی هەندێ دەقی سوننەتەوە، كە زۆرێك لە زانایان، یان هەندێكیان - چونكە لەو بارەشەوە ڕاجیایی هەیە - دەڵێن: ئەم دەقە دژی عەقڵە، ئەویدیكە دەڵێ: نەخێر وانییە، تۆ لێی تێنەگەیشتووی، هەندێكیان دەڵێ: دژی زانستە، هەندێكی دیكەیان دەڵێن: نەخێر، ئەوەی تۆ پێی دەڵێی زانست، ئەوە هەر بیردۆزەیەكە، یان ڕایەكەو جارێ نەبۆتە ڕاستییەكی زانستیی، یان هەندێكیان دەڵێن: ئەوە پێچەوانەی واقیعە، كە هەندێكیان دەڵێن: وانیە.

بەهەر حاڵ هەر دەقێكی سوننەت كە ساغ بێتەوەو بەسەنەدێكی ڕاست بچێتەوە سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ناگونجێ نەلەگەڵ عەقڵدا دژ بوەستێ، نەلەگەڵ قورئاندا، نەلەگەڵ واقیعدا، نەلەگەڵ زانستدا، وەك ڕاستییەكی زانستیی.

ئنجا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش دەڵێ: ئەگەر ئێمە دەقێكمان بینی لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست بوو، بۆ وێنە: لە هەردوو (صحیح)ەكە هاتبوو، یان لە (سنن)دا هاتبوو، زنجیرەی ڕاوییەكانی هەموویان ئەهلی (عدل) و (ضبط) بوون، هەتا دەچۆوە سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چ فەرمایشتی بێ، چ كردەوەی بێ، چ دانپێدانانی بێ، واتە: فەرموودەكە لە ڕووی سەنەدیەوە ڕاست بوو، بەڵام لەڕووی مەتن و نێوەڕۆكییەوە یان لەگەڵ عەقڵدا تێك دەگیرا، یان لەگەڵ قورئاندا، یان لەگەڵ واقیعدا، یان لەگەڵ زانستدا، ئەو كاتە چارەسەر چییە؟؟!!

زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، قسەکانیان لە سێ بواراندان:

## بواری یەکەم: تێکگیرانی سوننەت و عەقڵ:

ئەگەر دەقێکی سوننەتمان هەبوو، لەگەڵ عەقڵدا تێکگیرا، ئەو کاتە بۆ چارەسەر، دەبێ چوار هەنگاوان بنێین:

**هەنگاوی یەکەم:** سەرەتا دەبێ لەسەنەدەکەی بکۆڵینەوە، پێشێ دەبێ لەزنجیرە ڕاوییەکانی بکۆڵینەوە، چونکە ناگونجێ دەقێك لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست نەبێ و هەڵبەستراو بێ، ئێمەش بێنین بیکەینە بەڵگەی ئەوە کە سوننەتی پێغەمبەری خوا، لەگەڵ عەقڵدا دژ دەوەستێ، کەواتە: پێشێ دەبێ لە ڕووی سەنەدەکەیەوە ساغی بکەینەوە.

**هەنگاوی دووەم:** ئەگەر لەڕووی سەنەدەوە چەسپاو بوو، ئنجا دەبێ سەرنجی مەتنەکەی بدرێ، بۆ زانیارییتان: زانستەکانی فەرموودە ناسیی زۆر لق و پۆپیان هەیە، بەڵام دوو زانست، زۆر بنەڕەتیین:

١- (علم الحدیث روایة) زانستی فەرموودە لە ڕووی ڕیوایەتەوە: کە باسی سەنەدو ڕاوییەکان دەکات،

٢- (علم الحدیث درایة) زانستی فەرموودە لە ڕووی نێوەڕۆك و واتاوە: کە باسی مەتنەکەی دەکا، دەقی فەرموودەکە باس دەکات،

جاری وایە دەقێکی سوننەت لە ڕووی سەنەدەوە ڕاستە، لە ڕووی سەنەدەوە دەچێتەوە سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام لە ڕووی مەتنەکەیەوە ساغ و ڕاست نیە، واتە نێوەڕۆکەکەی ناگونجێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموبێتی، لەبەر ئەوەی وەك گوتم: یان لەگەڵ عەقڵدا، یان لەگەڵ واقیع و زانستدا، یان لەگەڵ قورئاندا دژ دەوەستێ، ئەو کاتە ئێمە ڕەفزی دەکەین، ئەگەر هیچ چاری نەکرا، لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی

ناگونجیّ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شتێك بفەرمویّ، یان شتێك بكا، پێچەوانەی عەقڵ، یان واقیع، یان قورئان، یان زانست بیّ، واتە: ئەگەر لە ڕووی سەنەدەوە ساغ بۆوە، ئنجا تەماشای مەتن و نێوەڕۆكەكەی دەكەین، وە جۆری تێگەیشتن لێی، جۆری لێتێگەیشتنی ئەو دەقە، ئەوەش گرنگە، زانایەك بەهەڵە لێی تێدەگا، ئەو بەهەڵە تێگەیشتنەی ئەوە، كە لەگەڵ ئەوانەدا دژ دەوەستیّ، یەكێكی دیكە بەڕاست لێی تێدەگا، بەڕاست تێگەیشتنەكە، تێك ناگیریّ، لەو بارەوە (إبن تیمیە) ڕەحمەتی خوای لێبیّ، كتێبێكی هەیە بەناوی: (دَرْءُ التعارض بين العقل والنقل) كە لە (١٠) بەرگدا چاپ كراوە، واتە: (لابردنی تێكگیران لەنێوان عەقڵ و نەقڵدا) دەڵیّ: {فلا يُعلَم حَديثٌ واحدٌ على وَجهِ الأَرضِ يُخالِف العَقل أَو السَّمع الصَّحيح إلاّ وَهو عِند أَهل العِلم ضَعيفٌ بَل مَوضوع}[١]، واتە: هیچ فەرموودەیەك لەسەر ڕووی زەوی نازانریّ و نەزانراوە هەبیّ، لەگەڵ عەقڵ، یاخود وەحی ڕاستدا، تێك بگیریّ، مەگەر ئەو دەقە لەلای پسپۆڕان، بە بێهێز، یان هەڵبەستراو دادەنریّ.

**هەنگاوی سێیەم:** دەبیّ دوو شتان لێك جیا بكەینەوە:

١- دژ وەستان لەگەڵ عەقڵ.

٢- پەی پیّ نەبردنی عەقڵ. جاری وا هەیە شتێك ڕێك لەگەڵ عەقڵدا تێك دەگیریّ، بەڵام جاری وا هەیە شتێك لەگەڵ عەقڵدا، تێك ناگیریّ بەڵام عەقڵ باش تێی ناگاو، پەی پیّ نابات، لەو بارەوە (الشاطبي) دەڵیّ: (أن الله جعل للعقول في إدراكها حدّاً تنتهي إليه لا تتعدّاه، ولم يجعل لها سبيلاً إلى الإدراك في كل مطلوب)[٢]، واتە: خوای پەروەردگار عەقڵ و هۆشەكانی وا داناون، سنووردارن، لەو سنوورە تێناپەڕن، وای نەكردوە كە ئەو عەقڵە، بتوانیّ هەموو شتیّ بزانیّ[٣].

---

(١) ج١، ص ١٥٠.

(٢) (الإعتصام) ج١ ص٨٣١.

(٣) هەر نموونەیەكی زۆر سادە: هێزی موگناتیس كە ئێمە ڕۆژانە مامەڵەی لەگەڵدا دەكەین،

بۆ وێنە: یەكێ لەو فەرموودانە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ: {إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لَا يَقْطَعُهَا} أخرجه أحمد برقم (٩٢٣٢)، والبخاري برقم (٤٥٩٩)، ومسلم برقم (٢٨٢٦)، والترمذي برقم (٢٥٢٣)، وابن ماجه برقم (٤٣٣٥).

واتە: لە بەهەشتدا درەختێك هەیە، بابای سوار بە سەد (١٠٠) ساڵ ژێر سێبەرەكەی تەواو ناكات، {بەو ماوەیە نایبڕێ}.

ئنجا ئایا درەختێك سێبەرەكەی ماوەكەی سەد (١٠٠) ساڵ ڕێ بێ، عەقڵ چۆن تێی بگا؟، یانی: دەبێ سێبەری ئەو درەختە، زۆر لە گۆی زەوی فراوانتر بێ، كە ئێمە لە دنیادا شتی وامان نیەو تێی ناگەین، بەڵام كە تێینا گەین، لەگەڵ عەقڵدا دژ ناوەستێ، چونكە تێك گیران لەگەڵ عەقڵ، لەگەڵ تێنەگەیشتنی عەقڵ بۆ ئەو دەقە، لێك جیان، ئێمە كاتێك دەقێك ڕێك لەگەڵ عەقڵدا دژ بوەستێ، وەك دوایی باسی دەكەین، یان لەگەڵ واقیعدا دژ بوەستێ، وە هیچ چاری نەبێ و، بەهیچ شێوەیەك نەتوانین: ئەو دەقە لەگەڵ قورئان، لە گەڵ واقیع، لەگەڵ عەقڵ، لەگەڵ زانستدا كۆ بكەینەوە، ئەو كاتە ڕەفزی دەكەین، چونكە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هیچ شتێكی نەفەرمووە لەگەڵ ئەوانەدا تێك بگیرێ.

**هەنگاوی چوارەم:** مەرج نیە هەموو عەقڵێك لە هەموو دەقێكی شەریعەت تێبگات، هەر بۆیەش خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی:

﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾﴾ الأنبياء، النحل (٤٤).

واتە: ئەگەر نازانن لە شارەزایان بپرسن...

---

تا ئێستا نهێنییەكەی نازانرێ، بەڵێ ئەو مەعدەنە ئەوەی دیكەیان كێش دەكات، بەڵام بە هیچ كام لە پێنج هەستەكان، هەستی پێ ناكرێ. هەروەها ئەو ڕووحەی، كە لە جەستەی هەموو لایەكماندا هەیە، نازانین چییە؟

هەروەها پێغەمبەری دانا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {مَنْ يُرِدْ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهُهُ فِي الدِّينِ} أخرجه أحمد برقم (١٦٩٢٤)، والبخاري برقم (٧١)، ومسلم برقم (١٠٣٧)، وابن حبان برقم (٨٩)، وأخرجه أيضا: الدارمي برقم (٢٢٤)

واتە: هەر كەسێك خوا چاكەی بۆی بوێ لە ئایین دا شارەزای دەكات.

## بواری دووەم: تێكگیرانی سوننەت و قورئان:

ئنجا ئەگەر دەقێكمان بینی لەگەڵ قورئاندا دژ وەستا، ئەوەش دیسان:

**هەنگاوی یەكەم:** سەرنجی سەنەدەكەی دەدەین: ئایا سەنەدەكەی ڕاستە، بێ گرێ و گۆڵە، زانایان قسەیان لەسەر نەكردوە، ئنجا ئەگەر سەنەدەكەمان بۆ ساغ بۆوە:

**هەنگاوی دووەم:** تەماشای تەفسیرو دەلالەتی ئایەتەكە دەكەین، كە ئایا ئەو شێوە لێكدانەوە بۆ ئایەتەكە، كە لەگەڵ سوننەتدا دژ دەوەستێ، لێكدانەوەو تەفسیرێكی دروستە؟

**هەنگاوی سێیەم:** دەبێ سەرنجی ماناو مەبەست و شێوەی ماناكردنی سوننەتەكەش بدەین، جاری وایە دەقێكی سوننەت لەبەر ئەوەی بەهەڵە مانا دەكرێ، لەگەڵ قورئاندا تێك دەگیرێ، یاخود دەقێكی سوننەت كە بەڕاست مانا كراوە، لەگەڵ دەقێكی ئایەت كە بەهەڵە مانا كراوە، دژ دەوەستێ.

با وێنەیەكتان بۆ بێنمەوە: كتێبێك هەیە بەناوی (فتاوى العقيدة)، هی (إبن العثيمين)ە، ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەو كتێبەدا بینیومە پرسیاری لێكراوە، ئەو قوتابییانەی كە پرسیاریان لێكردوە، دەبێ هی سعوودیە بووبن و وا پێدەچێ قوتابی ئامادەیی بووبن، دەڵێن: ئەگەر ئێمە لە تاقیكردنەوەدا بۆمان هاتەوە كە ئایا زەوی بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە، یان خۆر بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە؟ ئێمە چۆن وەڵام بدەینەوە؟ دوایی دەڵێن: ئەگەر بێت و ئێمە وەك كتێبەكەمان

دەڵێ: زەوی بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە، ئاوا وەڵام نەدەینەوە نمرە (درجە) مان پێ نادرێ، جەنابیشت لە کتێبەکانی خۆتدا دەڵێی: خۆر بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە، ئنجا ئایا وەك ئەوەی كە تۆ دەڵێی ئایەت وا دەفەرمووێ، ئاوا وەڵام بدەینەوە، یان وەك ئەوەی کتێبەکەمان دەڵێ؟

(إبن عثیمین) ڕەحمەتی خوای لێبێ کە زانایەکی گەورەو باشیش بووە دەڵێ: نەخێر با سفریشتان بدەنێ، نابێ شتێك بڵێین پێچەوانەی قوڕئان بێ، هەروەك ئایەتەکە دەڵێ: ئاوا وەڵام بدەنەوەو بڵێین: خۆر بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە!! ئەوە جۆری تێگەیشتنی (إبن عثیمین) ڕەحمەتی خوای لێبێ بۆ ئەو ئایەتەی سووڕەتی (یس) کە دەفەرمووێ:

﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ٣٨ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ٣٩ ﴾ یس.

واتە: وە خۆر بەرەو وێستگەیەکی دیاریکراوی دەڕوات، ئەوە ئەندازەگیریی زاڵی زانایە. وە بۆ مانگیش چەند وێستگەمان داناون هەتا دوایی وەك لقە دارخورمای کۆنی لێ دێتەوە (وەك دەمە داسێك).

کە بێگومان ئەو جۆرە لێك دانەوەی ئایەتەکە، کە - إبن عثیمین گوتوویەتی - لە جۆری تێگەیشتنی هەڵەیە، ئەگەرنا ئێستا ئەوە بۆتە بەڵگە نەویست و لە (ئەلیف و بای) زانستی گەردوون ناسییە کە زەوی بەدەوری خۆردا دەسووڕێتەوە، وە خۆر زۆر زۆر گەورەترە لە زەوی، ئنجا لێرەدا ئەو لێکدانەوەو تێگەیشتنە هەڵەیەی ئەو زانایە بۆ ئایەتەکە، تووشی ئەو هەڵەیەی کردووە، ئەو قوتابییانەشی تووشی ئەو سەغڵەتییە کردوە.

**براو خوشكانی بەڕێز!**

زۆر گرنگە زانا، شارەزای زانست و واقیع و دنیا بێ، ئەبو حامیدی غەزالیی، كە لە ساڵی (٥٠٥)ك دا وەفاتی كردوە، لە كتێبی (تهافت الفلاسفة) دا[1]، زیاتر لە (٩٠٠) ساڵ لەمەوپێش، لەبەر ئەوەی زۆر شارەزای زانست و واقیعی سەردەمی خۆی بووە دەڵێ: بەبەڵگە ئەندازەییەكان جێگیر بووە، كە خۆر چەند هەزار جار لە زەوی گەورەترە، زیاتر لە (٩٠٠) ساڵ لەمەوپێش زانیویەتی، دەڵێ: خۆر دەوری (١٧٠) جار هێندەی زەوی گەورەیە، كە دیارە زانستی گەردووناسیی و فیزیاش ئێستاش پێمان دەڵێ:

ئەو خۆرەی ئێمە كە یەكێكە لە ئەستێرەكانی نێو كەهكەشانی كێشان، {مجرّة درب التبّان} كە بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن: (- milk way ڕێی شیریی)، ملیۆنێك و سێسەد هەزار (١،٣٠٠،٠٠٠) جار لە زەوی گەورەترە، واتە: یەك ملیۆن و سێسەد هەزار زەوی وەك زەوی ئێمە، لەوێدا جێگای دەبێتەوە!! كەچی (إبن العثیمین) ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەبەر ئەوەی شارەزای زانستی سەردەم نەبووە، لە ئایەتەكە باش تێنەگەیشتوەو وای زانیوە كە لەگەڵ ئەو حەقیقەتە زانستییەدا تێك دەگیرێ، كە وەك گوتم ئەوە كە زەوی بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوەو دەبێتە هۆی پەیدا بوونی شەوو ڕۆژ، وە كە بەدەوری خۆریشدا دەسووڕێتەوە، دەبێتە هۆی پەیدا بوونی چوار وەرزەكان، ئێستا ئەو زانراوە (معلومە)یە شتێكی زۆر سادەیە.

كەواتە: هەم دەبێ لە تەفسیرو لێكدانەوەی ئایەتەكە چاك تێبگەین، هەم لە لێكدانەوەی فەرمایشتەكە.

**هەنگاوی چوارەم:** دەبێ بۆ باش تێگەیشتنی فەرموودەكان، بگەڕێینەوە بۆ ئەو كتێبانەی شەرحی سوننەت دەكەن، بۆ وێنە: (فتح الباري) كە شەرحی (صحیح البخاري) دەكات و، شەرحی (صحیح مسلم)ی نەوەویی و، كتێبەكانی دیكەش، وەك چۆن بۆ تێگەیشتی مانای ڕاستی ئایەتەكان، دەگەڕێینەوە بۆ تەفسیرەكان و، دواییش ئەگەر تێكگیرانەكە هەر ما، ئنجا دەگەڕێینەوە بۆ

---

(١) بڕوانە: لاپەڕە: ١٢.

زانستێك كە پێی دەگوترێ: (قواعد التعارض والترجيح بين الأدلة)، ئەوەش زانستێكەو لقێكە لە زانستی: (أصول الفقه) زۆر زانستێكی فراوانە، مامۆستا (شێخ عبداللطيف)ی واژەیی، كە دووەم ڕابەری گشتی بزووتنەوەی پەیوەندیی بووە، خوا لێی خۆشبێ، كتێبێكی هەیە بەو ناوە، كە نامەی ماجستێرەكەیەتی، زانستێكە كاتێ بەڵگە شەرعییەكان تێك دەگیرێن، زانایان دێن چۆنیەتی ئەو تێكگیرانە چارەسەر دەكەن، بزانن داخۆ كامەی بەسەر كامەیدا زاڵ دەكەن؟.

بۆ وێنە: فەرمایشتێكمان هەیە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{مَنْ نِيحَ عَلَيْهِ، يُعَذَّبُ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ} أخرجه أحمد برقم (١٨٢٦٣)، والبخاري برقم (١٢٢٩)، ومسلم برقم (٩٣٣) ، والترمذي برقم (١٠٠٠) وأخرجه أيضا: ابن أبى شيبة برقم (١٢٠٩٨).

واتە: هەرمردوویێك شیوەنی لەسەر بكرێ، (مەبەستی لە شیوەن ئەوەیە، كە بەزۆریی بە ئافرەتان دەیكەن، ئەویش ئەوەیە كە بەمردوو هەڵابڵێن و بیلاوێننەوە) بەهۆی ئەو شیوەن كرانەوە، سزا دەدرێ.

هەر دەربارەی ئەمە فەرموودەیەكی دیكە هاتوە دەفەرموێ:

{إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ} أخرجه أحمد برقم (٤٩٥٩)، والبخاري برقم (١٢٢٦)، ومسلم برقم (٩٢٨)، وأبو داود برقم (٣١٢٩)، والترمذي برقم (١٠٠٤)، والنسائي برقم (١٨٥٥).

واتە: بێگومان مردوو بەهۆی ئەوەوە كە خزم و كەسەكەی لەسەری دەگرین و شیوەنی بۆ دەكەن، سزا دەدرێ.

ئەو دوو فەرموودەیە ئاوا دەفەرموون، ئایەتیشمان هەیە خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿..وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ..﴿١٦٤﴾﴾ الأنعام.

واتە: هیچ گوناهبارێك گوناهی خەڵكی دیكە هەڵناگرێ.

## هەڵوێستی زانایان لەبەرانبەر ئەم دەقەی سوننەت دا:

**یەكەم:** عائیشەی دایكمان خوا لێی ڕازی بێ (الصديقة بنت الصديق) كە هەم زۆریش شارەزا بووەو هەم زۆریش بوێر بووە، بۆچوونی خۆی زۆر بوێرانە گوتوە، وە زۆر شارەزا بووەو چەند هەڵەی بۆ گەورە گەورەی هاوەڵان ڕاست كردوونەوە، لە بواری خێزان و ماڵ دا، ئنجا كە بیستوویەتی ئەو فەرموودانە گوتراون، گوتوویەتی: ئەوە ڕاست نیە، خوای پەروەردگار دەفەرمویێ:

﴿...وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ..﴿١٦٤﴾﴾ الأنعام.

یانی: ئەوە ڕاست نیەو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای نەفەرموە، یەعنی چی؟؟ یەعنی ئەی هاوەڵ! ئەو كەسەی ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، - ئەو كاتە ڕاوی زۆر نەبوون، هەر یەك ڕاوی هەبووە[1]- ئنجا (أبو هريرة، یان إبن عمر، یان إبن عباس) هەر كەسێ بووبێ، خوا لێیان ڕازی بێ، گوتوویەتی: تۆ بەهەڵە داچووی، پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) وای نەفەرمووە، چونكە ئەمە لەگەڵ قورئاندا تێك دەگیرێ، ئەوە بۆچوونی عائیشە[2].

**دووەم:** هەندێكی دیكە لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر ئەم فەرموودەیە ئێمە بە جۆرێك مانای لێك بدەینەوە، كە لەگەڵ ئایەتەكەدا تێك نەگیرێ، ئەو كاتە پێویست ناكات فەرموودە ڕەت بكەینەوە، كە ئەوە پێی دەگوترێ: (إعمال النصين)، واتە: هەردوو دەقەكان كار پێ بكەین، كە دیارە كارپێكردنی دوو

-----------------------------

(١) واتە: بەیەك گێڕەرەوە (راوي) دەقەكەی سوننەت گەیەنراوەتەوە سەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

(٢) كە بریتییە لە ڕەت كردنەوەی دەقەكەو نكوڵییكردن لەوەی هی پێغەمبەر بێ، بەبەڵگەی دژە وەستانی لەگەڵ قورئانداو هەرگیزیش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناگونجێ شتێك بڵێ لەگەڵ قورئاندا دژ بوەستێ!

دەقەکان - کە بە ڕواڵەت پێکەوە ناکۆکن - چاکترە لەوەی یەکێکیان ڕەتبکەینەوە، (إعمال النصين أولى من رفض أحدهما).

ئەویش ئەوەیە کە گوتوویانە: ئایەتەکە ئەوە دیارە کە دەفەرموێ: کەس گوناهی کەسی دیکە هەڵناگرێ، بەڵام مەبەست لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) {(لَيُعَذَّبُ) أي (يتألَّم)} بەم شێوەیەش کێشەکە چارەسەر دەبێ، یانی ئەو مردووە پێی ناخۆشە کە وای بۆ دەکرێ، ئنجا ئەگەر بڵێی: پێی ناخۆشە، ئەوە تێکگیران نابێ، بەڵام ئەگەر بڵێی: سزا دەدرێ، ئەوە ناگونجێ و لەگەڵ ئایەتەکەدا دژ دەوەستێ.

**سێیەم:** وە هەندێ لە زانایانی دیکە دەڵێن: ئەوە مەبەستی مردووێکە کە پێشتر وەسیەتی کردبێ: کە مردم شیوەنم بۆ بکەن، ئنجا لەبەر ئەوەی وەصیەتی کردوە، خوا سزای دەدا، ئنجا ئەگەر بەو دوو تەئویلە بێ، ئەوە ئێمە پێویست ناکات فەرموودەکە ڕەفز بکەین، چونکە لەگەڵ ئایەتەکەدا تێك ناگیرێ.

جا ئەمە[1] زانیارییەکی زۆر گرنگە، چونکە: جاری واهەیە ڕواڵەتی هەندێ ئایەتان لەگەڵ یەکدیدا دژ دەوەستێ، دەبێ لێیان وردبیتەوە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار لە شوێنێکدا کە باسی قیامەتە دەفەرموێ:

﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات.

واتە: ڕایان بگرن، لێیان دەپرسرێتەوە، یانی: هەموو مرۆڤەکان ڕابگرن، لێیان دەپرسرێتەوە.

بەڵام لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ:

﴿ ..وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ القصص.

واتە: ئەو ڕۆژە گوناهباران لەبارەی گوناهەکانیانەوە، پرسیاریان لێ ناکرێ.

---

(١) واتە: (علم التعارض والترجيح بين الأدلة الشرعية).

لەولا دەفەرموێ: پرسیاریان لێ دەكرێ، لێرەش دەفەرموێ: پرسیاریان لێ ناكرێ!! كاتی خۆی ئەو پرسیارە لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، كراوە، گوتوویەتی: قیامەت قۆناغ قۆناغە، لە قۆناغێكدا لێیان دەپرسرێتەوە، لە قۆناغیكدا لێیان ناپرسرێتەوە.

هەندێكی دیكە گوتوویانە: لێیان ناپرسرێتەوە، وەك پرسیار، (سؤال إستفهامٍ)، واتە بگوترێ: ئەو كارەت كردوە، یان نەتكردوە؟

بەڵام لێیان دەپرسرێ، وەك سەرزەنشت كردن (توبیخ) تۆ لە كەسێ دەپرسی: تۆ نەبووی ئەو كارەت كرد؟ مەبەستت ئەوە نیە بەرامبەرەكەت بڵێ: با، یان نا، بەڵكو مەبەستت سەرزەنشت و سەركۆنە كردنیەتی، كەواتە: وەك ڕەخنەو، سەركۆنەو، سەرزەنشت لێیان دەپرسرێتەوە، بەڵام پێیان ناگوترێ: ئایا كردووتە یان نەتكردوە؟

بواری سێیەم: تێکگیرانی سوننەت لەگەڵ واقیع و زانستدا:

ئەگەر دەقێکمان بینی لەگەڵ واقیع، یان لەگەڵ زانستی ڕاستەقینەدا، تێکدەگیرا، چۆنی چارەسەر بکەین؟

**هەنگاوی یەکەم:** بەهەمان شێوە یەکەم: دەبێ سەیری سەنەدەکەی بکرێ، ئایا ئەو دەقە بە چ سەنەدێك هاتوە؟، وە ئایا ڕاستەو زانایان سەلماندوویانە: ئەو دەقە دەچێتەوە سەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، جا چ فەرموودەی بێ، چ کردەوەی بێ، چ دانپێداهێنانی بێ؟ دەبێ لەسەنەدەکەی بکۆڵرێتەوە، ئایا ڕاستە یان نا؟

**بۆ وێنــە:**

**یەکەم:** پاڵ دراوەتە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی: {علیكم بألبان البقر وسمنانها، وإياكم ولحومها، فإن ألبانها وسمنانها دواء وشفاء، ولحومها داء} أخرجه الحاكم برقم (٨٢٣٢).

واتە: شیری مانگا وە چەورییەکەی بەکار بهێنن، وە خۆتان لە گۆشتەکەی بپارێزن، چونکە شیرەکەی و چەورییەکەی چارەسەرو شیفایە، بەڵام گۆشتەکەی دەردو نەخۆشییە.

**لێرەدا ئێمە چۆن ئەوە چارەسەر بکەین؟ لە حاڵێکدا ئەم دەقە:**

**١)** لەگەڵ قورئاندا دژ دەوەستێ، چونکە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ:

﴿وَمِنَ ٱلۡإِبِلِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ ٱثۡنَيۡنِۗ قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ ....﴿١٤٤﴾﴾.

خوا سبحانه و تعالى له میانى پێشاندانى نیعمەتەكانیدا دەفەرموێ: له حوشتر جووتێك (نێرو مێ) وه له ڕەشه وڵاخیش جووتێك، بڵێ: ئایا خوا نێرینەكانى قەدەغه كردوون، یان مێیینەكان، یان ئەوەى له هەناوى مێیینانداية؟ واته: هیچیانى قەدەغه نەكردووەو هیچ دەقێكتان بەدەستەوه نیه، ئەوانەى قەدەغەى كردبن.

كەواته: خوا سبحانه وتعالى وەك منەت و چاكەیەك دەیخاته بەرچاومان، كه ڕەشه وڵاخى بۆ خوڵقاندووین، ئنجا كەوابێ: هەم شیرى، هەم گۆشتى، هەم چەورییەكەى، سوودى هەیه، كەواته: ئەو دەقه، لەگەڵ ئەم ئایەتەدا تێك دەگیرێ.

٢) لەگەڵ سوننەتى كردەیی پێغەمبەریشدا (صلى الله علیه وسلم) تێك دەگیرێ، چونكه ئاشكرایه كه پێغەمبەرى خوا (صلى الله علیه وسلم) ڕەشه وڵاخى كردۆته قوربانیی.

٣) وه لەگەڵ واقیعیشدا تێكدەگیرێ، ئەو هەموو خەڵكه (گا، گامێش، ڕەشه وڵاخ) بەكاردێنێ، به هەموو جۆرەكان دەیخۆن و، لێشیان نەبۆته دەردو بەڵا.

كەواته: ئەم دەقه هەم لەگەڵ قورئاندا، هەم لەگەڵ سوننەتى كردەیی پێغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم)، هەم لەگەڵ واقیعدا، تێك دەگیرێ، بۆیه ئێمه ناچارین بڵێین: پێغەمبەرى خوا (صلى الله علیه وسلم) شتى واى نەفەرمووه، هەڵبەته هەرواشەو له ڕووى سەنەدەوه ئەو دەقه بەڵگەیەكى چەسپێنەرى لەسەر نیه كه هى پێغەمبەرى خوا صلى الله علیه وسلم.

**دووەم:** وێنەیەكى دیكه: پاڵ دراوەته لاى پێغەمبەرى خوا (صلى الله علیه وسلم) كه فەرموویەتى:

{مَنْ تَصَبَّحَ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً، لَمْ يَضُرَّهُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ سُمٌّ وَلَا سِحْرٌ} أخرجه أحمد برقم (١٥٧٢)، والبخاري برقم (٥١٣٠)، ومسلم برقم (٢٠٤٧)، وأبو داود برقم (٣٨٧٦)، وأخرجه أيضا البيهقي برقم (١٩٣٥٣).

واتە: هەرکەسێ بەیانیان حەوت دەنکە خورما بخوات لە خورمای (عەجوە) - کە جۆرێکە لە خورمای مەدینە- لەو ڕۆژەدا نەژەهر، نەجادوو زیانی پێ ناگەیەنێ.

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە: {مَنْ أَكَلَ سَبْعَ تَمَرَاتٍ مِمَّا بَيْنَ لَابَتَيْهَا حِينَ يُصْبِحُ لَمْ يَضُرَّهُ سُمٌّ حَتَّى يُمْسِيَ} أخرجه مسلم برقم (٢٠٤٧)، وأخرجه أيضا: البيهقي في السنن الكبرى برقم (١٩٣٥٤)، وفي شعب الإيمان برقم (٥٨٧٥).

واتە: هەرکەسێ بەیانی کردەوە حەوت دەنکە خورمای نێوان ئەو دوو شیوە ڕەشە (کە مەبەست پێی مەدینەیە) بخوات، تاکو ئێوارە دەکاتەوە، ژەهر کاری تێ ناکات.

ئنجا لەبەر ئەوەی ئەم دەقە لە کتێبەکانی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە، زانایان لەو بارەوەکەوتوونەتە مشت و مڕ، کە ئایا چی لێبکەن؟

(إبن القيم) ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: {وهذا الحديثُ من الخطاب الذي أُريد به الخاصُّ، كأهلِ المدينة ومَن جاوَرَهم}[1]، واتە: ئەم فەرموودەیە لەوەیە کە بەگشتی هاتوە، بەڵام مەبەست پێی خەڵکێکی تایبەتە واتە: بەس بۆ خەڵکی مەدینە وایە، کە ئەگەر ئەو حەوت دەنکە خورمایە بخۆن، جادووو ژەهر کاریان تێ ناکات.

دوایی دەڵێ: جاری وا هەیە خەڵکی شوێنێك، لەبەر ئەوەی ئاوو هەوایەکەی جۆرێکە، یاخود لەبەر جۆری خورمایەکەی، یاخود خۆیان قەناعەتیان وایە، (لە ڕووی دەروونییەوە) بەهۆی ئەو جۆرە خواردنەوە، دەپارێزرێن لە کارتێکران بە جادوو یاخود ژەهر.

بەڵام ئێمە دەڵێین: ئەگەر دەرکەوت، بەو جۆرە خورمایە ئەو چارەسەرو پارێزرانە نایەتە دی، ئەو کاتە: ١)- یان دەبێ بڵێین: ئەو ڕۆژگارە وا بووە، ٢)- ئەگەرنا ئێستا کە دەرکەوت: خەڵك ئەو جۆرە خورمایە دەخواو، لەمەدینەشەو،

---

(١) زاد المعاد في هدي خير العباد.

له جادووو ژەهریش ناپارێزێ، دەڵێین: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی نەفەرمووە با لە (صحیح)ی بوخاریی و موسلیمیشدا هاتبێ، مادام لەگەڵ واقیع و عەقڵ و ئەزموونیدا تێکبگیرێ، بەتەئکید پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شتی وا نافەرمووێ.

نموونەیەکی دیکە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوایە فەرموویەتی: {عَلَيكم بالإثمِد فإنه يَجْلوا البصر ويُذْهِبُ بالأذى} کە جۆرێکە لە کل، واتە: چاوی خۆتان بە کل بڕێژن، چونکە چاو ڕوون دەکاتەوەو ئازار لادەبات.

ئنجا ئایا ئەو شتانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووني، یان پاڵ دراوەتە لای ئەو، بۆ ئێمە پابەندکەر (ملزِم)ن؟؟

زانایان دەڵێن: هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووني یان کردووني، وەك ئەزمووني بەشەریی خۆی، چ پەیوەندییان بەبواری پزیشکییەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە لایەنی کشتوکاڵەوە هەبێ، چ بەپیشەسازییەوە هەبێ، هەموو ئەو شتانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ ئەزمووني بەشەر، وەك دین بۆ ئێمە پابەندکەر نین.

نموونەیەکی دیکە: کابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوتی: برایەکەم سکی دەچێت {واتە: ئیسهالە}، فەرمووی: هەنگوینی بدەیە، پاشان هاتەوە گوتی: هەر سکی دەچێ، جاری دووەم و جاری سێیەم هاتەوە هەر گوتی: سکی دەچێ، ئەویش فەرمووی:

{صَدَقَ اللَّهُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ} أخرجه أحمد برقم (١١٨٨٩)، والبخاري برقم (٥٣٦٠) ومسلم برقم (٢٢١٧)، والترمذي برقم (٢٠٨٢).

واتە: خوا ڕاست دەفەرمووێ و، سکی برایەکەت {کە هەر چاك نابێ} درۆ دەکات.

لێرەدا دەپرسین: ئایا مەرجە هەرکەسێ سکی بچێ، هەنگوین بۆی باش بێ؟ ئەدی چۆن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وای فەرمووە؟؟

با شتێکتان بۆ ڕوون بکەمەوە، کە بەداخەوە کەم باس کراوە، ئەویش ئەوەیە کە فەرموودەیەك (دەقێك) بۆ ئێمە دێ، زۆر بە کورتیی دێ، بەڵام مەرج نیە هەر ئەوەندە بووبێ، بەتەئکید ئەو کابرایە کە هاتوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لێی پرسیوە: برایەکەت سکی چۆن دەچێ؟

حەتمەن چۆنیەتی سك چوونەکەی پرسیوە، کە چۆنەو لێی تێگەیشتوەو، ئنجا فەرموویەتی: هەنگوینی بدەیە، بەڵام ئەو درێژەیە نەهاتوە لە فەرموودەکەدا، شارەزایان گوتوویانە: لە هەندێ حاڵەتی ئیسهالییدا گەدە وای لێدێ، خواردنی پێوە بەند نەبێ، چینێکی لینجی لێ دەنیشێ و خوارد هەزم ناکات، ئنجا ئەو هەنگوینە شۆردوویەتەوە، بە قۆناغی یەکەم هەندێکی شۆردۆتەوە، ئنجا قۆناغی دووەم، پاشان قۆناغی سێیەم، وە لەقۆناغی چوارەمدا تەواو شۆراوەتەوە، لە ڕووی زانستییشەوە هەروایە، جاری وایە کەسێ پزیشکەکان چارەسەری بۆ دادەنێن، پێی دەڵێن: دەبێ ماوەی مانگێك بەکاری بێنی، هی وا هەیە دەبێ ماوەی شەش مانگ بەکاری بێنێ، ئنجا بەتەواوی ئەو دەردە، دەردەکا (إبن خلدون)یش دەربارەی ئەو فەرموودانەی کە پەیوەندییان بە لایەنی پزیشکییەوە هەیە، گوتوویەتی:

{وللبادية من أهل العمران، طب يبنونه في غالب الأمر على تجربة قاصرة على بعض الأشخاص متوارثاً عن مشايخ الحي وعجائزه، وربما يَصِحُّ منه البعض، إلا أنه ليس على قانون طبيعي، ولا على موافقة المزاج، وكان عند العرب من هذا الطب كثير وكان فيهم أطباء معروفون كالحارث بن كلدة وغيره، والطب المنقول في الشرعيات من هذا القبيل، وليس من الوحي في شيء، وإنما هو أمر كان عادياً للعرب، ووقع في ذكر أحوال النبيِّ صلى الله عليه وسلم، من نوع ذكر أحواله التي هي عادة وجِبِلَّة، لا من جهة أن ذلك مشروع على ذلك النحو من العمل، فإنَّه صلى الله عليه وسلم إنما بُعِثَ لِيُعَلِّمنا الشرائع ولم يُبْعَثْ لتعريف الطب ولا غيره من العاديات، وقد وَقَعَ له في شان تلقيح النخل ما وقع، فقال: أنتم أعلم بأمور دنياكم}[1].

---

(١) مقدمة ابن خلدون، ص ٣٩١، طبعة دار العودة - بيروت.

واتە: خەڵکی خێڵەکیی نیشتەجێی ئاوەدانیی، جۆرێك لە پزیشکیی (طب) یان هەیە، کە بەزۆریی لەسەر بناغەی ئەزموونێکی کەم و کورتی هەندێك کەس بنیات نراوە، کە پیرەمێردو پیرەژنەکانی ئەو شوێنە بە میرات گیراوە، دەشگونجێ هەندێکی ڕاست بێ، بەڵام بەگوێرەی یاسایەکی سروشتیی و گونجان لەگەڵ میزاجدا نیە.

هەروەها گەلی عەرەب لەو جۆرە پزیشکییگەرییەیان زۆر بووە، هەندێك پزیشکی ناسراویشیان هەبوون وەك (الحارث بن كلدە)و غەیری ویش، وە ئەو پزیشکییگەرییەی لە دەقە شەرعیەکاندایە لەو جۆرەیە، هیچ پەیوەندیی بە وەحییەوە نیە، بەڵکو شتێکی کلتووریی عەرەبان بووە، وە ئەوەی کە لەو بارەوە لە باسی حاڵ و باڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خراوەتە ڕوو، لەو جۆرەیە کە پەیوەستە بە نەریت و سروشت و میزاجەوە، نەك لەو ڕووەوە کە ئەوە کارێکی شەرعییەو پێویستە ڕەچاو بکرێ، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆیە نێرراوە کە بەرنامەکانمان فێر بکات (حەڵاڵ و حەرام و، چاك و خراپ) نەك پزیشکیی و نەریتەکانی دیکەی وەك وی، کاتێکیش لە ڕووداوی متوربە کردنی دار خورمایەکان دا، ئەوەی بەسەرهات کە دیارە، فەرمووی: ئێوە لە کارو بارەکانی دنیاتاندا شارەزاترن.

پوختەی قسەکەی ئەوەیە دەڵێ: لەنێو گەلی عەرەبدا جۆرێك لە پزیشکیگەریی هەبووە وەك کلتوور بۆیان بەجێماوە، بە ئەزموونی خۆیان فێری بوون، پیاوە بەتەمەنەکان و ئافرەتە بەتەمەنەکانیان، فێری بوون، وە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەوەی لە کۆمەڵگای خۆیدا بووە، لە ڕووی پزیشکیی یان لەهەر ڕوویەکی دیکەوە بەهرەمەند بووەو سوودی لێ بینیوە، بۆیەش ئەو پزیشکییەی لە دەقە شەرعییەکانەوە دێت، هیچ پەیوەندیی بە وەحییەوە نیە بەڵکو شتێکی کلتووریی و نەریتێك بووە لەنێو ئەو گەلەدا، بۆیە بۆ ئێمە پابەندکەر نیە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەهاتوە پزیشکییمان فێر بکات، بەڵکو هاتوە دینمان فێر بکات، هاتوە فێری دینداریمان بکا: پەیوەندییمان لەگەڵ خوا، لەگەڵ خەڵك، لەگەڵ خۆماندا، بەڵام ئەو زانستانەی دیکە کە پەیوەندییان بە

ژیانی دنیامانەوە هەیە، بۆخۆی زۆر بەڕوونی فەرموویەتی: {أَنتم أَعلَم بأمورِ دُنياكم} ئێوە لەکاروباری دنیای خۆتان شارەزاترن.

**هەنگاوی دووەم:** دوای لێکۆڵینەوە لەسەنەدی فەرموودەکە، هەنگاوی دووەم ئەوەیە دەبێ لەماناو مەبەستی دەقەکەش دڵنیابین، بۆ وێنە:

أ- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {سَيْحَانُ وَجَيْحَانُ، وَالْفُرَاتُ وَالنِّيلُ كُلٌّ مِنْ أَنْهَارِ الْجَنَّةِ} أخرجه مسلم برقم (٢٨٣٩)، وأخرجه أيضا: أحمد برقم (٧٨٧٣)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

(سَيْحَانُ وَجَيْحَانُ) ئێستا پێیان دەگوترێ: (سَيْحٌ وَجَيْحٌ)، دوو ڕووبارن، بەهەمان شێوەی (فرات و نیل) دەفەرموێ: هەموو ئەوانە لە ڕووبارەکانی بەهەشتن.

ئنجا هەندێ لە زانایان کە شارەزای جوگرافیا نەبوون، یەکسەر گوتوویانە: بەڵێ ئەو ڕووبارانە سەرچاوەکەیان لە بەهەشتییە!!

بەڵام زۆربەی هەرەزۆری زانایانی لێکۆڵەرەوە، کە بێگومان زانای ئیسلام، دەبێ شتێك لە (جوگرافیا، مێژوو، گەردوونناسیی، فیزیا، کیمیا، دەروونزانیی، کۆمەڵناسیی، پزیشکیی) بزانێ، ئەگەرنا ئەو دەقانەی کە قسە لەو بوارانە دەکەن، بەهەڵە لێیان تێ دەگا، زانایانی لێکۆڵەرەوە گوتوویانە: نەخێر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەبەستی ئەوە نیە، چونکە سەرچاوەی ئەو ڕووبارانە، دیارن، لە میصرو خوارووی سوودان و تورکیاو ئەو شوێنانەوەن.

مەبەستی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لێرەدا ئەوەیە، کە ئاوی ئەو چوار ڕووبارە ئاوێکی شیرین و خۆش و بە پێزەو، لەو ڕووەوە دەشوبهێنە ئاوی بەهەشتەوە.

ب- لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: {مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ} أخرجه مالك برقم (٤٦٤)، وأحمد برقم (١٦٥٠٠)، والبخاري برقم (١١٣٧)، ومسلم برقم (١٣٩٠)، والنسائي برقم (٦٩٥).

واتە: نێوانی ماڵەكەم و مینبەرەكەم، باخچەیەكە لە باخچەكانی بەهەشت[1].

كە بەدڵنیایی مەبەستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە نیە، ئەو شوێنە پارچەیەكە لە بەهەشت، لەبەهەشت دابڕاوەو لەوێ دانراوە! بەهەمان شێوە ئەو چوار ڕووبارەی فەرموودەكەی دیكەش، ڕواڵەتی مانایەكە مەبەست نیە، كە ئەو چوار ڕووبارە لەبەهەشتەوە هەڵبقوڵن! ئەدی مەبەستی چیە؟؟ با تەماشای ئەو قسەیەی (إبن حزم) بكەین، كە خۆی یەكێكە لە دامەزرێنەرانی مەزهەبی (ظاهري) كە ڕواڵەتی دەقەكان دەگرێ، بە زاراوەی ئەمڕۆ سەلەفیی بووە بە ئیمتیاز، بەڵكو جاری وایە زێدەڕۆیی زۆری كردووە لە گرتنی دەقەكاندا بە وشكیی، لەو بارەوە فەتوای سەیری زۆرن، كەچی (إبن حزم) دەربارەی هەردوو فەرموودەكە دەڵێ:

{وَهَذَانِ الْحَدِيثَانِ لَيْسَ عَلَى مَا يَظُنُّهُ أَهْلُ الْجَهْلِ مِنْ أَنَّ تِلْكَ الرَّوْضَةَ قِطْعَةٌ مُنْقَطِعَةٌ مِنْ الْجَنَّةِ, وَأَنَّ هَذِهِ الأَنْهَارَ مُهْبَطَةٌ مِنْ الْجَنَّةِ, هَذَا بَاطِلٌ وَكَذِبٌ; لإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ فِي الْجَنَّةِ: (إِنَّ لَكَ أَنْ لاَ تَجُوعَ فِيهَا, وَلاَ تَعْرَى وَأَنَّكَ لاَ تَظْمَأُ فِيهَا, وَلاَ تَضْحَى) فَهَذِهِ صِفَةُ الْجَنَّةِ بِلاَ شَكٍّ, وَلَيْسَتْ هَذِهِ صِفَةَ الأَنْهَارِ الْمَذْكُورَةِ, وَلاَ تِلْكَ الرَّوْضَةِ, وَرَسُولُ اللَّهِ عليه السلام لاَ يَقُولُ إلاَّ الْحَقَّ. فَصَحَّ أَنَّ كَوْنَ تِلْكَ الرَّوْضَةِ مِنْ الْجَنَّةِ إنَّمَا، هُوَ لِفَظلِهَا, وَأَنَّ الصَّلاَةَ فِيهَا تُؤَدِّي إلَى الْجَنَّةِ, وَأَنَّ تِلْكَ الأَنْهَارَ لِبَرَكَتِهَا أُضِيفَتْ إلَى الْجَنَّةِ, كَمَا تَقُولُ فِي الْيَوْمِ الطَّيِّبِ: هَذَا مِنْ أَيَّامِ الْجَنَّةِ}[2].

واتە: ئەم دوو فەرموودەیە وەك خەڵكی نەزان گومان دەبەن، مانایان ئەوە نیە، كە ئەو (رَّوْضة)یە پارچەیەك بێ لەبەهەشت، لەبەهەشت بڕابێ و، هێنرابێ لەوێ دانرابێ، هەروەها مەبەست ئەوە نیە كە ئەو ڕوبارانە، لە بەهەشتێوە دابەزێنراون و، هێنراونەتە سەر زەوی، ئەمە بەتاڵەو درۆیە، چونكە خوا دەربارەی

---

(١) زۆر كەسی خۆمان كە دەچێ بۆ عومرە یان بۆ حەج، دەبێتە قەرەباڵەغییەكی زۆر زۆر لەوێ، كە ڕەنگە هەندێ لەو خەڵكە بەو نیەتە وا بكات، كە ئەو شوێنە پارچەیەكە لە بەهەشت!!

(٢) المحلى بالآثار، ج٧ ص ٢٨٣.

بەهەشت دەفەرموێ: ﴿إِنَّ لَكَ أَنْ لاَ تَجُوعَ فِيهَا، وَلاَ تَعْرَى وَأَنَّكَ لاَ تَظْمَأُ فِيهَا، وَلاَ تَضْحَى﴾، تۆ ئەی ئادەم! بۆت هەیە لەبەهەشتدا نە برسییت بی، نە ڕووت بی، وە نەتینووت دەبێ، نە گەرمات دەبێ.

ئەمە سیفەتی بەهەشتە، بەڵام كەسێ كە لەڕەوزەیە برسیشی دەبێ و گەرماشی دەبێ و تینووش دەبێ، وە لەخۆوە پۆشتە نابێ، ئەوەی كە خوا دەربارەی بەهەشت فەرموویەتی، لەوێدا نایەتەدی، هەروەها ئەو ڕووبارانەش بەهەمان شێوە، سیفەتی ڕووبارەكانیش وا نیە كە خوا بەهەشتی پێ وەسف كردوە، وە پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) تەنیا حەق دەفەرموێ: كەواتە مەبەست لەوە كە دەفەرموێ: (روضة) باخچەیەكە لە باخچەكانی بەهەشت، مەبەست ئەوەیە دەیەوێ فەزڵی ئەو شوێنەمان پێشان بدات، وە مەبەست ئەوەیە نوێژ كردن لەو شوێنەدا دەبێتە هۆكاری چوونە بەهەشت، وە ئەو ڕووبارانەش لەبەر ئەوەی ئاوەكەیان بەبەرەكەتە، {ئاودێریی و كشتوكاڵیی زۆریان لەبەر دەكرێ}، لەبەر بەرەكەت و بەرهەمیان پاڵ دراونەتە لای بەهەشت، وەك چۆن ڕۆژێك ڕۆژێكی خۆش بێ، دەگوترێ: ئەمڕۆ دەڵێی ڕۆژێكە لە ڕۆژەكانی بەهەشت، واتە: ڕۆژێكی خۆشە.

قسەكەی زۆر جوانە، مەبەستەكەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەبێ وەك خۆی لێی تێبگەی، بۆ ئەوەی لە فەرمایشتەكانی نەكەوینە گومان، ئەگەر هیچ چاریش نەكرا، ئەوە بەتەئكید دەبێ بڵێین: ئەوە ئەو نەیفەرمووە.

ج- وێنەیەكی دیكە بۆ زیاتر تێگەیشتن:

{جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ مَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟ قَالَ: حُبَّ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَرَسُولِهِ، قَالَ: أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ، فَمَرَّ غُلَامٌ لِلْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ قَالَ أَنَسٌ: وَكَانَ مِنْ أَقْرَانِي، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنْ يُؤَخَّرْ هَذَا، فَلَنْ يُدْرِكَهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ} أخرجه أحمد برقم (١٢٩٩٣) قال شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط الشيخين.

ڕۆژێك کابرایەکی دەشتەکیی هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاخیر زەمان (ساعَة)[1] کەی دێ؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردوە؟ ئەویش گوتی: خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەوانەدای کە خۆشت دەوێن، دوایی غولامێکی موغەیرەی کوڕی شوعبە بەوێدا هات - ئەنەس دەڵێ: هاوتەمەنی من بوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەو منداڵە ئەگەر تەمەن بکات و بژی، پیر نابێ کە (ساعَة) دێت، یانی: ناگاتە تەمەنی پیریی کە (ساعَة) دێت.

ئنجا، ئەگەر تەماشای ڕواڵەتی فەرمایشتەکە بکەی، ئایا نەك هەر ئەو منداڵە بەڵکو چەند جیلی دیکەش هاتن و ڕۆیشتن، (ساعَة) هەر نەهات، ئایا دەبێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەیزانیبێ؟!

نەخێر، بەڵکو (ساعَة) ئەو کاتەیە کە خەڵك تێیدا دەمرێ، ئنجا (ساعَة الكبرى) هەیە و، (ساعَة الصغرى) هەیە، وەك گوتراوە: (من مات فقد قامت قيامته)، بەتەئکید مەبەستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوە بووە کە تاکو ئەو گچکانەتان پیر دەبن، گەورەکانتان دەمرن، هەتا هی گچکە پیر دەبێ، هی گەورە دەمرێ و وەفات دەکات، چونکە لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە دەفەرموێ: {تَقُومَ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ}. واتە: ئاخیر زەمانی ئێوە دێ.

---

(١) بۆ زانیارییتان! (ساعة) و (قیامة) لێك جیان، خوا لە قورئاندا باسی هەردووکیان دەکا، (ساعة) یانی: ئاخیر زەمان، واتە: کۆتا ڕۆژی ژیانی مرۆڤ لەم سەر زەوییە، بەڵام (قیامة) قۆناغێکی دیکەیە کە بریتیە لە هەڵسانەوەو زیندوبوونەوەی خەڵك.

**هەنگاوی سێیەم: دڵنیا بوون لە ڕاستیی قسەی زانست:**

نموونەیەك: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

{إِذَا وَقَعَ الذُّبَابُ فِي شَرَابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ ثُمَّ لِيَنْزِعْهُ فَإِنَّ فِي إِحْدَى جَنَاحَيْهِ دَاءً، وَالْأُخْرَى شِفَاءً} أخرجه البخاري برقم (٣١٤٢)، وابن ماجه برقم (٣٥٠٥).

واتە: ئەگەر مێش كەوتە خواردنەوەی یەكێكتان، با نوقمی بكات، دوایی فڕێی بدات، چونكە یەكێك لە دوو باڵەكەی نەخۆشیی تێدایە، ئەوەی دیكەشیان شیفایە.

پاش ئەوەی لەڕووی سەنەدەوە زانیمان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، ئنجا تەماشای زانست دەكەین: ئەگەر زانست دەریخست كە نەخێر وا نیە، ئەوە دەڵێین: پێغەمبەر نەیفەرمووە، بەڵام ئەگەر زانست هیچی نەگوتبوو، هیچی لێ حاڵی نەبووبوو، هەر لەخۆوە نابێ لێی بكەوینە گومان، بۆ وێنە: تازە دۆزراوەتەوە كە گۆشتی بەراز، هەم لەڕووی جەستەییەوە، هەم لەڕووی دەروونیەوە، زیانی زۆری هەیە، زانایان دەڵێن: ئەگەر لەڕووی جەستەییشەوە چارەسەری كرا، ئەوە لەڕووی دەروونییەوە، ئەوانەی گۆشتی بەراز دەخۆن بەتەنگەوە بوونی نامووس (غیرة)یان نامێنێ، چونكە بەراز ئاژەڵێكە (غیرة) ی نیە بەرامبەر بەمێیینەی خۆی، ئنجا ئەو حاڵەتەی بەراز، كاریگەریی دەروونیی دادەنێ لەسەر بخۆرەكانی، بەهەر حاڵ ئەمە تازە زانست ئەوەی دۆزیوەتەوە، ئنجا ئایا دەكرێ ئێمە ڕاوەستین تاكو زانست دەری دەخات، ئنجا بڕوا بەفەرمایشتەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بهێنین؟ نەخێر، گرنگ ئەوەیە هیچ كام لە عەقڵ و زانست و واقیع تێكنەگیرێ، لەگەڵ فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، هەرچەندە ئێستا زانست حیكمەتی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) دەرخستووە:

(دكتۆر: مصطفى إبراهيم حسن)[١] دەڵێ: ئێستا بە شێوەیەكی زانستیی، سەلمێنراوە، كە یەكێ لە دوو باڵەكەی مێش، دەردو، ئەوی دیكەشیان دژی ئەو نەخۆشییەی تێدایە، وە هەمیشە مێش هەر بەلای باڵە نەخۆشەكەیدا دەكەوێ! ئەو كاتەش كە پێغەمبەری خوا فەرمووویەتی، خواردنیش كەم بووە، ئنجا بێگومان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەواڵێكی داوە لە سەرووی ئاستی ئەزموونی بەشەر بووەو وەك وەحی فەرموویەتی، وە زانستیش بەتەئكید هەتا بەرەو پێشەوە دەچێ، پشتگیریی وەحی دەكا، بەڵام ئێمە نابێ چاوەڕێی زانست بكەین بزانین داخۆ دەڵێ چی؟ ئنجا باوەڕ بە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بێنین.



---

(١) أستاذ الحشرات الطبية جامعة الأزهر ومدير مركز أبحاث ودراسات الحشرات الناقلة للأمراض. بڕوانە: أفي السنة شك؟! أحمد بن يوسف السَّيِّد، ص ١٠٠-١١١.




## خورپە، یاخود: خرانە نێودڵ(إلهام)

### دەستپێك

ئێستاش دێینە سەر باس و خواسی چوارەمین سەرچاوەی بیركردنەوەی ئیسلامیی، چوارەمین ڕێگا كە زانیاریی لێوە دەستگیر دەبێ، بریتیە لە خورپە (إلهام) یاخود خرانە نێو دڵ، ئێمە چەند وشەیەكمان هەن، لە ئیلهامەوە نیزیكن، وەك: (كَشف، حَدْس، فِراسة، بَصيرة، العِلم اللَّدنّي)، كە ڕەنگە وشەی دیكەش هەبن.

**ئینجا ئێمە بابەتی خورپە لە سێ كورتە خاڵاندا دەتوێژینەوە:**

**یەكەم:** پێناسەی خورپە (إلهام)و وشە هاو وێنەكانی.

**دووەم:** بەڵگەی ڕەوا بوونی خورپە.

**سێیەم:** ئەندازەی متمانە پێكرانی ئیلهام.

سەرەتاش پێناسەی (إلهام) و پێنج وشە نیزیكەكەی دەكەین، لە یەكەمدا:

## یەكەم: پێناسەی خورپە (إلهام):

١)- (إلهـام): الجرجاني دەڵێ: {الإلهام: الإلهام ما يُلقى في الرُّوعِ بطريق الفيض، وقيل الإلهام ما وقع في القلب من علم}[1]. واتە: ئەوەیە كە دەخرێتە دڵ و دەروونی مرۆڤەوە، بە شێوەی (فیض)[2]، وە هەندێكیش گوتوویانە: ئیلهام بریتیە لە زانیارییەك كە دەخرێتە دڵ و دەروونەوە.

٢)- (الكَشـف): {الكشف في اللغة: رفع الحجاب، وفي الإصطلاح: هو الإطِّلاعُ على ما وراء الحجاب من المعاني الغيبية والأمور الحقيقية وجودا وشهوداً}[3]، واتە: (كَشف) لە زماندا بەمانای لابردنی پەردەیە، وە لەزاراوی زانایانی تەزكیەو تەصەووفدا دەڵێن: بریتیە لە شارەزا بوون و بەئاگا بوون لەوەی كە لە پشت پەردەوەیە، لەمانا پەنهانەكان، وە لە كاروبارە ڕاستەقینەكان، چ بیانبینێ، چ دەستگیری بن.

٣)- (الحَدْس): {الحدس: سرعة انتقال الذهن من المباديء إلى المطالب، ويقابله الفكر، وهو أدنى مراتب الكشف}[4]، واتە: (حدْس) بریتیە لەوەی بەخێرایی (ذهن) لەسەرەتایەكانەوە بەرەو دوایەكان {یاخود ئەو شتانەی كە دەویسترێن} بچێ، وە لەبەرامبەر (حدْس)دا (فِكر) هەیە، وە (حَدْس) بریتیە لە خوارترین پلەی كەشف.

(فِكر) ئەوەیە كە پلە پلە بۆ شتەكان بچێ، بەڵام (حَدْس) ڕاستەوخۆ بۆ شتەكان بچێ، كە لە پیاواندا فیكر بەهێز ترە، بەڵام لە ئافرەتاندا (حَدْس) بەهێزترە، وەك زانایانی دەروونناس لێیان كۆڵیوەتەوە.

---

(١) التعريفات، ص٤٠.

(٢) وشەی (فیض) لەكوردیدا دەبێتەوە بە ڕژان، یانی لەخوای پەروەردگارەوە، یان لەفریشتەوە، ئەو زانیارییە دێ.

(٣) التعريفات، ص٨١.

(٤) سەرچاوەی پێشوو ص٨٧.

٤)- (**الفِراسة**): {الفراسة في اللغة: التثبُّت والنظر، وفي اصطلاح أهل الحقيقة: هي مكاشفة اليقين ومعاينة الغيب}[١]، واتە: وشەی (فراسە) لەزماندا بەمانای سەرنجدان و تێوەڕامان دێ، وە لە زاراوەی ئەهلی حەقیقەتدا[٢]، بریتیە لەوە كە ئینسان لە شتێكدا بگاتە دڵنیایی، وە شتێك كە پەنهانە، وەك ئەوەی ببینێ، بۆی ئاوابێ.

٥)- (**البصيرة**): {البصيرة قوة للقلب المنَّور بنور القُدْس، يرى بها حقائق الأشياء وبواطنها بمثابة البصر للنفس يرى به صُوَرَ الأشياء وظواهِرَها}[٣]. واتە: (بصیره) هێزێكە لە دڵدا بەهۆی (نور القدس) {واتە: ڕووناكیەك كە لە خواوە دێ}، ئەو دڵەی پێ ڕوون دەبێتەوەو ڕاستی شتەكانی پێ دەبینێ، وە دیوی پەنهانی شتەكانی پێ دەبینێ، هەروەك چۆن بەهۆی چاوەوە نەفس ڕواڵەتی شتەكان دەبینێ، بەهۆی (بَصیرة)یشەوە دیوی پەنهانی شتەكان دەبینێ.

٦)- (**العِلم اللدنّـي**)[٤]: واتە: زانیارییەك كە بەتایبەت دراوە بە مرۆڤ.



---

(١) سەرچاوەی پێشوو ص١٦٤.

(٢) مەبەست پێی ئەهلی عیرفان و تەصەووفە.

(٣) التعريفات، ص٥٢.

(٤) واتە: زانیارییەك كە بەتایبەت دراوە بە مرۆڤ، وە ئەم وشەیە لەقورئاندا هاتوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ الكهف، واتە: مووساو غوڵامەكەی، یەكێ لەبەندەكانی ئێمەیان بینی، لەو شوێنە كە باسی دەكا، كە لەلایەن خۆمانەوە بەزەییمان پێی دابوو وە لەلایەن خۆمانەوە بەشێوەی تایبەت، زانیاریمان فێر كردبوو.

## دووەم: بەڵگەی ڕەوا بوونی خورپە (إلهام):

دەتوانین چەند بەڵگەیەك لە قورئان و سوننەت بۆ ئیسپاتی ڕەوایەتیی خورپە بهێنینەوە:

١)- خوای پەروەردگار دەفەرمویَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا .. ﴿٢٩﴾ ﴾ الأنفال.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر پارێز لە خوا بكەن (فُرقان)[1]تان پێ دەبەخشێ.

لێرەدا خوا سبحانه و تعالى زۆر بەڕوونیی دەفەرمویَ: ئەگەر پارێز لە خوا بكەن، فورقانتان پێ دەدا، واتە: دڵ ڕوونیی و بەرچاو ڕوونیی و فیراسەتێك، كە حەق و ناحەقی پێ لێك جیا دەكەیەوە، با لە ڕووی ڕواڵەتی شەرعیشەوە، ئاگات لێی نەبێ، لەو بارەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە (وابصه)ی فەرموو: {يَا وَابِصَةُ اسْتَفْتِ قَلْبَكَ، وَاسْتَفْتِ نَفْسَكَ ثَلَاثَ، مَرَّاتٍ الْبِرُّ: مَا اطْمَأَنَّتْ إِلَيْهِ النَّفْسُ، وَالْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ} أخرجه أحمد برقم (١٨٠٣٠)، والطبراني برقم (٤٠٣)، وأخرجه أيضا: الدارمي برقم (٢٥٣٣)، وأبو يعلى برقم (١٥٨٦).

---

(١) (فرقان) بریتیە لە چی؟؟

{عبدالرحمن بن ناصر السعدي} لە تەفسیرەكەی خۆیدا دەڵێ: (الفرقان: وهو العلم والهدى الذي يُفَرِّق به صاحِبُهُ بين الهدى والضلال، والحق والباطل، والحلال والحرام، وأهل السعادة من أهل الشقاوة) {تيسير الكريم المنّان في تفسير كلام الرحمن} ص ٣١٩، واتە: (فرقان) بریتییە لەو زانیاریی و ڕێنماییەی كە خاوەنەكەی ڕێڕوونیی و گومڕایی، حەق و ناحەق، حەڵاڵ و حەرام، وە ئەوانەی خاوەنی بەختەوەریین و، ئەوانەی خاوەنی بەد بەختیین، لێك جیا دەكاتەوە.

زانایان دەڵێن: (الفرقان حاله يفرق بها بين الحق والباطل) واتە: فورقان حاڵەتێكە بۆ مرۆڤ دروست دەبێ، حەق و ناحەقی پێ لێك جیا دەكاتەوە.

واتە: ئەی وابیصە! پرس بە دڵی خۆت بکە و، پرس بە نەفسی خۆت بکە، سێ جاران (وایفەرموو) چاکە ئەوەیە دەروون پێی ئاسوودە بێ، گوناهیش ئەوەیە دەروون پێی ناموڕتاح بێ، هەرچەندە خەڵك فەتوات بۆ بدەن و، فەتواشیان بۆ داوی.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ وَالْإِثْمُ مَاحَاكَ فِي نَفْسِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاس} أخرجه أحمد برقم (١٧٦٦٨)، والبخاري في الأدب المفرد برقم (٢٩٥)، ومسلم برقم (٢٥٥٣)، والترمذي برقم (٢٣٨٩) وقال: حسن صحيح، وأخرجه أيضا: الحاكم برقم (٢١٧٢) وقال: صحيح الإسناد.

واتە: چاکەکاریی بریتیە لە ڕەوشت جوانیی و ئاکار پەسندیی و، گوناح ئەوەیە لە دڵتدا بێت و بچێت و، پێی ناموڕتاح بی و، پێشت ناخۆش بێت خەڵك پێی بزانێ.

٢)- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾﴾ فصلت.

ئایەتەکان بەڕوونیی لەبارەی خەڵکانێکەوە کە خاوەنی ئیمان و ئیستیقامەتن، دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایە، پاشان ڕاوەستاوو دامەزراو بوون {لەسەر ئەوە}، فریشتەکان دادەبەزنە سەریان، پێشیان دەڵێن: پەژارەتان نەبێ، خەم و دڵ ناڕەحەتییتان نەبێ و، دڵخۆش بن، بەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێ دەدرا، (فریشتەکان بەو جۆرە کەسانە دەڵێن): ئێمە دۆست و نزیك و پشتیوانی ئێوەین (ئنجا باسی نیعمەتەکانی بەهەشت دەکەن).

كەواتە: ئەوەش زۆر بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، كە فریشتەكان لەگەڵ ئیمانداراندا دەبن، دڵخۆشیان دەكەن و، غەم و پەژارەیان لێ لادەبەن و، موژدەشیان پێ دەدەن.

(إبن كثير) دەڵێ: {قال زيد بن أسلم: يُبَشِّرونه عند موته، وفي قبره، وحين يبعث. رواه ابن أبي حاتم، وهذا القول: يجمع الأقوال كلها، وهو حسن جِداً، وهو الواقع}[1]، واتە: زەیدی كوڕی ئەسلەم لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێ: لەكانی مردنیدا موژدەی پێ دەدەن و، لە گۆڕەكەشیدا موژدەی پێ دەدەن و، كاتێ كە زیندووش دەكرێتەوە، فریشتەكان موژدەی پێ دەدەن، ئەمە ئیبن و ئەبی حاتەم گێڕاویەتەوە، (إبن كثير) دەڵێ: ئەم قسەیە هەموو قسەكان كۆ دەكاتەوە و، قسەیەكی زۆر چاكە و، لە واقیعیشدا هەر وایە.

یانی: شتێكی واقیعییە كە فریشتەكان لەگەڵ ئیمانداراندا هەن.

ئنجا (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا ئەو ئایەتە كە دەفەرموێ: ﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ ئاوا تەفسیری دەكا: {يَحُثُّونهم في الدنيا على الخير، ويزَيِّنونَهُ لهم، ويُرْهِبونهم عن الشر، وَيُقَبِّحونه في قلوبهم، ويدعون الله لهم، ويُثَبِّتونهم عند المصائب والمخاوف}[2]، یانی: كە فریشتەكان دەڵێن: ئێمە دۆستی ئێوەین لە دونیاو لە دواڕۆژدا، مەبەست ئەوەیە: لە دنیادا هانیان دەدەن یانی: ئیلهامیان بۆ دەكەن و دەیخەنە دڵیان، هانیان دەدەن لەسەر چاكە، وە ئەو خێرو چاكەیان بۆ جوان دەكەن، {ئینسانی ئیماندار چەند لەزەت دەكات، لە نوێژو لە ڕۆژوو لە چاكەو خێر!! ئەوە فریشتەكان بۆی جوان دەكەن و بۆی شیرین دەكەن}، وە لە خراپە دەیانترسێنن و لەبەر چاویان ناشیرینی دەكەن، وە بۆیان لەخوا دەپاڕێنەوە، وە لەكاتی مەترسییدا پێیان دەچەسپێنن.

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير ص ١١٢٣.

(٢) تيسير الكريم الرحمن، ص ٧٤٨.

خوشك و برایانی بەڕێزم! ئەو حاڵەتانە هەموویان ئەزموون کراون، بۆیەش دەبینین (إبن كثير) دەڵێ: (وهو الواقع) هەر ئەوەش واقیعە، هەر کەسە بە ئەندازەی ئەوەی ئیمان و تەقوای هەیە، هەست بەو شتانە دەکات، ئینسان هەتا زیاتریش پێویستیی بە فریشتان بێ، وەزعەکەی وابێ زیاتر پێویستیی بێ، ئنجا کەسێکی بۆ خوا صوڵحاویش بێ، فریشتەکان زیاتر لەگەڵی دەبن، یانی: خوای بەبەزەیی لەقەدەر پێویستیی لەگەڵ بەندەکانیدا دەبێ، بەتایبەت ئەو کاتەی کە مرۆڤ هیچ چارەو دەرەتانی نامێنێ و، دەستی لە هەموو پچکان دەبڕێ، ئەو کاتە ئیمداداتی خوایی لەگەڵی دەبێ، چ لە ڕێگای فریشتانەوە، چ لە ڕێگای ئەوەوە کە هەندێ شتی بخاتە نێو دڵ و ئیلهامی بکات و دڵی بچەسپێنێ.

٣)- بەڵگەیەکی دیکە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّهُ قَدْ كَانَ فِيمَا مَضَى قَبْلَكُمْ مِنْ الْأُمَمِ مُحَدَّثُونَ، وَإِنَّهُ إِنْ كَانَ فِي أُمَّتِي هَذِهِ مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ} أخرجه أحمد برقم (٨٤٤٩)، والبخاري برقم (٣٢٨٢).

واتە: بێگومان لەپێش ئێوەدا (مُحَدَّثُ)[١] هەبوون، ئنجا ئەگەر لە ئوممەتی مندا کەسێك هەبێ، عومەری کوڕی خەتتابە.

ئەوەی عومەریش خوا لێی ڕازی بێ زۆر ئاشکرایە، چەند جار پێشنیاری بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردوە، بەپێی پێشنیارەکەی ئەو ئایەت دابەزیوە، وەك لە صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە، لە چەند حاڵەتێکدا، کە هەندێکیان دەیگەیەننە حەوت حاڵەت، ئەمە دووبارە بۆتەوە، بۆ وێنە:

١)- تەوافیان کردوە بەدەوری کەعبەدا، عومەر خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) (لَوْ اتَّخَذْنَا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) واتە: ئایا لای مەقامی ئیبراهیم نەکەینە نوێژگە؟ خوای پەروەردگار دوای ئەوە ئایەتی دابەزاندو فەرمووی: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى}.

---

(١) (مُحَدَّثُ) واتە: قسە بۆ کراو، مەبەست ئەوەیە کە فریشتەکان قسە دەخەنە دڵی، واتە: بەشێوەی پەنهان قسەی لەگەڵدا دەکەن، یانی: (مُلْهَمون) ئەوانەی ئیلهامیان بۆ دەکرێ.

٢)- دەربارەی هاوسەرەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە پەردەیان بۆ بگیرێتەوە[١]، كە كچێكی خۆیشی هاوسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووە، كە ناوی (حەفصەیە) خوا لێی ڕازی بێ، عومەر خوا لێی ڕازی بێ زۆر بە (غَيرة) بووە، كە بە كوردی دەبێتەوە بە {بەتەنگ ناموسەوە بوون}، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله عليه وسلم) چاك و خراپ دێنە ماڵی ئێوە، ئەگەر هاوسەرەكانت پەردەیەكیان بۆ بگیرێتەوە باشە، واتە: خەڵك هەمووی نەیانبینێ و قسەیان لەگەڵدا بكات، دوایی خوای كارزان ئەو ئایەتەی ناردە خوار، كە دەفەرموێ:

﴿...وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍۚ..(٥٣)﴾ الأحزاب.

ئەگەر ئیشێك پێویستیەكتان لێ داوا كردن —لە هاوسەرانی پێغەمبەر- لەپشت پەردەوە داوایان لێ بكەن.

لێرەدا با مەسەلەیەك ڕاست بكەمەوە: زۆربەی خەڵكی وا دەزانن ئەو پۆشاكەی ئێستای ئافرەتان ئەوە حیجابە، كە ئەوە ڕاست نیە، بەڵكو ئەوە پۆشاك (لباس)ە، (حجاب) یانی: پەردە، ئیدی دوای پێشنیارەكەی عومەر خوا لێی ڕازی بێ، ئەو ئایەتە دابەزیوەو پەردە گیراوەتەوە، ئەوەش تایبەت بووە بەخێزانەكانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، هەڵبەتە ئەگەر كەسێكی دیكەش شتێكی وا لەماڵەوە بكات، ناڵێین شتێكی ناشەرعیی كردوە، بەڵام با وا نەزانێ كە پابەند كراو (ملزم)ە بەوەی ئەوە بكات، بەڵكو حیجاب تایبەت بووە بە دایكانی بڕوادارانەوە خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوەش دوای ئەوەی خەڵكانێكی زۆر هاتنە نێو ئیسلامەوە، خەڵكی سەیر سەیر، بۆ نموونە: ڕۆژێك كابرایەك كە سەرۆك عەشیرەت دەبێ، دێتە ماڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەر لەوەی حیجاب پێویست بكرێ، دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دێت و دەچێت، خزمەت دەكات، ئەویش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلى الله

---

(١) موسلیم بە ژمارە (٢٣٩٩) بەم شێوەیە هێناویەتی: {عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: قَالَ عُمَرُ: وَافَقْتُ رَبِّي فِي ثَلَاثٍ: فِي مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ، وَفِي الْحِجَابِ، وَفِي أُسَارَى بَدْرٍ}.

علیه وسلم) ئەو ئافرەتە كێیە؟ پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ئەوە دایكی ئیمانداران، عائیشەی هاوسەرمە، ئەویش دەڵێ: ئەو مندالكارە شایستەی تۆ نیە، من هاوسەرێكی زۆر جوانم هەیە، ئافرەتێكی پێكراوە، دەیدەمە تۆ، تۆش ئەوە بدە بەمن! پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ئاخر ئەوە دروست نیەو نابێ، دوایی كە دەڕوا دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: (مَن هَذا الأَحمَق؟) ئەو كەودەنە كێ بوو؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (هذا أحمق مطاع) واتە: ئەمە كەودەنێكی فەرمانبەریی بۆ كراوە، دوایی دەفەرموێ: ئەوە كەسێكە كە شمشێرەكەی لە كالانێ دەركێشا، هەزار كەس شمشێری لەگەڵ هەڵدەكێشێ، بێ ئەوەی بپرسن: لەبەر چی تووڕە بووی؟ بەڵكو دەڵێن: كێ بكوژین؟

مەبەستم ئەوەیە كە پەردە (حجاب) تایبەت بووە بە هاوسەرانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام قسەكە بە هەڵە وەرمەگرن، ناڵێین: با غەیری هاوسەرانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆیان دانەپۆشن، مەبەستم ئەوەیە پەردە گرتنەوە لە ماڵدا تەنها لەسەر هاوسەرانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرز بووە، بەڵام ئەگەر كەسێك ئەوە بكات، ناڵێین: شتێكی ناشەرعیی كردوە، بەڵام با ماڵ و منداڵی خۆی ئەزیەت نەدات و سەغڵەتیان نەكات و پێشی وابێ، شتێكی باشی كردوە، بەڵام ناڵێین: دروست نیە، هەروەك پێچە (نقاب) ئافرەتان ئەگەر بیگرنەوە، ناڵێین: دروست (جائز) نیە، بەڵام دەبێ بزانرێ كە زۆربەی هەرە زۆری تەفسیرزان و فەرموودەناس و شەرعزانان (المفسرون والمحدثون والفقهاء) ڕایان وایە كە ئافرەت پابەندكراو (ملزم) نیە كە هەردوو دەست و دەم و چاوی داپۆشێ و بۆی هەیە بەدەرەوە بن، بۆ ئیش و كاری خۆی، وەك (القرطبي) لە تەفسیری {إلاّ ما ظَهَرَ مِنها}دا دەڵێ: (ما یظهر عادە وعبادە) ئەوەی بە عادەت و لە عیبادەتدا، دەردەكەوێ، لە حەج و نوێژدا، ئافرەت فەرزە دەست و دەم و چاوی دیار بن، وەك عادەتیش لەبەر ئەوەی لە مامەڵەی نێو خەڵكیشدا ئافرەت دەبێ دەم و چاوی دیار بێ، تاكو خەڵك

بیناسنەوەو خەڵك بناسێ و، بەڕێی خۆی ببینێ، دەستیشی دیار بێ، بۆ ئەوەی شتی پێ بگرێ.

٤)- فەرمایشتێكی دیكە لەو بارەوە: {اتَّقُوا فِرَاسَةَ الْمُؤْمِنِ فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللَّهِ، ثُمَّ قَرَأَ (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ)} أخرجه البخاري في التأريخ الكبير (٣٥٤/٧)، والترمذي برقم (٣١٢٧)، وقال: حديث غريب، وأبو نعيم في الحلية (٢٨١/١٠)، وأخرجه أيضا: الطبري (٤٦/١٤)، قال الألباني في السلسلة الضعيفة برقم (١٨٢١): حديث ضعيف.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو ئایەتەی خوێندەوە: (إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ) واتە: لەمەدا نیشانە هەن بۆ كەسانێك كە (تَوَسُّم)یان هەبێ، {واتە: بتوانن لە شت ڕابمێنن و دیوی پەنهانی شتەكان ببینن}، ئنجا فەرمووی: خۆ بپارێزن لە پەنهان بینینی ئینسانی بڕوادار، چونكە بە نووری خوا دەبینێ.

كەواتە: خورپەو خرانە نێودڵ، دەگونجێ بۆ ئیماندار هەبێ و، ئەو ئایەتەو فەرموودانەش بەڵگەن و، دەگونجێ زۆر بەڵگەی دیكەش بهێنرێنەوە لەو بارەوە.

## سێیەم: ئەندازەی متمانە پێكرانی ئیلهام

ئایا ئیلهام تا چ ڕاددەیەك متمانەی پێ دەكرێ؟ تا چ ڕاددەیەك بەبەڵگەی شەرعیی دادەنرێ؟ لەو بارەوە (إبن حجر العسقلاني) دەقێكی زۆر جوان لە (إبن السمعاني)ەوە دێنێ، دەڵێ: {وإنكارُ الإلهام مردود، ولكن التمييز بين الحق والباطل في ذلك: أَنَّ كلَّ ما استقام على الشريعة المحمدية، ولم يكن في الكتاب والسنة، ما يردُّه، فهو مقبول، وإلا فمردود، يقع من حديث النفس ووسوسة الشيطان، ثم قال: ونحن لا نُنْكِرُ أن الله يُكْرِم عَبْدَه بزيادة نور منه، يزداد به نظره ويَقْوى به رأْيُهُ، وانما نُنْكِر أَن يرجع إلى قلبه، بقولٍ لا يُعْرَفُ أصلُه، ولا نَزْعُم أنه حجة شرعية، وانما هو نور يختص الله به من يشاء من عباده، فإِنْ وافق الشرعَ، كان الشرعُ هو الحجة}[١].

قال إبن حجر: {والذي عليه الجمهور أنه لا يجوز العمل به إلا عند فقد الحجج كلِّها، في باب المباح}[٢]، من ویستم قسەیەكی پوخت و كۆكەرەوەو ڕێك بێنم، ئەوەم كەوتە بەرچاو: (إبن السمعاني) كە (إبن حجر) قسەكەی لێ خواستۆتەوە، دەڵێ:

نكوولّیی كردن لە بوونی یاخود لە ڕەوایی ئیلهام، شتێكی ڕەت كراوەیە، بەڵام جیاكردنەوەی حەق و ناحەق لە بواری ئیلهامدا، ئەوە تەرازووەكەیەتی كە: هەر ئیلهامێك ڕێك دەرچوو بەپێی شەریعەتی موحەممەد[٣] (صلی الله علیه وسلم) ڕێك بوو، لە قورئان و سوننەتیشدا هیچ شتێك دژی نەبوو، ئەوە

---

(١) فتح الباري، ج١٤، ص٤١٨.

(٢) فتح الباري، ج١٤، ص٤١٧.

(٣) من تێبینییم لەسەر ئەو وشەیە هەیە، دەبوو گوتبای: (الشريعة الربانية) چونكە شەریعەت هی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) نیە، شەریعەت خوا ناردوویەتی، وەك دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾ الجاثية، بەڵام سوننەتەكە هی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری خوا بەشێوەی تایبەت، كە ڕێبازەكەیەتی، شەریعەتی بۆ پیادە كردووین، بەهەر حاڵ ئەوە وای گوتوە.

وەردەگیرێ، ئەگەرنا ڕەت دەكرێتەوە، ئنجا كە ڕەت دەكرێتەوە، دەگوترێ: ئەوە قسەی نەفسی خۆیەتی، یاخود خوتخوتەی شەیتانە، {یانی: خۆی بیری كردۆتەوەو خولیایەكی خۆیەتی، یاخود خوتخوتەو دنەدانی شەیتانە}، ئنجا ئێمە نكوولیی لەوە دەكەین كەسێك قسەیەك بگێڕێتەوە بۆ لای دڵی، كە ئەصڵەكەی نەزانرێ، {مەبەستی ئەوەیە نابێ بڵێ: ئەوە قسەی دڵمە، بەو واتایە كە ئیلهامەو فریشتە خستوویانەتە دڵم، دەبێ بزانێ كە ئەوە قسەی نەفسیەتی، یان قسەی شەیتانە، مادام لەگەڵ شەریعەتدا تێك بگیرێ، ئنجا ئەوە قسەیەكی گرنگە كە دوایی لەباسی تەصەووف و صۆفییەكاندا دەیگەینێ و، ئەمە تەرازوویەكی زۆر گرنگە، چونكە شتی وا گوتراوە، بەناوی ئیلهام و كەشفەوە، كە لە قوتووی هیچ عەتارێكدا نیە) ئنجا ئێمە پێمان وانیە كە ئەو ئیلهامە دەبێتە بەڵگەی شەرعیی، بەڵكو ئەمە ڕووناكییەكە، خوا هەركام لە بەندەكانی بیەوێ، پێی دەدا، ئنجا ئەگەر لەگەڵ شەرعدا گونجا، ئەو كاتە شەرع بەڵگەیە، بەڵام ئیلهامەكە بۆخۆی نابێتە بەڵگە، {یانی: ئەو ئیلهامە بۆیە وەردەگرین چونكە لەگەڵ شەرعدا دەگونجێ و، شەرعیش بەڵگەیە}.

دوایی (إبن حجر) دەڵێ: ئەوەی كە زۆربەی زۆری زانایان لەسەرنی، ئەوەیە كە دروست نیە كار بە ئیلهام بكرێ، مەگەر لە كاتێكدا كە هیچ كام لە بەڵگە شەرعییەكان نەبن، ئەویش لە بواری موباحدا (چونكە لەبواری حەڵاڵ و حەرامدا، حەتمەن بەڵگەی شەرعیی هەیە).

لە كۆتایی ئەم باسەدا دەڵێم: ڕۆژئاواییەكان خوریە (إلهام) وشەی (حَدْس) ی بۆ بەكار دەهێنن، بەتایبەتی (برگسۆن)[1] كە لێكۆڵەرەوەو فەیلەسووفێكی بواری دەروونناسیی بووە، زانایەكی فەڕەنسییەو لەو بارەوە كتێبێكی گەورەی هەیە بەناوی (حَدْس) دیارە بە زمانی عەرەبییەو وەرگێڕدراوە، دەڵێ: (حَدْس) بریتیە لەوەی ئینسان سەیری شتێك بكات، بەبێ بیر لێكردنەوە، بەخێرایی نهێنی ئەو شتەی بزانێ، ئنجا ڕەنگە هی وا هەبێ بڵێ: ئەوە هەر تایبەتە بە ئیماندارانەوە، بەڵام نەخێر، مەرج نیە، چونكە خوا عەقڵی داوە بە كافرو

---

(١) هنري برجسون: ١٨٩٥-١٩٤١م، فەیلەسوفێكی فەڕەنسایی یە.

بە مسوڵمان و، ئەو حاڵەتی (حَدْس)ەش، هەم دەگونجێ کافر هەیبێ، هەم دەگونجێ مسوڵمان هەیبێ، بەڵکو زۆر لە زانایان دەڵێن: دۆزینەوە زانستییەکان (الإكتشافات العلمية) زیاتر لە ڕێگەی (حَدْس)ەوە بوون.

ئنجا دەگونجێ فریشتەکان هەندێ شتی دنیایی چاك فێری کافرانیش بکەن، هەروەك چۆن خوا سبحانه و تعالى دەگونجێ دوعای کافریش قەبووڵ بکات، ئایەتەکان بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، چونکە خوا لە دنیادا خوای هەموو لایەکەو، بەزەیی خۆی بۆ هەمووان پەخش کردۆتەوە، بەڵام لە قیامەتدا تایبەتی دەکات بە ئیمانداارانەوە.

گێڕراوەتەوە: جارێك یەکێ لە زانایان، کە پێم وایە (شعبە) بووە، بەلای کۆمەڵێك لە خەڵکی نەصرانییدا تێدەپەڕێ، سڵاوی لێدەکەن، ئەویش دەڵێ: (وعليكم السلام ورحمة الله)، یەکێ لەوانەی لەگەڵێدا بوون دەڵێ: باشە ئەوە سەلامت لێ کردن، قەیناکات، بەڵام ڕەحمەتی خوایان بۆچی بۆدەنێری، ئەوانە کافرن؟ ئەویش دەڵێ: (أَوليس فِي رَحمةِ اللهِ يَعيشون؟) ئەدی ئەوە نیە لەنێو ڕەحمەتی خوادا دەژیین؟.

خوا ناوی لەباران ناوە ڕەحمەت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ.. ﴿٥٧﴾ ﴾ الأعراف.

ڕەحمەتەکەی بارانەو بۆ هەموانیشە، لەشیان ساغ دەکا، ماڵ و منداڵیان پێ دەدا، تەندروستیان دەکات، هەمووی ڕەحمەتی خوایەو لە ڕەحمەتی خوادا دەژین، پێم خۆشە عەقڵ و دڵی خۆمان فراوان بکەین، خوا هەر خوای ئێمە نیە، ئێمە لە سووڕەتی (الفاتحة)دا دەخوێنین: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾، ناڵێین: (الحمدلله رب المسلمين) خوا پەروەردگاری هەموو کەسە و، لە دنیادا خوا مشووری هەموو کەس دەخوا، هەرکەسە بەپێی خۆی، بۆ وێنە: خەونی ڕاست دەگونجێ کافریش خەونی ڕاست ببینێ، کە خەونی ڕاست لە فریشتەوەیە، دەگونجێ پێشانی کافریش بدرێ، (حَدْس)یش بەهەمان شێوە، دەگونجێ مسوڵمان و غەیرە مسوڵمان لێی بەهرەمەند بن، بەڵام مسوڵمانان زیاتر لێی بەهرەمەند دەبن.




## خەون ( الرؤيا )

پێنجەم ڕێگا لە ڕێگایەكانی وەدەست هێنانی زانست، بریتیە لە خەون، كە لە تەفسیرەكەی خۆمدا، لەسەرەتای سووڕەتی (یوسف)دا، باسێكی تێرو تەسەلم لەبارەی خەونەوە كردوە، بەڵام لێرەش دا زۆر بە كورتیی و پوختیی لە پێنج خاڵاندا باسی خەون دەكەین:

### ١- خەون دیاردەیەكی مرۆیی و جیهانییە:

(رؤيا) كە بەكوردیی (خەون)ی پێ دەڵێن، كۆیەكەی (رُؤى)یە، دیاردەیەكی مرۆیی و جیهانییە و، ئەوە پێویست بەبەڵگەی نەقڵیی ناكات لەسەری بێنینەوە، كە هەم دیاردەیەكی جیهانییە، هەم مرۆییە، چونكە عەقڵ و ئەزموون و واقیع بەڵگەینی و، پێویست بەبەڵگەی وەحیی و نەقڵ ناكا.

ئینجا بەپێی ئەزموون و عەقڵ دیارە، سوورەتی (یوسف)یش زۆر بەڕوونیی دەیگەیەنیّ، كە كافرانیش دەگونجیّ خەونیان ڕاست دەربچیّ، بەڵیّ پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمویّ: {أَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حديثاً} أخرجه أحمد برقم (١٠٥٩٨)، ومسلم برقم (٢٢٦٣)، وأبو داود برقم (٥٠١٩)، والترمذي برقم (٢٢٧٠) وقال: حسن صحيح، وأخرجه أيضا: النسائي في الكبرى برقم (١٠٧٤٦)، والدارمي برقم (٢١٤٣)، وابن ماجه برقم (٣٩٠٦). واتە: كامەتان ڕاستبێژتر بیّ، خەونی ڕاستتر دەبینیّ.

بەڵام دەگونجیّ ئینسانی كافریش جار جار خەونی ڕاست ببینیّ، ئنجا ئەوەش بە واقیع دیارەو، خەڵكی كافریش خەون دەگێڕێتەوەو، لێیان گێڕاوەتەوەو، لێیان ڕوو دەدات، بۆ نموونە: لەسوورەتی (یوسف)دا باسی خەونی دوو هاوەڵەكەی (یوسف) دەكا، دەفەرمویّ:

﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرًاۖ وَقَالَ ٱلْأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾ يوسف.

واتە: دوو گەنج لەگەڵی چوونە زیندانەوە، یەكێكیان گوتی: خەونم دەبینی، كە شەڕابم دەگوشی (یانی: ترێم دەگوشی دەمكردە شەڕاب)، ئەوی دیكەش گوتی: خۆمم دەبینی لەسەر سینییەك خواردنم هەڵگرتبوو، باڵندە لێیان دەخوارد، هەواڵمان پیّ بدە، دەربارەی مانای خەونەكەمان، ئێمە تۆ لە چاكەكاران دەبینین.

(یوسف)یش لەوەڵامدا دوای پێشەكییەك دەڵیّ: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسْقِي رَبَّهُۥ خَمْرًاۖ وَأَمَّا ٱلْأٓخَرُ فَيُصْلَبُ فَتَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِن رَّأْسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ ﴿٤١﴾ ﴾ يوسف.

واتە: ئەی دوو هاوەڵە زیندانیەكەم: یەكێكتان شەڕاب دەدا بەگەورەكەی خۆی (واتە: دەگەڕێتەوە، سەر پیشەی خۆی كە مەیگێڕیی بووە)، ئەویدیكەشتان هەڵدەواسریّ و، باڵندە گۆشتی سەری دەخۆن، (واتە: لە سێدارە دەدریّ، هەر واش دەرچوو)، ئەوەی كە لەبارەیەوە پرسیارتان دەكرد، ڕابرد.

كەواتە: هەردووكیان كافر بوون و خەونی ڕاستیشیان بینیوە.

هەروەها لە ئایەتی (٤٣)دا باسی خەونی پادشا دەكات، دەفەرمویٰ: ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾.

واتە: پادشا گوتی: من حەوت ڕەشە وڵاخی قەڵەوم بینین، حەوتی لەڕ دەیانخواردن و، حەوت گوڵە گەنمی سەوزم (یاخود پڕ دان)م دیتن و حەوتی وشك {یان حەوتی لەڕ} ئەو حەوت گوڵە گەنمەیان دەخواردن، ئەی خەڵكی مەجلیس! {یاخود مشورخۆران!} مانای خەونەكەم پێ بڵێن، ئەگەر دەزانن!

دوایی یوسف خەونی پادشا تەعبیر دەكا، خەونەكەشی ڕاست بووەو لەبەر ڕۆشنایی خەونەكەی پادشادا یوسف سەلامی خوای لێبێ، نەخشەیەكی ئابووریی پازدە ساڵیی دادەنێ.

من بەڵگەكەم لەبەر ئەوە هێنایەوە: كە دەگونجێ كافریش خەونی ڕاست ببینێ، بەڵام لێرەدا وێڕای ئەوەی باسكرا، شتێك كە دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە: كە (یوسف) لە وڵاتێكدا بووە، تەنانەت دوو هاوەڵە زیندانییەكەی خۆشی، مسوڵمان نەبوون، یانی: لە وڵاتێكدا بووەو نەخشەیەكی ئابووریی پازدە ساڵیی دادەنێ بۆ وڵاتێك، كە جگە لەخۆی مسوڵمانێكی دیكەی تێدا نیە، جگە لە خۆی ئیماندارێكی تێدا نیە، بە پێی زانیاریی ئێمە، بەڵام نەخشە دادەنێ بۆ ئەو خەڵكە تاكو ئەگەر گرانیی و قات و قڕیی هات، دەرباز ببن و، چاكەیان لەگەڵدا دەكات!

ئنجا ئێمە جاری وا هەیە برایەك، خوشكێك، كە دراوسێیەكی عەلمانیی هەیە، یان نوێژنەكەرە، یان گوناهبارە، پێی وایە نابێ هیچ خێرێكی بۆی هەبێ! بەڵام وانیە ئێمە ئەگەر بۆمان بگونجێ، باچاكەمان هەموو خەڵك بگرێتەوە، (یوسف) سەلامی خوای لێبێ، چاكەیەكی گەورەی كرد لەگەڵ خەڵكی میصردا، كە جگە لە خۆی مسوڵمانێكی دیكەی تێدا نەبوو، وێڕای ئەوەی لەو وڵاتەدا بوختانی بۆ كراوە، زیندانیی كراوە، زوڵمی لێ كراوە!! ئا ئەوە ڕێبازی پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێبێ، دەبێ ئێمە هەوڵ بدەین سوودمان بۆ خەڵك زۆر بێ و لە زەرەرو زیانمان سەلامەت بن.

## ٢- جــۆرەكانی خــەون:

**خەون بە گشتی سێ جۆرە:**

ئەمەش فەرمایشتێكی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیگەیەنێ، كە دەفەرموێ: {وَالرُّؤْيَا ثَلَاثَةٌ: فَرُؤْيَا الصَّالِحَةِ، بُشْرَى مِنْ اللَّهِ، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنْ الشَّيْطَانِ، وَرُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسَهُ} أخرجه أحمد برقم (١٠٥٩٨)، ومسلم برقم (٢٢٦٣)، وأبو داود برقم (٥٠١٩)، والترمذي برقم (٢٢٧٠) وقال: حسن صحيح، وأخرجه أيضا: النسائي في الكبرى برقم (١٠٧٤٦)، والدارمي برقم (٢١٤٣)، وابن ماجه برقم (٣٩٠٦).

واتە: خەون سێ جۆرە:

١- خەونێك كە چاكە، لەخواوەیە.
٢- ئنجاخەونێكی دڵ تەنگكەر، كە لە شەیتانەوەیە.
٣- خەونێك كە پیاو لە حاڵەتی بێدارییدا شتێك بە دڵی دادێ، دوایی لە خەوندا دەیبینێتەوە.

ئنجا زانایان ئەو خەونەی كە لەلایەن خواوەیە، كردوویانە بە دوو بەش، دەڵێن: ئەگەر ڕاستەوخۆ لەلایەن خواوە بێ، ئەوە پێویست بە تەعبییر ناكات، چونكە ڕاست خوای پەروەردگار دەیخاتە بەر چاوت، ڕێك شتەكە دەخاتە بەر چاوت، بەڵام ئەگەر لە فریشتەوە بێ، ئەوە پێویست بە تەعبیر دەكات، چونكە فریشتە ناتوانێ ڕێك بیخاتە بەر چاوت، بەڵكو بە ڕەمز دەیخاتە بەرچاوت، بۆ وێنە: شین بە شایی بێ، ددان كەوتن بە خەڵك لێ مردن دێ، هەروەها...، جاری وایە ڕواڵەتی خەونەكە ناخۆشە، بەڵام لە حەقیقەتدا تەعبیرەكەی زۆر چاكە، ئەگەر لە فریشتەوە بێ، پێویست بە تەعبیر دەكات، ئەگەر لە شەیتانیشەوە بێ، دڵی پێ تەنگ دەبێ و سەغڵەت دەبێ، ئەوە هەمووی لە شەیتانەوەیە، خەونیش هەیە، كە ئینسان لە حاڵەتی بێدارییدا، هەندێ شتی بە خەیاڵدا دێ، دوایی لە خەوندا دەیبینێتەوە.

### ٣- ئەندازەی متمانە كردن بە خەون لە بواری دینداریيدا:

هەم خەون، هەم ئیلهام، لەلایەن ئەهلی تەصەووفەوە بە گشتی - كە ئەهلی تەصەووف هەیانبووە، زۆر پابەند بووە بە قورئان و سوننەتەوەو، لاینەداوە، كە ئەوانەیان كەم بوون، هەشیانە، تێیپەڕاندوە، ئنجا چ لە لایەن ئەوانەوە، چ لەلایەن مسوڵمانانەوە بە گشتی، لە بارەی ئیلهام و خەونەوە، هەم تێپەڕاندن هەیە، هەم كورتهێنان هەیە، هی وا هەیە خەون بەهەند ناگرێ و، هیچ حیسابی بۆ ناكات، هی واش هەیە بە پێچەوانەوە: خەون وەك بەڵگەی شەرعیی تەماشا دەكات، وەك قورئان و سوننەت تەماشای دەكات، كە ئەوەی پێشێیان كورتهێنانەو، ئەوەی دواییشیان تێپەڕاندنە، ئنجا با بزانین زانایان لەوبارەوە چی دەڵێن؟:

(إبن حجر) لەو بارەوە دەڵێ: {ويؤخذ مِمّا تقدَّم التنبيه عليه، أن النائم لو رأى النبـيَّ صلى الله عليه و سلم يأمره بشيءٍ، هل يجب عليه امتثاله ولا بد، أو لا بد أن يَعْرِضَه على الشرع الظاهر، فالثاني هو المعتمد}[1]، دوای ئەوەی چەند قسەیەك دەكات پاشان دەڵێ: لەوە كە ئاگادار كردنەوە لەبارەیەوە تێپەڕی، وەردەگیرێ، كە بابای نوستوو ئەگەر پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بینی: فەرمانی پێكرد بە شتێك، ئایا پێویستە جێبەجێی بكات، یان دەبێ ئەوەی فەرمانی پێكردوە ڕایبنوێنێ لەسەر شەرع و بە تەرازووی شەرع هەڵیسەنگێنێ؟ ئایا كاری پێ بكات، یان پێی نەكات؟ ئەوەی دووەمیان باوەڕ پێكراوە.

واتە: مرۆڤ دەبێ ئەگەر پێغەمبەریشی (صلى الله عليه وسلم) بینی، شتێكی پێ فەرموو، تەماشا بكات، بزانێ داخۆ لە تەرازووی قورئان و سوننەتدا چۆنە؟ چونكە وەحیی تەنیا لە ئیسلامدا بەرجەستەیە، ئیسلامیش لە قورئان و سوننەتدا كورت هەڵاتوە، ئێمە جگە لە قورئان و سوننەت، وەحییەكی دیكەمان لەبەردەستدا نیە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێكدا

---

(١) فتح الباري ج١٤، ص٣١٨.

دەفەرمویێ: {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ، فَهُوَ رَدٌّ} أخرجه البخاري برقم (٢٥٥٠) ومسلم برقم (١٧١٨).

واتە: هەرکەسێ لەم کارەی ئێمەدا (لەم دینداریيەی ئێمەدا) شتێك پەیدا بکات، کە پێی بێگانە بێ (واتە: لێی جیا بێ) ئەوە ڕەت کراوەیە.

هەروەها دەفەرمویێ: {مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ} أخرجه أحمد برقم (٢٥١٧١)، ومسلم برقم (١٧١٨)، وأخرجه أيضا: الدارقطني (٤/٢٢٧). واتە: هەرکەسێ کارێك بکات، فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ، ڕەت کراوەیە.

ئنجا یەکێ بۆی هەیە بپرسێ: ئەدی بۆچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمویێ: {مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي} أخرجه أحمد برقم (١٣٨٧٦) وابن أبي شيبة برقم (٣٠٤٦٠) والبخاري برقم (٦٥٩٣)، والترمذي في الشمائل برقم (٤١٥).

کە بەچەند ڕیوایەتی جۆراو جۆر هاتوە، هەموویان واتاکەیان ئەوەیە کە: هەرکەسێ منی بینی لە خەوندا، ئەوە بەتەئکید با دڵنیابێ: کە منی بینیوە، چونکە شەیتان ناچێتە سەر شێوەی من.؟!

یەکێ بۆی هەیە بڵێ: ئەدی ئەوە نیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وا دەفەرمویێ، چۆن دەڵێی: ئەگەر خەونت بە پێغەمبەریشەوە (صلی الله علیه وسلم) بینی، دەبێ بیخەیە تەرازووی شەریعەتەوە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە دەڵێین: با، ئەوە ڕاستە، بەڵام هەر پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) خۆی فەرمانی پێکردووین کە شوێن شەریعەت بکەوین، بۆ وێنە فەرموویەتی: {تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّهِ} أخرجه مالك برقم (١٣٩٥).

واتە: دوو شتم لەنێودا بەجێهێشتوون، هەتا دەستتان پێیانەوە بێ، گومڕا نابن: کتێبی خواو ڕێبازی پێغەمبەرەکەی.

وە بەر لەپێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم)، خوای پەروەردگار پێمان دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکەن بەڵکو، ڕەحمتان پێ بکرێ.

پاشان ئێمە دڵنیانین، ئەو کەسە تا چ ڕاددەیەك ڕاست دەکا، چونکە هەر کەسێك ڕاست بۆوەو گوتی: بەخزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەیشتم و وای پێ فەرمووم، ناتوانین بڵێین ڕاست دەکات، پاشان ئەگەر ڕاستیشی کردبێ، نازانین داخۆ پێکاویەتی، یان نەیپێکاوە، کە ئایا ئەوەی بینیویەتی، پێغەمبەر بووە، یان نا!!، چونکە جاری وا هەیە بە خزمەتی دەگەی، بەڵام ناڵێ پێغەمبەری خوام، جاری واش هەیە، وا دەفەرموێ: ئنجا ئەگەر فەرمووی: من پێغەمبەری خوام، پێم وانیە شەیتان بتوانێ بەناوی ئەوەوە قسە بکات، بەڵام دەگونجێ تۆ شتێکت بکەوێتە بەرچاوو پێت وابێ پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) هەویش نەبێ، بۆ وێنە: عەبدولقادری گەیلانیی (ڕەحمەتی خوای لێبێ)[1] بۆخۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ: (جارێکیان لە گەرمەی خوا پەرستیی دابووم، ڕۆشناییەکی زۆر گەورە لە ئاسمانەوە هات، گوتی: عەبدولقادر! سەجدە بەرە، من پەروەردگارتم، منیش گوتم: لەعنەتی خوات لێبێ، تۆ ئیبلیسی، دەڵێ: چەند جارێك دووبارەی کردەوە، هەر نەفرینم لێ کرد، ئنجا ئیبلیس پێی گوتم: چۆنت زانی، من ئیبلیسم؟ گوتم: لەبەر ئەوەی خوا لە دنیادا نابینرێ، کە ئەوەم بینی، زانیم فێڵی تۆیە، چونکە خوا نابینرێ لە دنیادا، ئەگەر خوا بە پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك مووسا بڵێ: نامبینی لە دنیادا، چۆن غەیری پێغەمبەران دەبینێ؟! بۆیە زانیم ئەوە فێڵی تۆیە، لە درێژەی بەسەر هاتەکەدا هاتوە کە ئیبلیس گوتوویەتی: چەند کەسم ئاوا هەڵخەڵەتاندوە.

---

(١) (عبدالقدر الجیلانی) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، پیاوێکی زۆر گەورە بووە، ئیبن و تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێ لە (مجموع فتاوی)کەیدا شەرحی هەندێ لە قسەکانی دەکات، بەناوی (فتوح الغیب) هەموو جارێ دەڵێ: (قُدِّس سِرُّهُ)، واتە: ڕووحی پاك بێ و، دەڵێ: کەرامەتەکانی عەبدولقادری گەیلانیی موتەواتیرن.

٤- زانیارییەك كە لەو ڕێگایەوە دەستگیرمان دەبێ، چ لە ڕێی ئیلهام، چ لە ڕێی خەونەوە، بە زانیاریی تایبەتیی و شەخصیی دادەنرێ، جگە لە هی پێغەمبەران علیهم السلام:

هی پێغەمبەران هەم ئیلهامەكەیان، هەم خەونەكەیان، بە وەحیی دادەنرێ، وەك پێشتر هێنامان، كە پێغەمبەر فەرمووی: (روح الأمين) خستیە دڵم، ئەوە دیارە كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پارێزراوە لەوەی شەیتان وەسوەسەی بۆ بكات، ئنجا لێشی تێكەڵ بێ، وابزانێ: ئەوە ئیلهامی فریشتانە!

خەونیشیان هەروا، وەك لە (ابن عباس)وە هاتوە گوتوویەتی: {إِنَّ رُؤْيَا الْأَنْبِيَاءِ وَحْيٌ} أخرجه البخاري برقم: (٨٢١). واتە: خەونی پێغەمبەران وەحییە.

ئنجا بەڵگەشمان ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الصافات)ە، ئایەتەكانی (١٠٢-١٠٧) كە خوا سبحانه و تعالى دەربارەی ئیبراهیم، كاتێ فەرمانی پێ دەكات ئیسماعیلی كوڕی سەلامی خوایان لێبێ، سەربڕێ، دەفەرمووێ:

﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الصافات.

واتە: كاتێ (ئیسماعیل) بوو بە وەرگێڕكە {وای لێهات كە ئیش و كاری لەگەڵدا بكات، كە لەو كاتەدا كوڕ یان كچ، زۆر خۆشەویستە، دەبێتە وەرگێڕكە بۆ دایك و بابی و هاوكارییان دەكات} گوتی: ئەی ڕۆڵەم! من لەخەودا بینیم كە تۆم سەردەبڕی، ئنجا سەرنج بدە! بزانە داخۆ دەڵێی چی؟ ئەویش گوتی: ئەی بابە! ئەوەی كە فەرمانت پێ كراوە، ئەنجامی بدە، ئەگەر خوا بیەوێ لە

خۆڕاگران دەبم، ئنجا كاتێ ملكەچ بوون (واتە: هاتنە سەر جێبەجێ كردنی) لەپەو ڕوو خستی {نێوچەوانی خستە زەوی، بۆ ئەوەی لە پشتەملیدا سەری ببڕێ}، بانگمان كرد: ئەی ئیبراهیم! خەونەكەت هێنایە دی (هێناتە سەر جێبەجێ كردن) ئێمە ئاوا پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە، ئەوە تاقیكردنەوەیەكی زۆر ڕوون بوو و (ئاژەڵێك) سەربڕاوێكی مەزنمان كردە قەرەبووی.

دەربارەی ئەم ئایەتانە (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) ئاوا مانای (أَسْلَمَا) دەكات:

{(فَلَمَّا أَسْلَمَا) أي: إبراهيم وابنه إسماعيل، جازِماً بقتل ابنه وثمرة فؤاده، امتثالاً لأمر ربه، وخوفاً من عقابه، والإبن قد وطَّن نَفْسَه على الصبر، وهانت عليه في طاعة ربه، ورضا والده}.

واتە: ئیبراهیم و كوڕەكەی ئیسماعیل، كە ئیبراهیم عەزمی جەزم كرد كوڕەكەی خۆی بكوژێ (سەری بڕێ)، كە جگەر گۆشەیەتی، بۆ جێبەجێ كردنی فەرمانی پەروەردگاری و لە ترسی سزای خوا، كوڕەكەش دڵی خۆی لەسەر ئەوە چەسپاند كە خۆڕاگربێ و نەفسی خۆی پێ هیچ نەبوو، وەك ملكەچیی بۆ پەروەردگاری و، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی بابی.

لە تەفسیری ئەوەشدا كە دەفەرموێ: (وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ) {أي: تَلَّ إبراهيمُ إسماعيلَ على جبينه، لِيُضْجِعَهُ فَيَذْبَحَهُ} واتە: ئیبراهیم ئیسماعیلی لەپەوڕوو خست، تاكو پاڵیبخاو سەری بڕێ.

هەروەها لە تەفسیری ئەوەدا كە دەفەرموێ: (وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ) دەڵێ: {أي: قد فَعَلْتَ ما أُمِرْتَ به، فإنّك وَطَّنْت نَفسك على ذلك، وَفَعَلْت كُلَّ سَبَبٍ، وَلَم يَبْقَ إلاّ إمرارُ السِّكِّينِ عَلى حَلْقِه}[1]، واتە: تۆ ئەوەی كە فەرمانت پێكرابوو ئەنجامت داو دڵی خۆت لەسەر ئەوە چەسپاندو، هەموو شتێكت كرد بەس ئەوە مابوو چەقۆی پێدا بێنی، (بەڵكو هەندێ دەڵێن: چەقۆشی پێدا هێنا، بەڵام نەیبڕی).

---

(١) تیسیر الكریم الرحمن، ص ٧٠٦.

هەڵبەتە هەموو تەفسیرەكانی دیكەش هەروای دێنن، ئەمەم بۆیە بۆ هێنان، چونكە هەندێ خەڵك بەداخەوە كە نەشارەزاییی لە قورئان هەیە، نە شارەزاییی لە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەیە، لە پێش ئەوەشدا من پێم وایە هەر لە ڕووحی دین و شەریعەت حاڵی نەبووە، باسی ئەوەیان كردوە، كە ئەوە هەر لە شێوەی نواندن و سیناریۆیەكدا بووە، كە ئەوە شتێكی زۆر نەزانانەو نەفامانەیە، چونكە خوا كە مەدحی ئیبراهیم دەكاو دەفەرموێ: (إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ) -١٠٥-. ئێمە ئاوا پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە. دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾﴾ ئەوە تاقیكردنەوەیەكی ئاشكرا بوو، سەربڕاوێكی مەزنمان كردە بەلاگێڕی. ئنجا ئەگەر ئەمە هەر نواندن بووبێ و ئیبراهیم زانیبێتی ئەوە سیناریۆیەو، كوڕەكەی سەرنابڕێ، چ ئازایەتییەكی تێدایە؟! هەموومان دەتوانین وا لە كوڕی خۆمان بكەین، بەڵام خوا كە مەدحی دەكا، دیارە مەسەلەكە جیددیی بووەو نواندن نەبووە، كەسێك هەر تۆزێ شارەزای زمانی عەرەبی بێ و، سەرنجی ئایەتەكان بدات، ئەوە زۆر زۆر ڕوونە، پێویست بە تەفسیرەكانیش ناكات.

٥- دەگونجێ نامسوڵمانانیش خەونی ڕاست ببینن:

پێشتریش ئاماژەم پێدا كە دەگونجێ مرۆڤی نامسوڵمانیش **یەكەم:** لە ئەنجامی ڕاهێنان و مەشقی ڕووحییەوە، شتی یاسا دڕ (خارق العادة) ببینێ و لەسەر دەست پەیدا بێ، كە زانیاریی پەنهانیی یەكێكیانە، یاخود بەشێكیەتی، بەڵام دیارە لە سنوورێكی دیاریی كراودا.

**دووەم:** هەروەك دەگونجێ ئینسانی كافر خەونی ڕاست ببینێ و نموونەشمان هێنایەوە.

ئنجا ڕەنگە یەكێك بڵێ: وەك چی؟! دەڵێین: ئەوانەی كە جومناستیك، یاخود كاراتێ، یاخود كۆنفۆو جۆدۆ، دەكەن، جووڵەی زۆر سەرسوڕهێنەر ئەنجام دەدەن، بەتایبەتی هەندێ جۆرە وەرزش ئێستا لە وڵاتانی ڕۆژئاوا پەیدا بووە: یەكێك بە ڕووحی موجازەفەو موغامەرە، لەوبان باز دەدا بۆ ئەو بان، یاخود بەو بینا بەرزانە هەڵدەگەڕێ، وەك جاڵجاڵۆكە.

هەروەها هیندۆسەكان شتی زۆر سەیر دەكەن، كە مەرج نیە ئەوە هەمووی جادوو بێ، لەبەر چاوی تۆ دەیكاو جادوو نیە، ئنجا ئایا ئەوە چۆنە؟! ڕاستییەكەی هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ مەشق و ڕاهێنان، مەشق و ڕاهێنانی جەستەیی، بۆ ئەو شتانەی كە جەستەیین، یاخود مەشق و ڕاهێنانی دەروونیی، بۆ ئەو شتانەی كە پەیوەندییان بە لایەنی دەروونییەوە هەیە، بەچاوی خۆم بینیم كابرایەكی سیخ یان هیندۆس، لەوانەی كە مەشقی ڕووحیی دەكەن، ئاسنی تواوە كە لە پلەیەكی گەرمیی زۆر بەرزدا قاڵكرابۆوە، بە مەندوونەیەك خستیانە نێو دەمی، ئارەقەی كرد، پلێتێكی ئاسن دانرابوو، ئاسنە تواوەكەی بەینێك لە زاریدا جووڵاند، دوایی ڕۆیكردە[1] سەر پلێتەكە، ئەوەندە گەرم بوو

---

(١) ڕۆیكرد: لەزاریەوە ڕژاندی.

پلێتەکەی کون کرد!!، کە تەفسیرەکەی هەر ئەوەیە: وەك گوتم: مرۆڤ زۆر شتی لە توانادا هەیە، لە کاتێکدا کە کار لەسەر خۆی دەکا، ئنجا کافر بێ یان مسوڵمان بێ، هەروەها ئەوانەی کە جادوو دەکەن، مەرج نیە هەمووی پەیوەندیی بە لایەنی هونەرییەوە هەبێ، بەڵێ، تەڕ دەستییش هەیە، کە (شَعْوَذة)ی پێ دەڵێن، بەڵام هەشە هەر جادوویەو پەیوەندیی بە چاو هەڵخەڵەتاندنی خەڵکەوە هەیە، کە ئەوەش زانستەو هەیە، هەڵبەتە شەیتانەکانیش بەتەئکید دەوریان لە جادوودا هەیە، بەڵام هەندێ لەو حاڵەتە ڕووحیی و نەفسییانە، مەرج نیە ئەوان دەوریان تێیدا هەبێ.

با لەو بارەوە نموونەیەکی سوننەتیش بێنینەوە: (إبن صیاد) هەبووە لە مەدینە، شتی پەنهانی دەزانی، ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە عومەریشی لەگەڵدا بوو، خوا لێی ڕازی بێ، چوو گوێی بۆ هەڵخست، لەکاتێك دا لەبەر خۆیەوە قسەی دەکردن، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) خۆی لە دارخورمایەکان گرتبوو، دایکیشی بانگی کرد گوتی: ئەوە پێغەمبەری عەرەبەکانە گوێی بۆ گرتووی ئاگات لێی بێ، دوایی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆی لێ ئاشکرا کردو چوو بۆ لای، پێی فەرموو: {إِنِّي قَدْ خَبَّأْتُ لَكَ خَبِيئَةً} واتە: شتێکم بۆ پەنهان کردووی لە دڵی خۆمدا، پێم بڵێ: چییە؟ دیارە (إبن صیاد) بانگەشەی ئەوەی کردوە کە غەیب دەزانێ، (إبن صیاد) گوتی: (د.خ)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: {اخْسَأْ فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ} واتە: وازبێنە لە ئەندازەی خۆت بەولاوە ناچی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕستەی {يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ} یان وشەی (دخان)ی بۆ لە دڵی خۆ گرتبوو[١]، ئەو نیوەی زانی.

کە بەدڵنیاییەوە لەو کارەی دا شەیتانەکان هاوکاری بوون، ئنجا هەیە لە ڕێگای شەیتانەکانەوە، هەیە لە ڕێی ئامادەکردنی ڕووحیی خۆیەوە، ئەو

---

(١) بەم شێوەیە هاتوە، کە ئەمە بەشێکی بەسەر هاتەکەیە: {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي قَدْ خَبَّأْتُ لَكَ خَبِيئَةً، وَخَبَأَ لَهُ {يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ} قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: هُوَ الدُّخُّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إخْسَأْ فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ} أخرجه مسلم برقم: (٢٩٣٠).

حاڵەتەی دەبێ و، هەندێ کەسیش بێ ئەوەی کار لەسەر خۆی بکا، ئەو حاڵەتەی هەیە، بەڵام ئەوانە حاڵەتی دەگمەنن، گرنگ ئەوەیە ئەو شتانە کە دەبن، پەیوەندییان بە ڕووحی مرۆڤەوە هەیە، پەیوەندییان بە ئیمان و کوفرەوە نیە، مرۆڤیش کافر بێ، یان مسوڵمان، ڕووحی هەیە، هەروەك چۆن ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە جەستەوە هەیە، کافرێك کە مەشق بە جەستەکەی دەکا، ئەوەی بەو دەکرێ، بە مسوڵمانەکە ناکرێ، هەروەها ئەوان بەبارە خراپەکەیدا، کار لەسەر ڕووحی خۆیان دەکەن، بۆیە هەندێ شتی نامۆ دەتوانن ئەنجام بدەن، بۆیەش ئەوەم باس کرد، کە ئەگەر شتێکی واتان بینی، ئیمانتان نەلەقێ، ئەوە پەیوەندیی بە ڕووحەوە هەیەو، پەیوەندیی بە ئیمان و کوفرەوە نیە.




## گرنگیی و پێویستیی
## بیرکردنەوەی ئیسلامیی[1]

---

(١) دیارە لەسەرەتادا ئەوەم بۆ ڕوون کردنەوە، کە من {بیری ئیسلامیی} یان {هزری ئیسلامیی} بەکار ناهێنم، بەڵکو لەجیاتی ئەوە، {بیرکردنەوەی ئیسلامیی} بەکار دەهێنم، ڕوونیشم کردەوە لەبەرچی.

## دەستپێك

**خوێنەرانی بەڕێز!**

ئایا ئێمەی مسوڵمان پێویستە بیر بكەینەوە؟ واتە: دەربارەی دین و ژین، عەقڵمان بەكار بهێنین؟ واتە: بیركردنەوە بۆ تێگەیشتنی قورئان و سوننەت و شەریعەت، بۆ ناسینی دروستكراوەكانی خواو پەیبردن بە نهێنییەكانیان و، شارەزا بوون بە واقیع و دەورو بەرمان، ئایا بیركردنەوە پێویستەو گرنگە، یاخود پێویست ناكات و پەكمان لەسەری نەكەوتوە؟ لەم بەشەی چوارەم دا باسی ئەوە دەكەم، كە بەڵێ، بیركردنەوە و ڕامان نەك هەر پێویستە، بەڵكو زۆر زۆریش پێویستە، وە زۆر گرنگە كە ئێمە عەقڵی خۆمان بكار بهێنین، هەم لە دینداریيداو، هەم لە دنیادارییدا، هەم بیر بكەینەوە لە وەحیی و، هەم بیر بكەینەوە لە واقیع، هەروەها بیر بكەینەوە لە دروستكراوەكانی خوا، ئەوە فەرزێكە خوا فەرزی كردوەو بەبێ ئەوە، ئێمە ناتوانین نە لە دین تێبگەین، نە پێشیەوە پابەند بین یانی: ئەوە هیچ بەبێ بیر كردنەوە، ناتوانین لە وەحیی تێبگەین، وێڕای ئەوەش: ناتوانین پێشیەوە پابەند بین. بۆ ئیسپاتی ئەوەش یازدە (١١) بەڵگەمان هێناونەوە:

بەڵگەی یەكەم: خوا بیر كردنەوەی لەسەرمان پێویست كردوە:

لەو بارەوەش ئایەتەكانی قورئان زۆرن، بۆ نموونە:

١)- لەسوورەتی (الروم) ئایەتی (٨)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ئایا بیریان نەكردۆتەوە لەبەر خۆیانەوە تێڕانەماون: خوا ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە، بەحەق نەبێ دروستی نەكردوون، بۆ كاتێكی دیاریی كراو! بەڵام زۆرێك لە خەڵكی بە دیداری پەروەردگاریان بێ بڕوان.

لێرە خوا سبحانە وتعالی وەك نكووڵیی لێ كردن و سەركۆنە كردن و سەرزەنشت كردن، دەربارەی كافران، دەفەرموێ: بۆچی لەبەر خۆیانەوە بیریان نەكردۆتەوە، كەخوا ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی نێوانیانی بەحەق نەبێ، دروستی نەكردوون!!

٢)- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتەكانی (٢١٩-٢٢٠)دا، دەفەرموێ: ﴿ .. كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۗ .. ﴿٢٢٠﴾ ﴾ البقرة.

واتە: بەو جۆرە خوا ئایەتەكانی خۆیتان بۆ ڕوون دەكاتەوە، تاكو بیر لە دنیاو دوا ڕۆژ بكەنەوە.

كەواتە: هەم دنیا بیركردنەوەی پێویستەو هەم دواڕۆژیش، دنیا كە تێیدای، دەبێ بیری لێ بكەیەوەو بزانی، كە چۆن تێیدا بژی و بەڕێوە بچی؟ دوا ڕۆژیش دەبێ بیری لێ بكەیەوە، چۆن بەرەو ڕووی بچی، چۆنی خۆتی بۆ ئامادە دەكەی؟

٣)- لە سوورەتی (الرعد) ئایەتی (٣)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الرعد.

واتە: خوا ئەو كەسەیە كە زەوی درێژو پان كردوەو ڕاخستوە و، چیایە چەسپاوەكانی تێدا داناون و، ڕووبارەكانی تێدا داناون و، لە هەموو میوەیەك جووتێكی دروست كردوە، بە شەوگار ڕۆژگار دادەپۆشیّ، بێگومان لەوانەدا كەباس كران، نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك بیر بكەنەوە.

یانی: ئەوەی كە بیر نەكاتەوە، هیچ نابینیّ، خوێنەران! ئێوە سەرتان سوڕ نەمێنیّ، كە دەبیستن: كەسانێك لە پزیشكەكان، كە لە خەڵكی دیكە زیاتر دەزانن خوا جەستەی مرۆڤی چۆن دروست كردوە؟ هەروەها گەردووناس، ڕووەكناس، دەروونزان، كە دەبینن كەسانێك لەوانە بیّ بڕوان، پێتان سەیر نەبیّ، چونكە سەرنجدانی دروستكراوەكانی خوا، ئەگەر ئیمانیان لە پشتەوە نەبیّ، وەك نیشانەی خوا نایانبینیّ، بەڵكو وەك دروستكراوێكی بیّ ئامانج و، وەك حیكایەتێكی بیّ سەرەنجام دەیانبینیّ، ئەوە ئیمانە وات لیّ دەكات، دەستی خوا ببینی لە شتەكاندا، ئەوە ئیمانە وات لیّ دەكات سیفەتەكانی خوا، لە دروستكراوەكانی خوادا بە درەوشاوەیی ببینی، بۆیە خوا دەفەرمویّ: (إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ) لەوەدا نیشانە هەن بۆ كۆمەڵێك بیر بكەنەوە، ئنجا كە بیریش دەكەنەوە، دیارە بە ئیمانەوە بیر دەكەنەوە، بۆیە با ئیشكالتان بۆ دروست نەبیّ، بڵێن: زۆر كەس بیر دەكاتەوە، بەڵام ئەو دروستكراوانەی خوا، وەك نیشانەی خوا نابینیّ! ئاخر لەبەر ئەوەی ئیمانی نیە، لە ڕاستییدا بەهۆی ئیمانەوە، بیر كردنەوەی ئینسان، ئینسان دەگەیەنێتە خواناسیی.

٤)- لە سوورەتی (الحشر) ئایەتی (٢١)دا، خوا دەفەرمویّ: ﴿ ... وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الحشر.

واتە: ئەو وێنانە بۆ خەڵكی دەهێنینەوە، تاكو بیر بكەنەوە (سیاقەكەش هەمووی لەبارەی مێژووەوەیە).

كەواتە: هەم دەبێ بیر لە بوونەوەر بكەینەوە، هەم لە ئایەتەكانی خوا، واتە: هەم بیر بكەینەوە لە ئایەتە بینراوەكان، هەم ئایەتە خوێنراوەكان، هەروەها بیر بكەینەوە لە دەستی خوا لە ژیانی بەشەردا، كەواتە: بیر كردنەوە پێویستەو دەبێ:

١)- بیر لە مێژوو بكەینەوە.

٢)- بیر لە بوونەوەرو دەورو بەری خۆمان بكەینەوە.

٣)- بیر لە ئایەتەكانی خوا بكەینەوە، واتە: ئەو نیشانانەی خوای پەروەردگار كە لە گەردووندا دایناون.

٤)- هەروەها بیر لە خۆشمان بكەینەوە.

بەڵگەی دووەم: عەقڵ کاکڵ و جەوهەری مرۆڤەو بەبێ بیر کردنەوەش، مرۆڤ پەکی عەقڵەکەی دەخات و، سەرەنجام: وەك توێکڵی بێ کاکڵ دەمێنێتەوە:

لەو بارەوەش بە هێنانەوەی دوو ئایەت وەك نموونە وازدێنین:

١- خوا سبحانه و تعالی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بێگومان لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و جێگۆڕکە {یاخود جیاوازیی، یاخود بەدوای یەکدا داهاتن، وَٱخْتِلَٰفِ ) هەرسێکیان دەگرێتەوە}ی شەو ڕۆژان، نیشانە هەن بۆ خاوەن کاکڵەکان.

(ٱلْأَلْبَٰبِ )یش کۆی (لُبّ)ە، واتە: کاکڵ، ئایا خوا بۆچی ناوی لە عەقڵ ناوە (لُبّ)؟ لەبەر ئەوەی عەقڵ کاکڵی مرۆڤەو، مرۆڤ بە عەقڵ لە ئاژەڵ و درووستکراوەکانی دیکە جیا دەبێتەوە.

(الجرجاني) دەڵێ: {اللُّب هو: العقل المنوَّرُ بنور القدس الصافي عن قشور الأوهام والتخيُّلات}[1]، واتە: (لُب) بریتیە لەو عەقڵەی کە ڕۆشن بۆتەوە، بە نووری پاك (واتە: نوری ئیمان) کە صافە لە توێکڵی وەهم و خەیاڵەکان.

٢- هەر لەو بارەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ... فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ المائدة.

واتە: پارێز لە خوا بکەن، ئەی خاوەن عەقڵان! بەڵکو سەرفراز بن.

کەواتە: کێ چاك دەتوانێ پارێز لەخوا بکات؟ بابای خاوەن عەقڵ.

---

(١) التعريفات، ص ١٨٨

بەڵگەی سێیەم: عەقڵ بناغەی ئەركدارییە (العقل مناط التكليف):

بەڵگەیەكی دیكە لەسەر ئەوە كە بیر كردنەوە، هەم گرنگەو هەم پێویستە لە ئیسلامدا، ئەوەیە كە: عەقڵ بناغەی ئەركدارییە، (العقل مَناطُ التَّكليف) پێچەوانەی (عەقڵ)یش شێتییە، زۆر جار كە دەگوترێ: (عقل) و (نقل) ئەوە بە ئیعتیبارێك ڕاستە و لەبەرانبەر عەقڵدا، وەحیی هەیەو، لەبەرانبەر عەقڵدا، نەقڵ هەیە، بەڵام لە ڕاستییدا وەك پێچەوانە: پێچەوانەی عەقڵ، بریتییە لە شێتیی (جنون)، بۆیە زانایان گوتوویانە: (العقل مَناطُ التَّكليف)، یانی: عەقڵ ئەو شتەیە كە تەكلیفی شەرعیی پێ هەڵدەواسرێ، پێوەی پەیوەست دەبێ، كەسێ عەقڵی نەبێ، تەكلیفی شەرعیی ڕووی تێ ناكات.

ئنجا هەر بۆخۆشیی ئەوەتان بۆ باس دەكەم: جارێك نامیلكەیەكیان بۆ هێنام، لەسەر بەندەیان نووسیبوو، هەندێ خەڵكی مەشرەب سەلەفیی، ناوونیشانەكەی، قسەیەكی من بوو نیشانەیەكی سەرسوڕمان (!)یان لەسەر دانابوو، كە من گوتوومە: {مرۆڤ پێویستە عەقڵی خۆی بەكار بێنێ بۆ دینداریی} یان تەعبیرێكی لەو شێوەیە بوو، گوتبوویان: ئەو قسە عەجایبە، قسەی موعتەزیلەیە، منیش گوتم: سەرسوڕمانەكەی ئەوان، مایەی سەر سوڕمانە، چونكە دینداریی هەر بە عەقڵ دەكرێ، خۆ بەبێ عەقڵیی ناكرێ، ئەدی نابێ عەقڵی خۆت بەكار بێنی؟ ئنجا ئەوەی كە گوتوومە: هەر ئایەتە، خوای زاناو توانا دەفەرموێ:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ۝٤٤﴾

النحل.

واتە: (ذكر)مان بۆلای تۆ ناردۆتە خوار، تاكو ئەوەی بۆ خەڵك دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بكەیەوە، واتە: {چۆنیەتی جێبەجێ كردنی ئەو (ذكر)ە} هەروەها بۆ ئەوەی خۆشیان بیر بكەنەوە.

یانی: ڕوون كردنەوەی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەتەنیا كافی نیە بۆ ئەوەی دینداریی بكەین، بەڵكو دەبێ خۆشمان بیر بكەینەوە، بەدەقی ئایەت.

ئنجا با لەو بارەوەش چەند دەقێكی شەریعەت بێنینەوە:

١- لە سووڕەتی (الطور) ئایەتی (٣٢)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَمۡ تَأۡمُرُهُمۡ أَحۡلَٰمُهُم بِهَٰذَآۚ أَمۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ٣٢﴾.

واتە: ئایا عەقڵیان فەرمانیان بەوە پێ دەكات، یاخود خۆیان كۆمەڵێكی یاخیین؟

دیارە لێرەدا (أَحلام) كۆی (حلُم)ە، یان كۆی (حِلم)ە، دەڵێ: (الحِلم الأَناةُ وضَبْطُ النَّفس والعقل، والجمع أحلام) واتە: (حِلم) بە هێدیی و مەندیی و خۆ كۆنترۆڵ كردن دەگوترێ، هەروەها (حِلْم) بە عەقڵیش دەگوترێ، كە كۆیەكەی (أحلام)ە، واتە: عەقڵەكان.

لێرەدا خوا سبحانە وتعالی، بەراورد دەكات لەنێوان كەسانێكدا كە عەقڵیان فەرمانیان پێ دەكات و كەسانێك كە یاخیی دەبن، كەواتە: ئەو كەسانە پەسندن لە لای خوا، كە فەرمانبەری عەقڵیانن، واتە: بە قسەی عەقڵیان دەكەن، نەك یاخیی دەبن، ئنجا كە ئینسان یاخیی دەبێ، مانای وایە لە قسەی عەقڵی خۆشی دەردەچێ، ئەمەش زۆر ڕێزگرتنی تێدایە بۆ عەقڵ، یانی: ئەگەر بە قسەی عەقڵیان كردبایە، ملكەچی نەقڵ دەبوون.

٢)- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو بارەوە كە ئینسان تاكو عەقڵی نەبێ و عەقڵی كارا نەبێ، ئەركی شەرعیی ڕووی تێ ناكات، دەفەرموێ: {رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنْ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنْ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ، وَعَنْ الصَّبِيِّ حَتَّى يَكْبُرَ} أخرجه أحمد برقم (٢٥١٥٧)، وأبو داود برقم (٤٣٩٨)، والنسائي برقم (٣٤٣٢)، وابن ماجه برقم (٢٠٤١)، والحاكم برقم (٢٣٥٠) وقال: صحيح على شرط مسلم، وأخرجه أيضا: الدارمي برقم (٢٢٩٦)، وابن حبان برقم (١٤٢)، قال الألباني صحيح في الإرواء برقم (٢٩٧)، وقال شعيب الأرنؤوط : حسن لغيره.

واتە: قەڵەم لەسەر سێ كەسان هەڵگیراوە: (واتە: قەڵەمی گوناح نووسین)

١ـ نوستوو تاكو بەخەبەر دێ و

٢ـ شێت (یاخود بێهۆش) تاكو چاك دەبێتەوەو،

٣ـ منداڵ تاكو گەورە دەبێت.

٣)- هەروەها خوا سبحانە و تعالى دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بَلَغَ الْأَطْفَالُ مِنكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ..(٥٩)﴾ النور.

واتە: هەركات منداڵەكان گەیشتنە ڕاددەی باڵغ بوون، با مۆڵەت وەربگرن (كاتێك دێنە ژوورەكانتانەوە) وەك چۆن ئەوانەی پێش ئەوان (واتە: گەورەكان) مۆڵەت وەردەگرن.

كەواتە: عەقڵ بناغەی ئەرك پێ سپێرانە (العقل مناط التكليف) ئنجا ئەو عەقڵەش بەكەڵك دێ، كە خاوەنەكەی بەكاری بهێنێ، بیر بكاتەوەو سەرنج بداو ڕامێنێ، ئەگەرنا عەقڵ كە بەكار نەهێنرێ، وەك پارەیەك وایە كە خەرج نەكرێ، وەك چەكێك وایە كە خاوەنەكەی بەكاری نەهێنێ!.

بەڵگەی چوارەم: بەبێ بەكارهێنانی عەقڵ لە وەحیی تێناگەین:

لەو بارەوەش دوو ئایەت وەك نموونە، بەبەڵگە دێنینەوە:

١- پێشتریش ئەو ئایەتەمان هێنا، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

واتە: زیكرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاكو ئەوەی بۆ لای خەڵك دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بكەیەوە و، بەڵكو خۆشیان بیر بكەنەوە.

٢- هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئاوا خوا ئایەتەكانی خۆیتان بۆ ڕوون دەكاتەوە، بەڵكو بفامن (تێبگەن).

بەڵگەی پێنجەم: بەبێ بیركردنەوە،
ناتوانین وەحیی دابەزێنینە سەر واقیع:

وەحیی خوا تاكو تێی نەگەی، ناتوانی دایبەزێنیە سەر واقیع، بەڵێ بیر كردنەوە پێویستە، هەم بۆ تێگەیشتنی نەقڵ و وەحیی، هەم بۆ چۆنیەتی دابەزاندنی، بۆ سەر ئەرزی واقیع و پڕاكتیزە كردنی، یانی: هەر ئەوەندە كە تێی دەگەی، بەس نیە، بەڵكو چۆنی دادەبەزێنی، كام ئایەتەی چ كاتێك؟ كام حوكمەی لە كوێدا؟ ئەوە هەمووی عەقڵ دەوری تێدا دەبینێ.

## بەڵگەی شەشەم: وەحیی بەردەوام دەبەخشێ، بەڵام بەرهەمی فیكر سنووردارە:

بەڵێ، كەلەپوور (تراث) و كۆشش (إجتهاد) سنووردارە، سنووردارە بەو كات و شوێنەوە، بەو ژینگەو بارودۆخەوە كە تێیدا بەرهەم هاتوە، بۆیە پێویستە عەقڵ بەردەوام لە تێوەڕامانی وەحییدا سەرگەرم بێ، چونكە پرسیاری تازە، وەڵامی تازەی دەوێ، نەخۆشیی تازە، پێویستی بە چارەسەری تازە دەكا! بەڕاستیی براو خوشكانی بەڕێز! ئێستا دەردی هەرە گەورەی مسوڵمانان ئەوەیە كە پێش ئەوەی لە ژین بەجێ بمێنن، لە دین بەجێماون، ئێمە ئێستا لەجیاتی ئەوەی كە مەحكوومی دینی خوا بین و، مەحكوومی وەحیی بین، مەحكوومی فیكری مردووانین، لەپێش ئێمەدا زانایان و پێشەوایان ڕەحمەتی خوایان لێبێ و خوا پاداشتیان بداتەوە، ئیجتیهادیان كردوە، بیریان كردۆتەوە، تەماشای قوڕئان و سوننەتیان كردوە، بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەكانی ڕۆژگاری خۆیان، ئێمە ئێستا، جیهانی ئیسلامیی بە گشتی، هەموو ئەو دەرمانانەی كە وەختی خۆی گیراونەتەوە، ئەو وەڵامانەی كە وەختی خۆی دراونەتەوە، دەیانهێنین بۆ دەردو نەخۆشیەكان و پرسیارەكانی ڕۆژگاری خۆمان بەكاریان دێنین!

زۆر جار ئەو وێنەیەم هێناوەتە بەرچاوی خۆم: تۆ ئێستا مرۆڤێكی هەر هی دوو سەد (٢٠٠) ساڵ لەمەو پێش، بەبەرگ و پۆشاكی ئەوكاتەوە، بێنە بەر نیگات، تەماشا دەكەی زۆر عەجایبە!! ئنجا بەرهەمی بیركردنەوەكەشیان هەر وایە، تۆ ئێستا یەكێ لەو زاناو ئیمامە گەورانەی كە وەختی خۆی لەسەردەمی سەلەفی صاڵحدا ژیاون، بیهێنە بۆ ئێرە، هەر سەری سوڕ دەمێنێ، تەیارە دەبینێ و، سەیارە دەبینێ و، ئینترنێت و ...هتد، سەری سوڕ دەمێنێ، چونكە بەخەونیش شتی وای نەبینیوە، ئنجا ئایا دەگونجێ بیر كردنەوەی ئەو، تێگەیشتنی ئەو، لەو شتانەدا كە بواری ڕاو بۆچوونیان تێدایە (قسە لە عەقیدەو

عیبادەت و حەڵاڵ و حەرام ناكەم، كە ئەوانە نەگۆڕن) قسە لەو شتانە دەكەم كە دەگۆڕرێن، وەك: دەوڵەتداریی و حوكمڕانیی، ئابووریی، كۆمەڵایەتیی، جەنگ و ئاشتیی، پەیوەندییەكان، كەل و پەلەكانی ژیانی ڕۆژانە، ئایا دەگونجێ بەبیری هەزار (١٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر، ژیانی ئێستا ڕێك بخەی؟ نەخێر، دەجا ئێستا ئەو ئوممەتە گەورەیەی ئیسلام، هەر هەمووی مەحكوومی ئەو بیر كردنەوە پێشووانەیە، كە ئەمە وەك ئەوەیە بە تیرو كەوانی (١٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، بتەوێ لەبەرامبەر چەكی پێشكەوتووی ئەمڕۆدا بوەستی، كە بەتەئكید شەڕێكی دۆڕاوە! بێگومان زۆر جار بیركردنەوەكانیش وەك تیرو كەوانەكە وان!.

با لێرە شتێكی خۆشتان بۆ باس بكەم، مامۆستایەكی بەڕێزمان بۆی گێڕامەوە گوتی: لەگەڵ ژمارەیەك لە مامۆستایانی خۆمان خوا پلەیان بەرز بكاو بیانبووری: جارێك چووین بۆ وڵاتێك، چوون بۆ شوێنێكی گشتی كە پەیامنێرو كامێرای لێبوون، بەردەوام هەر وێنەیان دەگرتین، یەكێ لە مامۆستایەكان گوتی: دیارە زۆریان پێ گرنگین، ئەوەندە وێنەمان دەگرن! منیش گوتم: ناوەڵڵا مامۆستا پێیان وایە لە مۆزەخانە هاتووینەوە، گوتی: ئێمە بەرگی مەلایەتییمان لەبەردا بوو، وڵاتەكەش ئەو جۆرە بەرگەی لێ نەبوو! گەلێك جاران زۆر خەفەت دەخۆم، هەندێ كەس بەناوی دینەوە، بەناوی ئیسلامەوە دەماری لاملی خۆی هەڵدەستێنێ و خۆی تووڕە دەكات دەڵێ: ئێمە هەر دەبێ بەپێی ڕای سەلەفی صالح لە قورئان و سوننەت تێبگەین! ڕاستە ئێمە هەر دەبێ بەپێی بەرنامە (منهج)ی سەلەفی صالح لە قورئان و سوننەت تێبگەین، بەڵام بیرو ڕاو ئیجتیهادەكانی[1] سەلەفی صالح، هێندێكیان بەكەڵكی سەد (١٠٠) ساڵ دوای خۆیان نەهاتوون، ئایا ئیبن و تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێبێ، موسنەدی ئیمام ئەحمەدی لەبەر دەست دانەبوو كە چل هەزار (٤٠٠٠٠) فەرموودەی تێدایە؟ ئەدی بۆچی خۆشیی (مجموع الفتاوى)یەكی لە دوای خۆی جێهێشتوە، سی

---

(١) لە بەڵگەی یازدەیەم دا، تیشكی زیاتر دەخەینە سەر جیاوازیی نێوان: بەرنامە (منهج)ی سەلەفی صالح و بیرو ڕاو بۆچوونەكانیان، كە یەكەمیان تا ڕاددەیەكی زۆر چەسپاو (ثابت) و دووەمیان زۆر گۆڕاو (متغیر)ە.

و پێنج (٣٥) بەرگە؟ لەبەر ئەوەی لە ڕۆژگاری ئەودا كۆمەڵێ شت هاتوونە پێش، لە ڕووی فیكریی و سیاسیی و ئابووریی و ...هتدەوە، كە جیا بوون لە هی سەردەمی ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێبێ، ئیمام ئەحمەد لە سەدەی (٣)ی كۆچییدا ژیاوە، بەڵام ئیبن و تەیمیە لە سەدەی (٧و٨)ی كۆچییدا ژیاوە، كە ڕۆژگارو شوێن و نەریت و فیكرو دنیاو سیاسەت گۆڕاوە، دەبێ جۆری تێگەیشتنی تۆش بۆ وەحیی بگۆڕێ و تازەی بكەیەوە.

ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كە دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ، مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا} أخرجه البيهقي في المعرفة برقم (٤٢٢) عن أبي هريرة، وأخرجه أيضا: أبو داود برقم (٤٢٩١)، والطبراني في الأوسط برقم (٦٥٢٧)، والحاكم برقم (٨٥٩٢)، والخطيب (٦١/٢ ، ترجمة ٤٥٤)، والديلمي برقم (٥٣٢)، قال المناوي: (٢٨٢/٢): قال الزين العراقي وغيره: سنده صحيح، قال الألباني صحيح، السلسلة الصحيحة، برقم ٥٩٩.

واتە: خوا بۆ ئەم ئۆممەتە لەسەری هەر سەد (١٠٠)ساڵێك، كەسێكی بۆ دەرەخسێنێ كە دینەكەی بۆ تازە بكاتەوە.

دین تازە كردنەوە، چییە؟ ئایا قورئانی تازە دێ؟ نەخێر، هەر ئەو قورئانەیە، سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر ئەو سوننەتەیە، كەواتە: تازە كردنەوەی ئایین، یانی: تازە كردنەوەی تێگەیشتنی دین، هەڵبەتە لێرەوە دیسان مەبەستم بیر كردنەوەی چەوتی ئەوانە نیە كە لە بەرانبەر ڕۆژئاواو سیكۆلاریزم دا بەزیون و، ئاو دەكەنە ئاشگێڕی تەوژمی عەلمانیی یەوەو، خۆیان دۆڕاندوە لەبەرانبەر فیكر فەرهەنگی ڕۆژئاواداو، دەیانەوێ مل بە قورئان و سوننەت بسووڕێنن و، لەگەڵ هەواو ئارەزووی خەڵكدا بیگونجێنن، بەڵام مەبەستم ئەوەیە كە ئێمەش باوەك هەروەك ئیمامەكانی خۆمان ڕەحمەتی خوایان لێبێ، بكەین، بۆ وێنە: شافیعی لە بەغدا بووە، مەزهەبی كۆنی هەیە، دەچێتە میصر ئەو هەموو مەزهەبەی خۆی، ئەوەی كە بواری ئیجتیهادو بۆچوونە، چاوی بە هەموویدا گێڕاوەتەوە، هەندێ دەڵێن: جگە لە چوار مەسەلە، ئەوی دیكە هەمووی چاوی پێدا گێڕاوەتەوە، بۆیە زانایان دەڵێن: كەسێ بەدوای

شافیعی بكەوێ، دەبێ بەدوای قسەی تازە (القول الجدید)ی بكەوێ، كە چۆتە میصرٍ، بارو دۆخ و هەل و مەرج و ژینگەكە گۆڕاوە، عادەت و نەریتێكی دیكە بووە و، خۆشی زانستی زیادی كردووەو ئەزموونی زیادی كردوە، چاوی بە بابەتەكاندا گێڕاوەتەوە.

ئنجا لەنێوان بەغداو میصردا ماوەیەكی چەند كیلۆمەترییە، لە دەرفەتێكی زەمەنیی چەند ساڵییدا، چونكە (شافعي) لە (١٥٠)ك لەدایك بووەو لە (٢٠٤) ك وەفاتی كردوە، (٥٤)ساڵ ژیاوە، ئنجا كە بەغدای جێهێشتوە، تەمەنێكی هەبووە لەبەر ئەوەی موجتەهید بووە، كەچی دەبینین لەنێوان ئەو دوو شارو وڵاتەو، لەماوەی ئەوەندە ساڵەدا، مەزهەبەكەی خۆی گۆڕیوە، كەچی تۆ ئێستا بێنی، بەو مەزهەبەی ئەوەوە یان هی ئیمامێكی دیكەوە، موو بە موو پابەند بی و، دوای زیاتر لە هەزار ساڵ، هەر خۆت بە قسەكانی ئەوەوە ببەستیەوەو پابەند بكەی، پێشت وابێ بێدینیی دەكەی، ئەگەر خۆشت بیر بكەیەوەو عەقڵی خۆت بەكار بخەی! ئاخر چۆن لە هەموو ڕووێكی دنیاداریی و دینداریییەوە، بەجێ نامێنی؟ ئنجا دواییش خەڵك وا دەزانێ خەتای دینەكەتە! شایانی باسیشە كە (سیوطي) كتێبێكی هەیە لەسەر فەرز بوونی ئیجتیهاد، بەرپەرچی ئەو كەسە دەداتەوە كە نازانێ ئیجتیهاد كردن لە هەموو سەردەمێكدا پێویستە، بە ناوو نیشانی: (الردُّ على من أَخْلَد إلى الأرض وجهِلَ أن الإجتهاد في عصرٍ فرض) ئیجتیهاد یانی: دووبارە تەماشا كردنەوەی قورئان و سوننەت، لەو بوارانەدا كە گۆڕانیان بەسەردا دێ، ئیمان و عەقیدە، وەك لە كتێبەكەی خۆم: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا باسم كردوە، ئەصڵەن نابێ بڵێی: عەقیدەی سەلەفیی و خەلەفیی و ئەشعەریی و ماتوریدیی و چی و چی، ئیمان و عەقیدە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییە، بەتایبەت هی كەس نیە، بەڵكو هی هەموو لایەكەو لەلایەن خوای بەرزو مەزنەوە دانراوەو، لەلایەن پێغەمبەرەكەیەوە، ڕاگەیەنراوە، عیبادەت بە هەمان شێوە، هەر عیبادەتە، بەڵام كە دێینە سەر مەسەلەی حوكم و سیاسەت و ئابووریی و كۆمەڵایەتی و ...هتد، ئەوە پێویستیی بە كۆششی تازەو بیركردنەوەی تازە دەكات.

بەڵگەی حەوتەم: ژیانی بەشەر لە گۆڕانی بەردەوام دایەو، زانست و فیکری بەشەر بەردەوام گەشە دەکات، بۆیە بەبێ بیرکردنەوەو بەکار هێنانی عەقڵ، دینمان لە ژینمان بەجێ دەمێنێ:

لێرەدا قسەیەکی زۆر جوانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەهێنم کە دەڵێ: {تَجِدُّ للنّاس أقضية بِقَدَر ما تَجِدُّ لهم من القضايا} یانی: بۆ خەڵك حوکم و فەتوای تازە پەیدا دەبن، بە ئەندازەی ئەوە کە کێشەی تازەیان بۆ پەیدا دەبن، هەر مەسەلەیەکی تازەیان بۆ بێتە پێش، پێویست بە چارەسەرێکی تازە دەکات، بۆیە زۆر جار لە وتارەکانمدا گوتووومە: چارەسەرە کۆنەکان بە کەڵکی کێشە تازەکان نایەن، وەڵامە کۆنەکان بە کەڵکی پرسیارە تازەکان نایەن، پێشتریش ئەو فەرموودەیەمان هێنا کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

{إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ، مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا}[١].

کە بەتەئکید مەبەست پێی تازە کردنەوەی بیرکردنەوەیە لە دیندا، واتە: دووبارە سەرنج دانەوەی ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت، بۆ ئەوەی بزانین چۆنیان دابەزێنین بۆ سەر ئەو واقیعەی خۆمان، خوێنەرە بەڕێزەکان! هەندێ کەس پشتی بەوە نەهێشاوە داخۆ دین لە کوێیەو، ژین لە کوێیە؟ بۆخۆی دانیشتوە لە شوێنێکداو هەر فەتوا دەدا: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، وا مەچن و وا مەکەن! تۆ بێنە بزانە چۆنم بۆ دەخەیە قاڵبی ژیانەوە، چۆن بۆم دادەبەزێنیە سەر واقیعی ژیان، ئەوە گرنگە، ئەرکی زانایان ئەوەبووە کە دینیان بەرجەستە کردوە لەسەر ئەرزی واقیع، ئەمما بێی لە گۆشەیەك دابنیشی و، هێندێ خەڵك لەخۆت بئاڵێنی و، بەکەیفی خۆت فەتوا بدەی و، هیچ کاریگەریی نەبێ لەسەر ژیانی خەڵك، ئەوە هیچ نیە، تۆ وەرە ژیانی

---

(١) پێشتر تەخریج کراوە.

خەڵكم بۆ بگۆڕە، وەرە ژیانی خەڵكم بۆ بهێنەوە سەر سكەی شەریعەت، ئەوە ئازایەتییە، ئەوە گرنگە، ئەوە پێویستی بە بیر كردنەوەو ڕامان و ئیجتیهادی عەقڵ دەكات، ئەگەرنا هەر ئایەت و فەرموودەكان بە وشكیی بخوێنیەوە، بۆ كۆمەڵە خەڵكێكی وەك خۆت داخراوو دابڕاوو لە پەڕاوێزی كۆمەڵگادا ژیاو، ئەوە بە هەموو كەس دەكرێ! بەڵام ئەوە گرنگە چۆن ئەو دینە بكەیەوە كاڵای باڵای ئەو ژینە، ئەوە پێویستی بە بیر كردنەوەو ئیجتیهاد دەكات، ئەو زانایانەی كە بیریان كردۆتەوەو بەرهەمیان بۆ خستووینە ڕوو، ئەوانە غەمیان ئەوە بووە دین بكەنەوە كاڵای باڵای ژین، ئەو ژینە بەپێی ئەو دینە بەڕێوە بچێ.

بەڵگەی هەشتەم: بەبێ ڕامان و بیر كردنەوەو ورد بوونەوە، لە بوونەوەر، نهێنییەكانی بوون و یاساكانی خوا نادۆزینەوە:

با دوو ئایەتیش لەو بارەوە بە نموونە بهێنینەوە:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ .. ﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەتە موڵكی فراوانی ئاسمانەكان و زەوی و، هەر شتێ كە خوا دروستی كردوە؟

دەبێ وردبیەوەو سەرنج بدەی، ئەگەرنا یاسایەكانی خوا چۆن كەشف دەكەی؟ ئەو ڕۆژئاواییانەی ئێستا یاساكانی خوایان كەشف كردوون لەبوارەكانی پزیشكیی، گەردوونناسیی، زەویناسیی، فیزیا، كیمیا، بەچی هەیمەنەیان كردوە بەسەر دنیادا؟ بەوە كە یاسایەكانی خوایان دۆزیونەوە، یانی: ئەوەی كە خوا فەرمانی پێكردوە: سەرنج بدەن! ئەوان بەسەر خۆیاندا جێبەجێیان كرد، سەرەنجام توانیان ژیانی دنیا بخەنە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە، نەك هەر دنیای خۆیان، دنیای ئێمەش.

٢- هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ .. ﴿٢٠﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: بڵێ: بەزەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن! بزانن چۆن (خوا) دروستكراوەكانی هێناونە دی.

بەڵگەی نۆیەم: مسوڵمانان تەنیا ئەو کاتە لە گەشەی هەمەلایەنە دابوون، کە بەرهەمی فیکرییان هەبوو و، شتی تازەیان لە دین و ژیندا دەزانی:

بەڵێ چاخی زێڕینی ئیسلامیی ئەو کاتە بوو کە مسوڵمانان کارلێکیان دەکرد لەگەڵ فەلسەفەو فیکرو شارەزاییەکانی دیکەی دەورو بەریاندا، شتی زیادەیان بۆ بەشەر بەرهەم دەهێنا، بەڵام دوایی کە عەقڵی خۆیان پەکخست، لەسەدەی چوارەمی کۆچییەوەو گوتیان: دەرگای ئیجتیهاد داخراوە، چەند عەجایب! دەرگایەك خوا بیکاتەوە، بە بەندان چۆن دادەخرێ؟ بۆیە زانایانی دیکە پەیدا بوون و گوتیان: دەرگای ئیجتیهاد کەس داینەخستوەو هەر بە ئاوەڵایی ماوەتەوە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە دەرگای ئیجتیهاد داخستن نەبوو، دەرگای عەقڵ داخستن بوو، کە دەرگای عەقڵیشت داخست، ناتوانی کارلێك بکەی لەگەڵ ئەو واقیعەی کە تێیدا دەژی و، ناتوانی تێگەیشتنی تازە کە لەگەڵ واقیع و بەرژەوەندیی تۆدا دەگونجێ، لە قورئان و سوننەت دەربهێنی.

بەڵگەی دەیەم: خوای کاربزان لەزۆر شوێنان سەرزەنشتی کافرانی کردوە، لەسەر شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینانیان و، عەقڵی خۆ داخستنیان:

بۆ نموونە:

١- خوا دەفەرمویێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ١٧٠﴾ البقرة.

واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: بەدوای ئەوە بکەون کە خوا ناردوویەتە خوار، دەڵێن: (واتە: کافرەکان دەڵێن): بەدوای ئەوە دەکەوین کە باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە، ئەدی ئەگەر باب و باپیرانیان هیچ شتێکیان نەزانیبێ {هەر دەبێ بەدوایان بکەون}؟

٢- هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسۡبُنَا مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ١٠٤﴾ المائدة.

واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: (واتە: بە کافرەکان) وەرن بۆ ئەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، دەڵێن: ئەوەمان بەسە کە باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە، ئایا ئەگەر باب و باپیرانیان نەیانزانیبێ {هەر بەدوایان دەکەون}؟!

ئنجا ئەوەی کە خوا سەرزەنشتی کافرانی پێکردوە، ئێستا مسوڵمانان وان، ناچن ئەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، دووبارە سەیری بکەنەوە و، ناچن بۆ سوننەتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بزانن چی دەفەرمویێ، بەڵکو هەر بەدوای ئەوانەی پێشێ کەوتوون، وەك ئەوان لەجیاتی ئێمە بیریان کردبێتەوە، هەڵبەتە لێرەدا نامەوێ زەمی زانایان و پێشەوایان بکەم، ئەوان بەڕاستیی

لەسەردەمی خۆیاندا، دینداریەکی باشیان کردوە، تەماشای قورئان و سوننەتیان کردوە، لە ژیانی خۆیاندا چی پێویست بووە، لە شەریعەت دەریان هێناوە، بەڵام زەمی خۆمان دەکەم، کە بۆچی ئێمەش وەك ئەوان ناکەین؟ دەبوو ئێمەش شوێن ئەوان بکەوین، واتە: قسەکانی ئەوان دووبارە نەکەینەوە، بەڵکو هەمان شێوەی ئەوان، چییان کردوە، ئێمەش ئاوا بکەین، چونکە وەك لە سوننەت دا هاتووە: کاتێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) موعاذی کوڕی جەبەل دەنێرێ بۆ یەمەن، دەفەرموێ: ئەگەر کێشەیەکت هاتە پێش، چۆنی چارەسەر دەکەی؟ گوتی: تەماشای کتێبی خوا دەکەم، گوتی: ئەگەر لەوێدا نەتبینی؟ گوتی: تەماشای سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکەم، گوتی: ئەگەر لەوێشدا نەتبینی؟ گوتی: عەقڵی خۆم بەکار دێنم و کەمتەرخەمیی ناکەم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەستی لە سینگی داو فەرمووی: {الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّهِ لِمَا يُرْضِي رَسُولَ اللَّهِ}، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە نوێنەری پێغەمبەری خوای ڕێنمایی کردوە، بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ڕازی دەکات.

ئێمە دەبێ شوێن ئەو میتۆدو بەرنامەیان بکەوین، کە بە گوێرەی ئەوە ئیجتیهادیان کردوەو بیریان کردۆتەوە، نەك ئەو ئیجتیهادو بۆچوونەی کە بۆخۆیان سوودی هەبووە، بەڵام لەوانەیە هەر دوای پەنجا (٥٠)ساڵ بەکار نەهاتبێ، وەك نموونەی مەزهەبی شافیعیی کە پێشتر هێنامانەوە، هەروەها ئەبو حەنیفە جاری وا هەبوو فەتوایەکی دەدا، بۆ بەیانی بەبازاڕی کووفەدا دەگەڕا، یاخود جاڕچی ڕادەسپاردن جاڕ بدەن، دەیانگوت: دوێنێ ئەبو حەنیفە فەتوایەکی ئاوای داوە، بەڵام ئەمڕۆ بۆی بەدەرکەوتوە ئەم ڕایە باشترە، یان ئەوەی دوێنێ هەڵە بووە و ئێستا ئاوا دەڵێ.

جارێك پێشەوا عومەر خوا لێی ڕازی بێ، بڕیارێکی دا، دوای ساڵێك بڕیارێکی دیکەی دا گوتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران! پێشتر وات دەگوت، گوتی: ئەو کاتە وامان پێ چاك بوو، ئێستاکەش ئاوامان پێ چاکە، جاری واهەیە ڕۆژگارەکە دەگۆڕێ، بۆ وێنە مەسەلەی نرخ لەسەر دانان، پێغەمبەری

خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {نرخ لەسەر شت دامەنێن، خوا نرخ دانەرە}، کەچی لەسەردەمی عومەردا خوا لێی ڕازی بێ نرخی لەسەر شت دانا، هۆکارەکەیشی ئەوەبوو کە ئەوکاتە بازرگانەکان ئەمین و ڕاستگۆ بوون و، نرخی پڕ بەپێستیان بۆ شتەکان دادەناو، پێویستی بەوە نەبوو نرخی بۆ دابنێن، بەڵام دوایی خەڵك نائەمین بووە و بەزیادە فرۆشتوویانە[١].

٣- خوای پەروەردگار هەر لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ٢٣﴾ الزخرف.

واتە: هەروا بەو شێوەیە لەپێش تۆدا لە هیچ ئاوەدانییەکدا، هیچ وورياكەرەوەیەکمان نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێبازێك بینیوەو، هەر بەدوای شوێنپێی ئەوانیش دەکەوین.

کەواتە: خوا سەرزەنشتی کافران دەکات کە بۆچی بەدوای پێشینانتان دەکەون، دەبێ خۆتان عەقڵی خۆتان بەکار بهێنن، کەچی ئەم دەردە ئێستا تووشی مسوڵمانان بووە، بۆیەش ئێستا حاڵمان بەم شێوەیە.



---

(١) لە تەوەرەی پێنجەمدا وردتر باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

بەڵگەی یازدەیەم و کۆتایی: شوێن کەوتنی پێشینی چاك (السلف الصالح) یانی شوێنکەوتنی بەرنامەو میتۆدەکەیان لە تێگەیشتنی ئاییندا، نەك شوێنکەوتنی سەرجەم بیرو ڕاکانیان:

ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، زۆربەی ئەوانەی باسی شوێنکەوتنی سەلەفی صالح دەکەن، لێی تێنەگەیشتوون، وا دەزانن حەسەنی بەصرایی چ فەتوایەکی داوە، ئیبن و سیرین چی گوتوە؟ دوای ئەوان ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی و ئەحمەدو ئەوانی دیکە ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ، چییان گوتوە؟ دەبێ تۆش هەمان شت بڵێیەوە!! (القرافي) کتێبێکی هەیە بە ناوو نیشانی: (الإحكام في تمييز الفتاوى من الأحكام، وتصرفات القاضي والإمام) کتێبێکی زۆر نایابە، لەشوێنێکدا دەڵێ: (هەموو ئەو حوکمە شەرعییانەی کە بینا کراون لەسەر نەریت و عورفێك، وەختێك نەریت و عورفەکە دەگۆڕێ، حوکمە شەرعییەکەش دەگۆڕێ، ئەگەرنا مانەوەی حوکمە شەرعییەکە، لەگەڵ گۆڕانی عورفەکە، ئەوە نەزانینە لە دینداریدا و بێئاگاییە)[1]، قسەیەکی زۆر جوانە: حوکمێکی شەرعیی کە بنیات نراوە لەسەر عورفێك، لەبەر ئەوەی عورف وایەو عادەت وایە، ئەو حوکمە شەرعییە، یان ئەو فەتوایە، بەو شێوەیە، دوایی کە عورفەکە دەگۆڕێ، ئۆتۆماتیکی دەبێ حوکمەکە یاخود فەتوایەکەش بگۆڕێ، وەك لەمەسەلەی نرخ دانان (تسعير)دا باسمان کرد، یان مەسەلەی دڵ ڕاگیراوان (مؤلفة القلوب) ئەوانەی کە مسوڵمان نین، یاخود تازە مسوڵمان بوون، کە بەشێکن لەوانەی کە زەکاتیان پێ دەدرێ، لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێیان دەدرا، لەسەردەمی ئەبو بەکریشدا خوا لێی ڕازی بێ، پێیان دەدرا، لەسەردەمی عومەردا، خوا لێی ڕازی بێ لەدەرگاکەی کۆبوونەوە، ئەویش گوتی: چیتان دەوێ؟ گوتیان: ئێمە دڵ ڕاگیراوانین، بۆ

---

(١) لە تەوەری پێنجەمدا دەقی قسەکەی (القرافي) بەتەواویی دێنین.

وەرگرتنی زەكات هاتووین، دیارە سالآنە پێیان دراوە، پێشەوا عومەر گوتی: هیچتان پێنادەم، لەبەر ئەوەی ئێستا ئیسلام دەسەلآت و دەولەتی خۆی هەیەو پێویستی بە دڵ ڕاگرتنی ئێوە نیە، ئنجا شیعە كە هەر بۆخۆیان لە بەرامبە عومەردا خوا لێی ڕازی بێ، قین لە دڵن، دەڵێن: عومەر ئایەتی پەككستوەو (تعطيل) كردوە، بەلآم وانیەو عومەر زۆر عاقڵ و زۆر داناو زانا بووە، زانیویەتی زەمینەی جێبەجێ كردنی ئەو حوكمە شەرعییە، ئێستا لەبار نیە، ئایەتەكەی پەك نەخستوەو هەر لەجێی خۆیەتی و، ئەگەر هەمان هەل و مەرج دووبارە بۆوە، با جێبەجێ ببێتەوە، بەلآم گوتوویەتی ئێستا بەسەر ئێوەدا جێبەجێ نابێ.

یان مەسەلەی بڕینی دەستی دز، كە عومەر خوا لێی ڕازی بێ لە ساڵی گرانیی (عام المجاعة)دا ڕایگرت، ئایەتی پەك نەخست، بەلآم گوتی: دەستی دز كاتێ دەبڕێ، كە خەڵك ناچار نەبێ دزیی بكا، بەلآم ئێستا خەڵك زۆربەی برسییە، لەبەر ئەوە ناگونجێ ئەو سزا شەرعییە لە ئێستادا جێبەجێ بكرێ.

كەواتە: زۆر گرنگە ئێمە بزانین: شوێن كەوتنی پێشینی چاك واتە: شوێنكەوتنی ئەو بەرنامەو میتۆدەی كە ئیشیان لەسەر كردوە، بەلآم ڕایەكانیان، نەخێر، دیارە هێندێكی بەكەڵك دێ، بەلآم مەرج نیە هەمووی بەكەڵك بێ، ئەوەی كەپەیوەندیی بەلایەنی ماددیی ژیان و، عورف و عادەت و ئەو شتانەوەیە كە دەگۆڕێن، دەبێ فەتوای دیكەو بۆچوونی دیكە بێنین، زانایانیش هەر وایان كردوە: كاتی خۆی مەزهەبی ئەبو حەنیفە هەبووە، ئەدی بۆچی دوایی مەزهەبی مالیكیش پەیدا بووە، دوای ئەو بۆچی مەزهەبی شافیعیی پەیدا بووە، بۆچی دوایی مەزهەبی ئەحمەدیش پەیدا بووە؟ چونكە هەل و مەرج و ژینگەكانیان جیا جیا بوون، ڕایان جیاجیا بوو، و تێگەیشتنیان بۆ ئایەتەكان و دەقەكانی سوننەت، جۆراو جۆر بوون، بۆیەش هەر كامێكیان بۆخۆی كۆششی كردەوەو هەوڵی داوە بۆخۆی لەدین تێ بگات، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {خَيْرٌ قَالَ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ} أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٣٢٤٠٧)، وأحمد برقم (٤١٣٠)، والبخاري برقم (٢٥٠٩)، ومسلم برقم (٢٥٣٣)، والترمذي برقم (٣٨٥٩)

وقال: حسن صحيح، وابن ماجه برقم (٢٣٦٢)، وأخرجه أيضا: النسائي في الكبرى برقم (٦٠٣١)، وأبو يعلى برقم (٥١٠٣)، وابن حبان برقم (٧٢٢٢)، والبيهقي برقم (١٩٦٩٦)، والطبراني برقم (١٠٣٣٨).

واتە: باشترین سەدە (خەڵك)، سەدەكەی منن، دوایی ئەوانەی دوای وان، دوایی ئەوانەی دوای وان، {بۆ زانیاریتان! زانایان وشەی (قرن)یان لێرەدا بە حەفتا (٧٠) ساڵ لێكداوەتەوە، نەك بە سەد (١٠٠) ساڵ، بۆیە دەڵێن: ٧٠+٧٠+٧٠= ٢١٠، واتە: (٢١٠)ی كۆچیی، ئەوە سنووری جیاكەرەوەی ئەو سێ سەدەیەیە، هەندێكیشیان بە سەد (١٠٠)یان لێك داوەتەوە گوتوویانە: تاكو سێسەد (٣٠٠)ی كۆچیی، بەڵام ئەوەی دیكە، زیاتر زانایان لەسەرنی.

كەواتە: كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: باشترین جیل، جیلەكەی منن، ئنجا هی دوای وان، ئنجا هی دوای وان، یانی: {(أصحاب) و (تابعین) و (تابعي التابعین)}، ئنجا دەفەرموێ: دوایی كەسانێ دێن كە یەكێكیان شاهێدیی دەدا، شاهێدییەكەی پێش سوێندەكەی دەكەوێتەوە و، سوێندەكەی پێش شاهێدییەكەی دەكەوێتەوە، واتە: هەر لەخۆڕا شاهێدیی دەداو، هەر لە خۆڕا سوێند دەخوا، بێ ئەوەی لێی بكۆڵێتەوە.

**لە كۆتـاییدا دەڵێـم:**

بێگومان بۆ هێنانەوەی ئیسلام بۆ كایەكانی ژیان، پێویستییمان بەوە هەیە زۆر عەقڵی خۆمان هەڵگوشین و بەكاری بهێنین و، دووبارە تەماشای قورئان و سوننەت بكەینەوە، لەگەڵ ڕێزو حورمەتی زۆرو تەواومان بۆ كەلەپوورو بەرهەمی زانایان، بەڵام ئەوان بۆ ڕۆژگاری خۆیان، تەماشای قورئان و سوننەتیان كردوە، بۆ چارەسەری كێشەكانی خۆیان، كە زۆر جیا بوون لە كێشەكانی سەردەمی ئێمە، من ئێستا زۆر بەزەییم بە هەندێ كەسدا دێتەوە: بازاڕ گەرم دەكات و پەنا دەباتە بەر بە هەڵكۆڵینی مێژوو بۆ دەرهێنانی هەندێ مەسەلەی وەك: قورئان مەخلووقە یان مەخلووق نیە؟ خوای پەروەردگار دەبینرێ، یان نابینرێ؟ هەروەها هەندێ لە سیفەتی خەبەریی خوا .. كە كاتی خۆی ئەو كێشەو مشت

و مرانە بوون، ئێستاش قەیناکات بایی پێویست قسەیان لێ بکەین، بەڵام ئێستا ئێمە کێشەمان لەگەڵ کەسانێکدا هەیە کە ناڵێن: خوا لە قیامەت دەبینرێ، یان نابینرێ؟ بەڵکو هەر بڕوایان بەخوا نیە، ئێستا کێشەمان لەگەڵ ئەوانەدا نیە کە دەڵێن: قورئان مەخلووقە یان مەخلووق نییە، بەڵکو کێشەمان لەگەڵ کەسانێکدایە کە هەر بڕوایان بەوە نیە قورئان خوا ناردوویەتی! بۆیە دەبێ بزانین ئێمە لە چ ڕۆژگارێکداین و، بەپێی ڕۆژگاری خۆمان لەگەڵ کێشەکانی خۆماندا دەستەو یەخە بین، بەڵام ئەوەی وەك حوشتر مەل سەر لە لمدا نوقم دەکاو، دەچێ لە ڕابردوودا بەدوای کێشاندا دەگەڕێ و، لە کێشەکانی ئێستای ڕادەکا، یاخود تەسلیمی دەسەڵاتداران و حوکمڕانانێك دەبێ، کە لە شەریعەت لایانداوە و، هەموو شتێکیان بۆ پینەو پەڕۆ دەکا، کەچی ڕۆژانە بەهانە دەگرێ بە مسوڵمانانێك کە دەیانەوێ دینی خوا بهێننەوە مەیدانی ژیان، ئەوە دەبێ دوعای هیدایەتیان بۆ بکەین کە خوا ئیصلاحیان بکاو هیدایەتیان بدا، چونکە بەو شێوەیە دینداریی ناکرێ و پێشینی چاکیشمان بەو شێوەیە نەبوون، بگرە پێچەوانەی ئەوەبوون.

# بەرهەمەكانی دانەر

## أ - كتێبە كوردییەكان :

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | قـورئـان و سـوننـەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤ چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {كۆی هەردووك كتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكەم: سووڕەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سووڕەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سووڕەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سووڕەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سووڕەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سووڕەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سووڕەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١١ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٢ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی** | | |
| ١٣ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٤ | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٥ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٦ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ١٧ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ١٨ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ١٩ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٢٠ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢١ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی٫ قەزاو قەدەر | | |
| ٢٣ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٤ | ڕێبـازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم كامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو كتێبی (مسـوڵمانی كامڵ: بەشی یەكەم: بیروباوەڕی مسـوڵـمان) |
| ٢٥ | سـوڵمانی كـامڵ : بەشی یەكـەم : بیـروباوەڕی مسـوڵـمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو كتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٢٦ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی) و، ئەوەی دیكەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ٢٧ | ڕوونكردنەوەی بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٢٨ | تەرجەمەی كوردیی عەقیدەی طــەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٢٩ | ڕوونكردنەوەی عەقیدەی طەحــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٠ | سیكۆلاریزم و دیموكراسیی لەئەزموونی كوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | فیقهـی ئیســلامیی | | |
| | مەوسـووعەی: خواپەرسـتیی ئیســـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣١ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاك٫ خاوێنیی | | |
| ٣٢ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین درووشمی خواپەرستیی | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٣ | بەرگی سێیەم: زەكات و ماڵ بەخشین | | |
| ٣٤ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| ٣٥ | بنچینە گرنگەكانی هەڵسەكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٣٦ | جەژن و یادو بۆنەكان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٣٧ | چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە كراوە |
| ٣٨ | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | **تەزكیەی نەفس و ڕەوشت و ئاكار** | | |
| ٣٩ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٠ | ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزكیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٤١ | مزگەوتەكانی كوردستان لەنێوان ئاوەدانكردنەوەو وێرانكردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٤٢ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخانء وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانكاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٤٣ | شەهید كێیەو چ پلەوپایەیەكی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٤٤ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٥ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٤٦ | مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| بانگەوازو كـاری ئیسـلامیی | | | |
| ٤٧ | كۆمەڵـی خـوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٤٨ | پێشمەرگەی ئیسـلام، یان مسـوڵمانی موجاهید كێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٤٩ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٠ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٥١ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٥٢ | چەند ڕێڕوونییـەك بۆ ئیسـلامییەكانی كوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٥٣ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەكی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەكان و بنچینە ئەخلاقی یەكان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٥٤ | ئیسـلام و كێشـە هەنووكەیی یەكـان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٥ | زانایانی ئیسـلام كێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عـەرەبی |
| ٥٦ | كۆمەڵی ئیسـلامیی: ئامانج و هەڵوێسـتەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٥٧ | چۆن هەڵسـوكەوت لەگـەڵ خەڵـكی دا بكـەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عـەرەبی |
| ٥٨ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٥٩ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سـەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٠ | بۆئەوەی لەسـەر جیهادكردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦١ | جیهـاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێ و چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٢ | چەند ڕێـڕوونییـەك بۆ خوشـك و برایانمان لە هەنـدەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٣ | ئیسـلام و مسـوڵمانەتیی و كاری ئیسـلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٦٤ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٦٥ | بەشدارییكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەكەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز كراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەكەم: بەڵگەكانی ئەوانەی بەشداریكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەكانی ڕەوایی بەشداریكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٦٦ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەرگیرانەكانی ڕێكخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٦٧ | با لادان و تاوانی پەرگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٦٨ | پەرگیریی: پێناسەی، نیشانەكانی پەرگیران، هۆكارەكانی پەرگیریی، شوێنەوارو دەرهاوێشتەكانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی** | | |
| ٦٩ | ئاڵقەی یەكەم: بەڵگە شەرعیجیەكانی بنیاتنانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٠ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوكمی لادانی خەلیفەو كاربەدەستانی مسوڵمان لەكاتی لاریی و ستەمكارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧١ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێكی شەرعی یانەو ژیرانەی فەتوانامەكەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | **وتاری كۆنگرەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان** | | |
| ٧٢ | كارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری كۆنگرەی یەكەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٧٣ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیكریی، سیاسیی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان (وتاری كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٧٤ | چاوپێداگێڕانەوەیەكی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەكییمان (وتاری كۆنگرەی سێیەمی كۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **نەتەوایەتیی و مەسەلەی كورد** | | |
| ٧٥ | كوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٧٦ | حوكمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٧٧ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٧٨ | چارەسەری كێشەی كورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | **سیاسەت و حوكمڕانیی** | | |
| ٧٩ | چەند بابەتێكی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨٠ | بەرگی یەكەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەكانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیكریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨١ | بەرگی دووەم: بنەمایەكانی سیستمی حوكمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٨٢ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەكان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێكردن<br>دادوەریی | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨٣ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٨٤ | ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| | ئافرەت و خێزان | | |
| ٨٥ | ئافرەتی مسوڵمانی كورد، مافە شەرعییەكانی و ئەركە گرنگەكانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٨٦ | مەوسووعەی : ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەكەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | مێژوو | | |
| ٨٧ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەكانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٨٨ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەكانم)، بەشی یەكەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨٩ | بەركوڵێكی كاروچالاكیی و ڕووداو و وێستگەكانی ژیانم | چاپی یەكەم/٢٠١٨ | |
| | دیدارو گفتوگۆ | | |
| ٩٠ | سنووره قەدەغەكان مەشكێنن! (چاوپێكەوتنی دكتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ٩١ | ئەشكەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیركەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی كراوەو چاپ و بڵاوكراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ٩٢ | گەنج لە چەمكە هەنووكەییەكاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| زنجیرەی بابەتە هەنووكەییەكان | | | |
| ٩٣ | گەنجەكانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی كردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ٩٤ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت كۆمەڵگاكەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٩٥ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٦ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٧ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ٩٨ | چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ٩٩ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٠ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠١ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١٠٢ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بكەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٣ | واقیعی هەرێمی كوردستان، دیدێكی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٤ | سروشت و پایەكانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ١٠٥ | كاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٠٦ | حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٠٧ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠٨ | لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسـخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٠٩ | تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١١٠ | ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١١ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسـەرێكی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٢ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆكار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١١٣ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەكان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب- كتێبە عەرەبییەكان** | | |
| | موسـوعة : الإســلام كما يتجـلّى فـى كـتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | كە لە چـاپی یەكەمدا (٨) بەرگـەو، لە چـاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبـێ، بەم شـێوەیە: |
| ١١٤ | الكتاب الأول: الإســلام: معرفة صحيحة بالخـالق عز وجل والخلـق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١١٥ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمـان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٦ | الكتاب الثـالث: الإيمان بالله تبارك وتعالـى: الخالق الرب الـمالك الإله ذي الأسـماء الحسـنى والصفات العـلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٧ | الكتاب الرابــع: الإيمان بالـملائكة و بالـجـن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٨ | الكتاب الخامس: الإيمان بكـتب الله الحكـيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١١٩ | الكتاب الســادس: الإيمان برسـل الله تعالـى وأنبيـائه الكـرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٠ | الكتاب الســابـع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سـيـرته وبراهين نبـوّتـه | | |
| ١٢١ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | | |
| ١٢٢ | الكتاب التاسـع: إهتداء الإنســان بهـدى الله، أو الإلتزام الفردي بشــريعة الله | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٢٣ | الكتاب العاشـر: إلتزام الـمجتمع بشريعة الله تعالـى | | |
| ١٢٤ | الكتاب الحـادي عشر: تطبيق الـمجتمع للشـريعة و معـالم الدولة فـي الإســلام | | |
| ١٢٥ | الكتاب الثاني عشــر: الإســلام: نظـرة سـديدة تجـاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٢٦ | نقض فـكـرة التطـرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٢٧ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنـاة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٢٨ | لقاء خاص (مقابلـة مع قنـاة العـالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٢٩ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |
| ١٣٠ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٣١ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٣٢ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٣٣ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٣٤ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | |
| ١٣٥ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٣٦ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٣٧ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٣٨ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| | ئەو كـتـێبانـەی لـەژێـر چاپــن | | |
| ١٣٩ | تەفســیـری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی دەیـەم: ســوورەتی: (هود) | | |
| ١٤٠ | تەفســیـری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی یـازدەیـەم: ســوورەتی: (یوسف) | | |
| ١٤١ | بەرگی دووەم: هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | | |

| | |
|---|---|
| ١٤٢ | بەرگی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سیاسییەکانی مێژووی مسوڵمانان |
| ١٤٣ | بەرگی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی |
| ١٤٤ | بەرگی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر |
| ١٤٥ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا |

# نێوەڕۆك

پێشكەش بێ.......................................................... ٥
پێشەكیی ............................................................ ٩
ڕێخۆشكردن و نەخشەی گشتی............................................ ١٢

**كتێبی یەكەم، تەوەری یەكەم**........................................ ١٧
ڕوونكردنەوەی چەمك و چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەكان و گرنگیی بیركردنەوەی ئیسلامیی............................................................ ١٧

بــەرایـی ........................................................... ١٩

**بەشی یەكەم**....................................................... ٢١
پێناسەی {بیركردنەوەی ئیسلامیی} و چەند وشەیەكی دیكەی نیزیكی: فهم، فقه، ثقافة، علم، تراث، حضارة ........................................ ٢١

دەستپێك ............................................................ ٢٣
١- بیـــر (الفـكــر):................................................ ٢٤
٢- تێگەیشتن (الفهم):................................................ ٣١
٣- چاك تێگەیشتن (الفقه):............................................ ٣٢
٤- كـلــتـوور (الثقـافـة - culture):.................................. ٣٤
٥- زانیــاریی (العـلـم):............................................. ٣٧
٦- كەلەپـوور (التـراث) (heritcag):................................... ٣٨
٧- ژیـــار (الحضــارة) (civilisation): ............................... ٤٠

حیكمەتی بەكارهێنانی ناوو نیشانی: (بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) لەجیاتی (هزری ئیسلامیی) ........ ٤٢

**بەشی دووەم** ........ ٤٥

سەرنجدانێكی مێژوویی لە بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا..... ٤٥

دەستپێك ........ ٤٧

باسی یەكەم: سروشتی سادەو خوارسكی ئەو كۆمەڵگایەی پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" بنیاتی نا ........ ٤٨

باسی دووەم: ئیمتیازەكانی جیلی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا، خوا لێیان ڕازی بێ.... ٥٠

١) بەئاسانیی تێگەیشتنیان لە قورئان: ........ ٥٠

٢) خاوەنی فیترەتێكی ساغ و سادەبوون: ........ ٥١

٣) ڕاستەوخۆ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بوون: ........ ٥١

باسی سێیەم: ڕێنمایی كردنی ڕاستەوخۆی وەحیی بۆ كۆمەڵگا ........ ٥٨

باسی چوارەم: سەرهەڵدانی كۆمەڵێك كارەسات و ڕووداوو گۆڕانكاریی........ ٦١

**بەشی سێیەم** ........ ٧١

سەرچاوەكانی بیركردنەوەی ئیسلامیی: ١ ـ ئەزموون، ٢ ـ عەقڵ، ٣ ـ وەحیی، ٤ـ ئیلهام، ٥ ـ خەون ........ ٧١

دەستپێك ........ ٧٣

باسی یەكەم: ئەزموون (پێنج هەستەوەرەكان: الحَواس الخَمس): ........ ٧٨

باسی دووەم: عـــەقـڵ ........ ٨٣

١ـ ڕۆڵی عەقڵ لە بواری پەیداكردنی زانستدا: ........ ٨٤

٢ـ ڕۆڵی عەقڵ لەگەڵ پێنج هەستەكاندا: ........ ٨٦

٣ـ خوای پەروەردگار لەزۆر ئایەتدا، باسی عەقڵ و گرنگییدان بە عەقڵ دەكات: ........ ٨٧

٤ـ ئایا عەقڵ تا كوێ بڕ دەكات؟ ........ ٩٠

باسی سێیەم: وەحـیـی ........................................................ ٩٢
دەستپێك ............................................................................ ٩٢
١- پێناسەی وەحیی و قورئان و سوننەتی تاكە بەرجەستەكەری وەحیی:....... ٩٣
١- پێناسەی وەحیی لەزمان و شەرعدا: ........................................ ٩٣
٢ـ پێنج ئاگاداریی لەبارەی سەرچاوەكانی وەدەست هێنانی زانستەوە:..... ٩٦
٣ ـ وەحیی خوا تەنیا لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە:.............. ٩٨
٤ـ پێناسەی قورئان و سوننەت:............................................ ٩٩
٢ـ بەڵگەكانی سەرچاوە بوونی سوننەت بۆ شەریعەت........................ ١٠٣
١- بەڵگە قورئـانییەكان : ........................................................ ١٠٤
٢- بەڵگەی یەكدەنگیی هاوەڵان لەسەر ڕەوایەتیی سوننەت............. ١١٣
٣- بەڵگەی عەقڵیی لەسەر ڕەوایەتیی سوننەت............................. ١١٦
٤- بەڵگەی سوننـــەت.................................................................. ١٢٣
٥- هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەكانی نكوڵیی لێكەرانی سوننەت.......... ١٢٦
هەڵوەشاندنەوەی بەڵگە و گومانەكانیان : ................................. ١٢٨
قورئـان و سوننەت لێك جیان: ........................................................ ١٣٣
جیاوازییەكانی نێوان قورئـان و سـوننـەت : ..................................... ١٣٣
بـەش و جـۆرەكانی سـوننەت..................................................... ١٣٧
٣ ـ ڕوونكردنەوەی چۆنیەتیی پەیوەندیی نێوان قورئان سوننەت ............ ١٤٦
٤ ـ بەبێ شارەزایی لە قورئان، مەحاڵە تەنیا بەهۆی سوننەتەوە بتوانرێ تێگەیشتنێكی ڕاست و هاوسەنگ، لەبـارەی ئیسـلامەوە دەستگیرببێ ....... ١٥٣
٥ ـ ڕەواندنەوەی تەم و مژ لەسەر كۆكردنەوەی سوننەت........................ ١٦٦
قۆناغەكانی نووسینەوەو كۆكردنەوەی سوننەت : .............................. ١٦٧
چۆن دەست بە كۆكردنەوەی سوننەت كرا؟ ................................. ١٧٤
٦ـ جۆرەكانی سوننەت.......................................................... ١٨١
جۆرەكانی سوننەت:............................................................. ١٨١

٧ـ هۆیەكانی هەڵبەستن (أسباب الوضع) و چۆنیەتی جیاكردنەوەی فەرموودە و قسەی هەڵبەستراو.................................................... ١٨٩
أ- هۆیەكانی هەڵبەستن (أسباب الوضع)................................ ١٨٩
ب- چۆن فەرموودەی ڕاست و قسەی هەڵبەستراولێك جیا دەكەینەوە؟ ..... ١٩٢
٨ـ ناگونجێ فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هیچ كام لە: عەقڵ، قورئان، واقیع و زانستدا، دژ بوەستێ ............................. ١٩٦
بواری یەكەم: تێكگیرانی سوننەت و عەقڵ:.............................. ١٩٧
بواری دووەم: تێكگیرانی سوننەت و قورئان: .......................... ٢٠٠
بواری سێیەم: تێكگیرانی سوننەت لەگەڵ واقیع و زانستدا:............... ٢٠٧
باسی چوارەم: خورپە، یاخود: خرانە نێودڵ(إلهام) ........................ ٢١٩
دەستپێك............................................................. ٢١٩
یەكەم: پێناسەی خورپە (إلهام):......................................... ٢٢٠
دووەم: بەڵگەی ڕەوا بوونی خورپە (إلهام): ............................. ٢٢٢
سێیەم: ئەندازەی متمانە پێكرانی ئیلهام.................................. ٢٢٩
باسی پێنجەم: خەون ( الرؤيا )........................................... ٢٣٢
١- خەون دیاردەیەكی مرۆیی و جیهانییە: ............................... ٢٣٢
٢- جۆرەكانی خەون:..................................................... ٢٣٥
٣- ئەندازەی متمانە كردن بە خەون، لە بواری دینداریيدا:................ ٢٣٦
٤- زانیارییەك كە لەو ڕێگایەوە دەستگیرمان دەبێ، چ لە ڕێی ئیلهام، چ لە ڕێی خەونەوە، بە زانیاریی تایبەتیی و شەخصیی دادەنرێ، جگە لە هی پێغەمبەران علیهم السلام: ......................................................... ٢٣٩
٥- دەگونجێ نامسوڵمانانیش خەونی ڕاست ببینن:......................... ٢٤٢

**بەشی چوارەم** ........................................ ٢٤٥
گرنگیی و پێویستیی بیركردنەوەی ئیسلامیی.............................. ٢٤٥
دەستپێك ................................................................ ٢٤٧
بەڵگەی یەكەم: خوا بیر كردنەوەی لەسەرمان پێویست كردوە:.............. ٢٤٨
بەڵگەی دووەم: عەقڵ كاكڵ و جەوهەری مرۆڤەو بەبێ بیركردنەوەش، مرۆڤ پەكی عەقڵەكەی دەخات و، سەرەنجام: وەك توێكڵی بێ كاكڵ دەمێنێتەوە:............ ٢٥١
بەڵگەی سێیەم: عەقڵ بناغەی ئەركدارییە (العقل مناط التكليف): ............ ٢٥٢
بەڵگەی چوارەم: بەبێ بەكارهێنانی عەقڵ لە وەحیی تێناگەین: ................ ٢٥٥
بەڵگەی پێنجەم: بەبێ بیركردنەوە، ناتوانین وەحیی دابەزێنینە سەر واقیع: ...... ٢٥٥
بەڵگەی شەشەم: وەحیی بەردەوام دەبەخشێ، بەڵام بەرهەمی فیكر سنوورداره:... ٢٥٦
بەڵگەی حەوتەم: ژیانی بەشەر لە گۆڕانی بەردەوام دایەو، زانست و فیكری بەشەر بەردەوام گەشە دەكات، بۆیە بەبێ بیركردنەوەو بەكار هێنانی عەقڵ، دینمان لە ژینمان بەجێ دەمێنێ:........................................................ ٢٦٠
بەڵگەی هەشتەم: بەبێ ڕامان و بیر كردنەوەو ورد بوونەوە، لە بوونەوەر، نهێنییەكانی بوون و یاساكانی خوا نادۆزینەوە:............................................ ٢٦٢
بەڵگەی نۆیەم: مسوڵمانان تەنیا ئەو كاتە لە گەشەی هەمەلایەنە دابوون، كە بەرهەمی فیكرییان هەبوو و، شتی تازەیان لە دین و ژیندا دەزانی: ........ ٢٦٣
بەڵگەی دەیەم: خوای كارزان لەزۆر شوێنان سەرزەنشتی كافرانی كردوە، لەسەر شوێنكەوتنی كوێرانەی پێشینانیان و، عەقڵی خۆ داخستنیان:................ ٢٦٤
بەڵگەی یازدەیەم و كۆتایی: شوێن كەوتنی پێشینی چاك (السلف الصالح) یانی شوێنكەوتنی بەرنامەو میتۆدەكەیان لە تێگەیشتنی ئاییندا، نەك شوێنكەوتنی سەرجەم بیرو ڕاكانیان:................................................... ٢٦٧
بەرهەمەكانی دانەر ....................................................... ٢٦٩